۲

# پوختەی صەحیح مۆسلیم

تاليف:
زكى الدين عبدالعظيم عبدالقوى المنذرى

وەرگێڕان:
لیژنەیەک



منذری، عبدالعظیم‌بن عبدالقوی، ۵۸۱ - ۶۵۶ق.
پوختەی صەحیحی موسلیم / نووسینی زکی‌الدین عبدالعظیم‌بن عبدالقوی المنذری؛ وەرگیرانی لیژنە یەک.-- تهران: احسان، ۱۳۸۲ -.
ج.
ISBN: 964-356-370-7 (دوره) . - ISBN: 964-356-371- 5: (ج. ۱)
ISBN: 964-356-372- 3: (ج. ۲)
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
۱. احادیث اهل سنت -- قرن ۷ق. الف. مسلم‌بن حجاج، ۲۰۶ - ۲۶۱ق. -- الجامع الصحیح. ب. عنوان. ج. عنوان: الجامع الصحیح.
BP۱۲۳/۶/۹پ۸م ۲۹۷/۲۱۱
۱۳۸۳
کتابخانه ملی ایران ۱۹۷۱۸-۸۳م


| | |
|---|---|
| ● ناوی کتێب: | **پوختەی صەحیحی موسلیم** |
| ● نووسینی: | پێشەوا زكي عبدالعظيم بن عبدالقوي المنذري |
| ● وەرگێرانی: | لیژنەیەک |
| ● بڵاوکار: | نەشری ئیحسان |
| ● تیراژ: | ۳۰۰۰ دانە |
| ● ساڵی چاپ: | ۱٤۲٦ کۆچی ۲۷۰۵ کوردی ـ ۲۰۰۵ زاینی |
| ● چاپ: | مەهارەت ـ تاران |
| ● ژمارەی نێونە تەوایەتی: | ISBN: 964-356-370-7 / ۹۶۴-۳۵۶-۳۷۰-۷ |
| ● ژمارەی نێونە تەوایەتی برگی دووەم: | ISBN: 964-356-372-3 / ۹۶۴-۳۵۶-۳۷۲-۳ |

# (٣٥) بەشی كۆچكردن و جەنگەكان

## (١) كۆچی پێغەمبەر (ﷺ)

١١٠٥ـ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ (ﷺ) يَقُولُ: جَاءَ أَبُو بَكْرٍ [الصِّدِّيقُ] (ﷺ) إِلَى أَبِي فِي مَنْزِلِهِ، فَاشْتَرَى مِنْهُ رَحْلًا، فَقَالَ لِعَازِبٍ: ابْعَثْ مَعِ يَ ابْنَكَ يَحْمِلْهُ مَعِي إِلَى مَنْزِلِي، فَقَالَ لِي أَبِي: احْمِلْهُ، فَحَمَلْتُهُ وَخَرَجَ أَبِي مَعَهُ يَنْتَقِدُ ثَمَنَهُ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: يَا أَبَا بَكْرٍ حَدِّثْنِي كَيْفَ صَنَعْتُمَا لَيْلَةَ سَرَيْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَ: نَعَمْ، أَسْرَيْنَا لَيْلَتَنَا كُلَّهَا حَتَّى قَامَ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ، وَخَلَا الطَّرِيقُ فَلَا يَمُرُّ فِيهِ أَحَدٌ، حَتَّى رُفِعَتْ لَنَا صَخْرَةٌ طَوِيلَةٌ لَهَا ظِلٌّ لَمْ تَأْتِ عَلَيْهِ الشَّمْسُ بَعْدُ، فَنَزَلْنَا عِنْدَهَا، فَأَتَيْتُ الصَّخْرَةَ فَسَوَّيْتُ بِيَدِي مَكَانًا يَنَامُ فِيهِ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي ظِلِّهَا، ثُمَّ بَسَطْتُ عَلَيْهِ فَرْوَةً، ثُمَّ قُلْتُ: نَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَأَنَا أَنْفُضُ لَكَ مَا حَوْلَكَ. فَنَامَ، وَخَرَجْتُ أَنْفُضُ مَا حَوْلَهُ، فَإِذَا أَنَا بِرَاعِي غَنَمٍ مُقْبِلٍ بِغَنَمِهِ إِلَى الصَّخْرَةِ، يُرِيدُ مِنْهَا الَّذِي أَرَدْنَا، فَلَقِيتُهُ فَقُلْتُ: لِمَنْ أَنْتَ يَا غُلَامُ؟ فَقَالَ: لِرَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، قُلْتُ [له]: أَفِي غَنَمِكَ لَبَنٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، [قال] قُلْتُ: أَفَتَحْلُبُ لِي؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأَخَذَ شَاةً، فَقُلْتُ لَهُ: انْفُضِ الضَّرْعَ مِنَ الشَّعَرِ وَالتُّرَابِ وَالْقَذَى –قَالَ: فَرَأَيْتُ الْبَرَاءَ يَضْرِبُ بِيَدِهِ عَلَى الْأُخْرَى يَنْفُضُ– فَحَلَبَ لِي فِي قَعْبٍ مَعَهُ كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، قَالَ: وَمَعِي إِدَاوَةٌ أَرْتَوِي فِيهَا لِلنَّبِيِّ (ﷺ) لِيَشْرَبَ مِنْهَا وَيَتَوَضَّأَ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَهُ مِنْ نَوْمِهِ، فَوَافَقْتُهُ اسْتَيْقَظَ، فَصَبَبْتُ عَلَى اللَّبَنِ مِنَ الْمَاءِ حَتَّى بَرَدَ أَسْفَلُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْرَبْ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ، قَالَ: فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ، ثُمَّ قَالَ: ((أَلَمْ يَأْنِ لِلرَّحِيلِ)). قُلْتُ: بَلَى [يا رسول الله]، قَالَ: فَارْتَحَلْنَا بَعْدَمَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَاتَّبَعَنَا سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكٍ، قَالَ: وَنَحْنُ فِي جَلَدٍ مِنَ الْأَرْضِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُتِينَا، فَقَالَ: ((لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا)). فَدَعَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) فَارْتَطَمَتْ فَرَسُهُ إِلَى بَطْنِهَا [أرى] فَقَالَ: إِنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا قَدْ دَعَوْتُمَا عَلَيَّ، فَادْعُوَا لِي، فَاللَّهُ لَكُمَا أَنْ أَرُدَّ عَنْكُمَا الطَّلَبَ، فَدَعَا اللَّهَ فَنَجَا، فَرَجَعَ لَا يَلْقَى أَحَدًا إِلَّا قَالَ: قَدْ كَفَيْتُكُمْ مَا هَاهُنَا، فَلَا يَلْقَى أَحَدًا إِلَّا رَدَّهُ، قَالَ: وَوَفَى لَنَا. [البخاري/ المناقب/ ٣٤١٩]

(ابو أسحاق) دەڵێ: لە (البراء) كوڕی (عازب)م بیست (ﷺ) دەیوت: (ابو بكر الصديق) (ﷺ) هات بۆلای باوكم لەماڵەوە، زینێكی لە باوكم كڕی و پێی وت:

کوڕەکەت بنێرە لەگەڵمدا بۆم هەڵبگرێ تا ماڵی خۆمان، باوکم پێی وتم: بۆی هەڵبگرە، منیش هەڵم گرت و باوکیشم لەگەڵیدا هاتەدەرەوە نرخەکەیی لێوەربگرێ، باوکم پێی وت: ئەی (ابو بکر) پێم بڵێ، ئەو شەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) کۆچتانکرد چیتانکرد؟ وتی: بەڵێ ئەو شەوەی کە کۆچمان کرد هەموو شەوەکە و تاسبەینێ نیوە ڕۆش ئێمە هەر ڕێگەمان بڕی. ڕێگەکە چۆڵ بوو کەسی پێدا نەدەڕیشت تا تاشە بەردێکی درێژمان لێ دەرکەوت کە سێبەری هەبوو، هێشتا خۆری‌نەگەیشتبوویە، لامان دایە لای تاشەکە، هاتمە لای تاشەکە و بە دەستم شوێنێکم تەخت کرد لە سێبەرەکەیدا تا پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا بخەوێ، پاشان فەروەیەکم لەسەری ڕاخست، دوایی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بخەوە، منیش پاسەوانیت دەکەم و چاودێری دەوروبەرت دەکەم، (پێغەمبەر) (ﷺ)خەوت منیش ڕۆیشتم چاودێری دەوروبەرەکەیم دەکرد لەناکاو بینیم وا شوانێکی مەڕ بە مەڕەکانیەوە ڕووە و بەردەکە دێ، ئەویش ئەوەی لێدەویست کە ئێمە ویستبومان، پێی گەیشتم و وتم: کوڕە تۆ شوانی کێیت؟ وتی: هی پیاوێکی خەڵکی مەدینەم، وتم پێی ئایا مەڕەکانت شیریان تێدایە،وتی: بەڵێ، وتم: ئایا بڕێ شیرم بۆ دەدۆشیت؟ وتی: بەڵێ مەڕێکی گرت و، منیش پێم وت: گوانەکەی بتەکێنە لە موو خۆڵ و پیسی ابو اسحاق وتی: (البراء)م بینی ئەم دەستی دەدا بەو دەستەکەی تری‌دا و دەیتەکاند- کەمێ شیری دۆشیە ناو قاپێکی دارین، منیش جەوەنەیەك ئاوم پێ بوو لێم دادەکرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا لێی بخواتەوە و دەست نوێژی پێ بگرێ- هاتمەوە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و حەزم نەکرد لە خەوەکەی بە ئاگای بهێنمەوە، بەڵام لەو کاتەدا خۆی بە ئاگا هاتەوە، لە ئاوەکەم کرد بەسەر شیرەکەدا هەتا بەشی خواردنەوەی ساردبوویەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەم شیرە بخۆرەوە، لێی خواردەوە، ئەوەندەی من پێم خۆش بوو پاشان فەرمووی:((ئایا کاتی ڕۆیشتن نەهاتووە)) وتم: بەڵێ (ئەی پێغەمبەری خوا)، لە دوانیوەڕۆ کەوتینە ڕێ، (سراقە)ی کوڕی (مالك) شوێنمان کەوتبوو، ئێمەش لە زەویەکی ڕەقەمەنیدا بووین، ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هاتن بۆمان، فەرمووی: ((خەمت نەبێ خوامان لەگەڵە)) پێغەبمەری خوا (ﷺ) دوعای لێکرد و هەر چوار پەلی ئەسپەکەی هەتا ژێر سکی نوقمی زەویەکە بوون، (سراقە)

وتی: من دەزانم کە ئێوە دوعاتان لێکردووم، ئێستە دوعام بۆ بکەن، پەیمانی خواتان دەدەمێ هەر کەس بەدواتاندا بێت بیگێڕمەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دۆعای بۆ کرد و ڕزگاری بوو، گەڕایەوەو بگەیشتایە بە هەرکەسێ پێی دەوت: ئەم ڕێگەیەم بۆ تاقی کردونەتەوە (خۆتان ماندوو مەکەن) وە بە هەرکەس بگەیشتایە دەیگێڕایەوە، (سراقە) بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر.

## (٢) جەنگی بەدر

١١٠٦ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) شَاوَرَ حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَ: فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ (ﷺ) فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ (ﷺ) فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لَأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا، قَالَ: فَنَدَبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) النَّاسَ، فَانْطَلَقُوا حَتَّى نَزَلُوا بَدْرًا، وَوَرَدَتْ عَلَيْهِمْ رَوَايَا قُرَيْشٍ، وَفِيهِمْ غُلَامٌ أَسْوَدُ لِبَنِي الْحَجَّاجِ، فَأَخَذُوهُ، فَكَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَسْأَلُونَهُ عَنْ أَبِي سُفْيَانَ وَأَصْحَابِهِ؟ فَيَقُولُ: مَا لِي عِلْمٌ بِأَبِي سُفْيَانَ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ ضَرَبُوهُ، فَقَالَ: نَعَمْ، أَنَا أُخْبِرُكُمْ، هَذَا أَبُو سُفْيَانَ، فَإِذَا تَرَكُوهُ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: مَا لِي بِأَبِي سُفْيَانَ عِلْمٌ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فِي النَّاسِ، فَإِذَا قَالَ هَذَا [أَيْضًا] ضَرَبُوهُ وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَائِمٌ يُصَلِّي، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ انْصَرَفَ قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَضْرِبُوهُ إِذَا صَدَقَكُمْ، وَتَتْرُكُوهُ إِذَا كَذَبَكُمْ)). قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَذَا مَصْرَعُ فُلَانٍ)). قَالَ: وَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى الْأَرْضِ هَاهُنَا وهَاهُنَا، قَالَ: فَمَا مَاطَ أَحَدُهُمْ عَنْ مَوْضِعِ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).

(انس) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی گەیشتنی کاروانەکەی (ابو سفیان)ی پێگەیشت کەوتە ڕاوێژ کردن، (ابو بکر) قسەی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی لێ وەرچەرخان، پاشان (عمر) (ﷺ) قسەی کرد ڕووی لەویش وەرچەرخاند، (سعد) کوڕی (عبادة) هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت ئێمەیە؟ سوێند بێ بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فەرمانمان پێبدەیت (بە ئەسپەکانمانەوە) بچینە نێو چەقی دەریا ئەوا دەچینە

ناوی، وە ئەگەر فەرمانمان پێبدەیت لە سکیان بدەین و بچین بۆ (برك الغماد)[1] ئەوا ئەوە دەکەین، (انس) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی خەڵکی کرد و خەڵکی بە پرتاو ڕۆیشتن هەتا لەبەدر هەڵیان دا، حوشترە ئاو هەڵگرەکانی قورەیشیش هاتن بەسەریاندا، بەندەیەکی ڕەشتاڵەی تیرەی (بنی الحجاج) یان تێدابوو، دەست بەجێ گرتیان، ئینجا هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتنە پرسیار کردن لێی لەبارەی ابو سفیان و هاوەڵانیەوە؟ ئەویش دەیوت: هیچ لە بارەی ابو سفیانەوە نازانم، بەڵام ئەوە (ابو جهل و عُتبة و شیبة و امیةی کوڕی خلف)ە کە ئەوەی وت لێیاندا، ئینجا وتی:بەڵێ، هەواڵتان دەدەمێ، ئەوە ابو سفیانە، کە وازیان لێدەهێنا و پرسیاریان لێدەکرد دەیوت: هیچ لەبارەی ابو سفیانەوە نازانم، بەڵام ئەوە (ابو الجهل و عتبە و شیبە و امیەی کوڕی خلف) لەناو خەڵکەکەدان، کە ئەوەی دەوت لێیان دەدا، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) وەستابوو نوێژی دەکرد، کە ئەوەی بینی لە نوێژەکەی سەلامی دایەوە و فەرمووی: ((سوێندبێ بەو کەسەی گیانی منی بەدستە کە ڕاستی دەوت لێتان دەدا کە درۆی لەگەڵ دەکردن وازتان لێدەهێنا)) ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :((ئەمە (شوێنی) تیاچوونی فلانە)) لێرەو لەوێ دەستی دەخستە سەر زەویەکە، هیچ کام لەو (کوژراوانە) دوورنەکەوتبوونەوە لە شوێن دەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

١١٠٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بُسَيْسَةَ عَيْنًا يَنْظُرُ مَا صَنَعَتْ عِيرُ أَبِي سُفْيَانَ، فَجَاءَ وَمَا فِي الْبَيْتِ أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: لَا أَدْرِي مَا اسْتَثْنَى بَعْضَ نِسَائِهِ، قَالَ: فَحَدَّثَهُ الْحَدِيثَ، قَالَ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَتَكَلَّمَ فَقَالَ: ((إِنَّ لَنَا طَلِبَةً، فَمَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِرًا فَلْيَرْكَبْ مَعَنَا)). فَجَعَلَ رِجَالٌ يَسْتَأْذِنُونَهُ فِي ظُهْرَانِهِمْ فِي عُلْوِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: ((لَا، إِلَّا مَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِرًا)). فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ حَتَّى سَبَقُوا الْمُشْرِكِينَ إِلَى بَدْرٍ، وَجَاءَ الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يُقَدِّمَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلَى شَيْءٍ حَتَّى أَكُونَ أَنَا دُونَهُ)). فَدَنَا الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ)). قَالَ: يَقُولُ عُمَيْرُ بْنُ الْحُمَامِ الْأَنْصَارِيُّ (ﷺ):

---

[1] (برك الغماد) ناوی شوێنێکە دوورە ، لە وڵاتی هَجَر.

يَا رَسُولَ اللَّه، جَنَّةٌ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: بَخٍ بَخٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَا يَحْمِلُكَ عَلَى قَوْلِكَ بَخٍ بَخٍ)). قَالَ: لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلَّا رَجَاءَ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِهَا، قَالَ: ((فَإِنَّكَ مِنْ أَهْلِهَا)). فَأَخْرَجَ تَمَرَاتٍ مِنْ قَرَنِهِ فَجَعَلَ يَأْكُلُ مِنْهُنَّ، ثُمَّ قَالَ: لَئِنْ أَنَا حَيِيتُ حَتَّى آكُلَ تَمَرَاتِي هَذِهِ إِنَّهَا لَحَيَاةٌ طَوِيلَةٌ، قَالَ: فَرَمَى بِمَا كَانَ مَعَهُ مِنَ التَّمْرِ، ثُمَّ قَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ.

(انس)ی كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (بُسَيسَة)ی بەهەواڵگری نارد تا سەیر بكات بزانێ حوشترە بارهەڵگرەكانی ابو سفيان چیان بەسەر هاتووە، هاتەوە و ماڵەكە كەسێكی تری تێدا نەبوو، جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، (بُسَيسَة) هەواڵەكەی بە پێغەمبەر گەیاند، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە و كەوتە ئاخاوتن و فەرمووی: ((ئێمە داخوازیەكمان هەیە و بۆی دەچین، هەر كەسێ وڵاغەكەی ئامادەیە با لەگەڵمان سواربێ)) هەندێ كەس داوای مۆڵەتیان لێكرد تا بچن لەسەرووی مەدینەوە وڵاغەكانیان بهێننەوە، فەرمووی((نەخێر با تەنها كەسێ بێت كە وڵاغەكەی ئامادەیە)) پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی ڕۆیشتن و لە پێش گەیشتنی بێباوەڕان گەیشتنە بەدر، دواتر بێباوەڕان هاتن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((كەس بۆ هیچ شتێ دەست بەكار نەبێت تا من پێی نەڵێم)) ئینجا بێباوەڕان نزیك كەوتنەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی، ((هەستن بۆ دەست خستنی ئەو بەهەشتەی كە پانتاییەكەی ئاسمانەكان و زەوی‌یە)) (انس) وتی: (عمیر) كوڕی (الحمام)ی انصاری (ﷺ) دەیوت: بەه بەه، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((چی وات لێدەكات بڵێیت بەه، بەه)) وتی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها ئەوە وای لێكردم كە حەز دەكەم شایستەی ئەو بەهەشتە بم، فەرمووی: ((تۆ لە خەڵكی ئەو بەهەشتەیت)). ئینجا چەند دنكە خورمایەكی لە تیرخانەكەی دەرهێنا و كەوتە خواردنیان ، پاشان وتی: ئەگەر من بژیم تا ئەم چەند خورمایە دەخۆم بە ڕاستی ئەوە ژینێكی دوور و درێژە، (انس) وتی: هەموو ئەو خورمایانەی كە پێی بوون فڕێی دان، پاشان جەنگا لەگەڵ بێباوەڕاندا هەتا شەهید كرا.

## (٣) پشتگیریی فریشته بۆ ئیمانداران

١١٠٨ـ عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ، نَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ، وَأَصْحَابُهُ ثَلَاثُ مِائَةٍ وَتِسْعَةَ عَشَرَ [رَجُلًا] فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) الْقِبْلَةَ ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ: ((اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ آتِ مَا وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ إِنْ تُهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةَ مِنْ أَهْلِ الْإِسْلَامِ لَا تُعْبَدْ فِي الْأَرْضِ)). فَمَا زَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ، مَادًّا يَدَيْهِ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ مَنْكِبَيْهِ، فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ، وَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، كَفَاكَ مُنَاشَدَتُكَ رَبَّكَ فَإِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ [الأنفال: ٩]. فَأَمَدَّهُ اللَّهُ بِالْمَلَائِكَةِ، قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ: فَحَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ يَشْتَدُّ فِي أَثَرِ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ أَمَامَهُ، إِذْ سَمِعَ ضَرْبَةً بِالسَّوْطِ فَوْقَهُ وَصَوْتَ الْفَارِسِ يَقُولُ: أَقْدِمْ حَيْزُومُ، فَنَظَرَ إِلَى الْمُشْرِكِ أَمَامَهُ فَخَرَّ مُسْتَلْقِيًا، فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ خُطِمَ أَنْفُهُ وَشُقَّ وَجْهُهُ كَضَرْبَةِ السَّوْطِ، فَاخْضَرَّ ذَلِكَ أَجْمَعُ، فَجَاءَ الْأَنْصَارِيُّ فَحَدَّثَ بِذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: ((صَدَقْتَ ذَلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ)). فَقَتَلُوا يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ، وَأَسَرُوا سَبْعِينَ. قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَلَمَّا أَسَرُوا الْأُسَارَى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ (ﷺ): ((مَا تَرَوْنَ فِي هَؤُلَاءِ الْأُسَارَى)). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، هُمْ بَنُو الْعَمِّ وَالْعَشِيرَةِ، أَرَى أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُمْ فِدْيَةً فَتَكُونُ لَنَا قُوَّةً عَلَى الْكُفَّارِ، فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُمْ لِلْإِسْلَامِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا تَرَى يَا ابْنَ الْخَطَّابِ)). قُلْتُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَرَى الَّذِي رَأَى أَبُو بَكْرٍ، وَلَكِنِّي أَرَى أَنْ تُمَكِّنَّا فَنَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ، فَتُمَكِّنَ عَلِيًّا مِنْ عَقِيلٍ فَيَضْرِبَ عُنُقَهُ، وَتُمَكِّنِّي مِنْ فُلَانٍ –نَسِيبًا لِعُمَرَ– فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ، فَإِنَّ هَؤُلَاءِ أَئِمَّةُ الْكُفْرِ وَصَنَادِيدُهَا، فَهَوِيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ وَلَمْ يَهْوَ مَا قُلْتُ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَبُو بَكْرٍ قَاعِدَيْنِ يَبْكِيَانِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَبْكِي أَنْتَ وَصَاحِبُكَ، فَإِنْ وَجَدْتُ بُكَاءً بَكَيْتُ، وَإِنْ لَمْ أَجِدْ بُكَاءً تَبَاكَيْتُ لِبُكَائِكُمَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَبْكِي لِلَّذِي عَرَضَ عَلَيَّ أَصْحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمُ الْفِدَاءَ، لَقَدْ عُرِضَ عَلَيَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ)) –شَجَرَةٍ قَرِيبَةٍ مِنْ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ)– وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿مَا

كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا﴾ [الأنفال: ٦٧-٦٩] فَأَحَلَّ اللَّهُ الْغَنِيمَةَ لَهُمْ.

(إبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: (عمر) کوڕی (خطاب) (ﷺ) بۆی گێڕامەوە و وتی: ڕۆژی بەدر بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیری بێباوەڕانی کرد کە هەزار کەس بوون، هاوەڵانیشی سێسەد و نۆزدە کەس بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوویکردە قیبلە و پاشان هەردوو دەستی بەرز کردەوە و، کەوتە پاڕانەوە و هانا بردن بۆ پەروەردگاری: ((ئەی خوایە ئەوەی بەڵێنت پێداوم بۆم جێبەجێ بکە، ئەوەی بەڵێنت پێداوم پێم ببەخشە، ئەی خوایە ئەگەر ئەم دەستەی موسوڵمانانە لەناو ببەیت لەسەر زەویدا ناپەرسترێیت)) بەردەوام دەپاڕایەوە و هانای بۆ پەروەردگارەکەیی دەبرد، دەستی ڕوو بە قیبلە درێژ کرد بوو، تا عەباکەی لە شانی کەوتە خوارەوە، (ابو بکر) (ﷺ) هاتە لای و عەباکەی هەڵگرتەوە و خستیەوە سەر هەردوو شانی. پاشان (ابو بکر) لە دواوە باوەشی پیا کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاڕانەوە و داواکاریت لە پەروەردگارت بەس بێت چونکە ئەوەی ئەو بەڵێنی پێداویت بۆت جێبەجێ دەکات، ئینجا خوای (ﷻ) ئەم ئایەتەی سەرەوەی نارده خوارەوە کە ئەمە ماناکەیەتی: ﴿یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە و داوای یارمەتیتان لێدەکرد، خوایش خێرا هات بەهاناتانەوە و فەرمووی بە ڕاستی من بە هەزار فریشتەی تر یارمەتی و کۆمەکیتان دەکەم بە شوێن ئەوانی تردا خوا پشتگیری لێدەکردن بە فریشتەکان)) (ابو زُمَیل) دەڵێ: (إبن عباس بۆی گێڕامەوە و وتی: لەو ڕۆژەدا پیاوێ لە موسڵمانەکان ڕای کرد بە شوێن یەکێ لە بێباوەڕاندا لە پشتیەوە بوو لەناکاو لەسەروویەوە گوێی لە شەقەی قامچییەك و دەنگی ئەسپ سوارێك بوو سوارەکەش دەیوت: (حَیْزُوم) (هەڵمەت بەرە) کەسەیری بێباوەڕەکەی کرد لەسەر پشت کەوت، تەماشای کرد لوتی زامدار بوە و دەموچاوی هەڵدڕاوە بە ئەندازەی بەرکەوتنی قامچیەکە، هەموو ئەوانە سەوز هەڵگەڕابوون دوایی انصاریەکە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەوەی بۆ گێڕایەوە، ، (پێغەمبەر) فەرمووی: ((ڕاست دەکەیت ئەوە یارمەتی و پشتگیری فریشتەکانی ئاسمانی سێیەمە)).

ئەو ڕۆژە حەفتایان کوشت و حەفتایان بە دیل گرت (لە بێباوەڕان)، ( ابو زمیل) دەڵێ: (إبن عباس) وتی: کاتێ دیلەکانیان گرت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (ابو بکر) و (عمر) (ﷺ) فەرموو: ((ڕاتان چیە دەربارەی ئەم دیلانە)). ابو بکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە ئامۆزا و عەشیرەتمانن وا دەبینم بە ماڵ بەرەڵلا بکرێن تا ببینە خاوەنی هێز بەرانبەر بەبێباوەڕان، بەڵکو خوا هیدایەتیشیان بدات بۆ ئیسلام، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی ابن الخطاب تۆ ڕات چیە)) بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕای من وەکو ڕاکەی ابو بکر نیە، بەڵکو من ڕام وایە ڕێگەمان بدەیت بدرێت لە گەردنیان، ڕێگە بدەیت بە (علي) بدات لە ملی (عقیل)، ڕێگە بدەیت بەمن بدەم لە گەردنی فلان -کە خزمی عمر بوو- چونکە ئەوانە پێشەوایانی کوفر و گەورەکانیانن، پێغەمبەری خوا (ﷺ). حەزی بەوە کرد کە ئەبو بەکر ووتی حەزی بەوە نەکرد کە عمر وتی ، کە بۆ سبەینێ هاتەوە، بینیم پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ابو بکر بە جووتە دانیشتون و دەگریان، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێم بڵێ - ئاگادارم بکە- تۆو هاوەڵەکەت بۆچ دەگرین تا ئەگەر گریانم هات دەگریم و، ئەگەر نەهات خۆم دەهێنمە گریان بۆ گریانەکەی ئێوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بۆ ئەوە دەگریم کە هاوەڵەکانت ئەو ڕایەیان پێدام کە فیدیە یان (ماڵیان) لێبستێنین بە هۆی ئەوەوە سزای هاوەڵانم نیشان درا نزیکتر لەو درختە)) -درەختێکی نزیك لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)- خوای گەورەش (ﷻ) ئەم ئایەتانەی سەرەوەی ناردە خوارەوە کە ئەمە ماناکانیانە: ﴿بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبوو کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێك چاك و پایەدار و جێگیر دەبێت لەسەر زەویدا، مەگەر کەل و پەل و شتومەکی دنیاتان دەوێت؟! لە کاتێکدا خوا سەرفرازی ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە و خوا باڵادەست و دانایە (سەرکەوتن بە ئیمانداران دەبەخشێت و دانایە لە تاقیکردنەوەیاندا) خۆ ئەگەر بڕیارێك لەلایەن خواوە پێش نەکەوتایە (کە مرۆڤ هەتا پەیامی خوای پێنەگات خوا سزای نادات) لەسەر ئەو شتانەی کە وەرتان گرت (لەبەرامبەر ئازاد کردنی دیلەکانەوە) ئەوە سزایەکی گەورەتان تووش دەبوو، کەوابوو بخۆن لەو شتانەی کە دەستتان کەوتووە، بە حەڵاڵێکی چاك و

پاك لـەخوا بترسـن و دینـدار بـن، چونکـە بەڕاسـتی ئـەو خوایـە لێخۆشـبوو و میهرەبانە)) ئینجا خوای گەورە دەستکەوتی جەنگی بۆ حەڵاڵ کردن.

## (٤) گفتوگۆی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ کوژراوانی بەدردا

١١٠٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) تَرَكَ قَتْلَى بَدْرٍ ثَلَاثًا ثُمَّ أَتَاهُمْ، فَقَامَ عَلَيْهِمْ فَنَادَاهُمْ فَقَالَ: ((يَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، يَا أُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، يَا عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، يَا شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، أَلَيْسَ قَدْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا، فَإِنِّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبِّي حَقًّا)). فَسَمِعَ عُمَرُ (ﷺ) قَوْلَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يَسْمَعُوا وَأَنَّى يُجِيبُوا وَقَدْ جَيَّفُوا؟ قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ لَا يَقْدِرُونَ أَنْ يُجِيبُوا)). ثُمَّ أَمَرَ بِهِمْ فَسُحِبُوا فَأُلْقُوا فِي قَلِيبِ بَدْرٍ.

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ ڕۆژ کوژراوانی بەدری بەجێهێشت، پاشان هاتەوە سەریان ، لەسەریان وەستاو و بانگی کردن و فەرمووی: ((ئەی ئەبو جهل کوڕی هشام، ئەی ئومەییەی کوڕی خلف، ئەی عُتبة کوڕی ربیعە، ئەی شیبەی کوڕی ربیعة، ئایا ئەوەی کە پەروەردگارتان بەڵێنی پێدابوون دەستتان کەوت، بەڕاستی من ئەوەم دەست کەوت کە پەروەردگارەکەم بەڵێنی پێدابووم)). (عمر) (ﷺ) گوێی لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن دەبیستن و چۆن وەڵام دەدەنەوە لەکاتێکدا کە بۆگەنیان کردووە، فەرمووی: ((سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەوەی من دەیڵێم ئێوە لەوان باشتر نایبیستن، بەڵام توانایان نییە وەڵام بدەنەوە)). پاشان فەرمانیدا دەربارەیان و ڕاکێشران و خرانە بیری بەدرەوە.

## (٥) جەنگی أُحد

١١١٠ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أُفْرِدَ يَوْمَ أُحُدٍ فِي سَبْعَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ وَرَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ، فَلَمَّا رَهِقُوهُ قَالَ: ((مَنْ يَرُدُّهُمْ عَنَّا وَلَهُ الْجَنَّةُ، أَوْ هُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّةِ)). فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، ثُمَّ رَهِقُوهُ أَيْضًا فَقَالَ: ((مَنْ يَرُدُّهُمْ عَنَّا وَلَهُ الْجَنَّةُ. أَوْ: هُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّةِ)). فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَلَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى قُتِلَ السَّبْعَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِصَاحِبَيْهِ: ((مَا أَنْصَفْنَا أَصْحَابَنَا)). [البخاري ٢٧٥٤- الجهاد-لبس البيضة]

(انس)ی كوڕی (مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ حەوت كەس لەپشتیوانان و دووكەس لەقورەیشیەكان جیاكرانەوە لەرۆژی ئوحوددا، كاتێ ویستیان هێرش بكەنە سەریان، فەرمووی: ((كێ ئەوانەمان لەكۆڵ دەدەكاتەوە دەچێتە بەهەشت ( یا هاوڕێمە لەبەهەشتا)؟ یەكێك لەپشتیوانەكان چووە پێشەوە بۆیان و جەنگا هەتا كوژرا، دووبارە ویستیان هێرش بكەنەوە سەریان، فەرمووی: ((هەركەس ئەوانەمان لەكۆڵ دەكاتەوە دەچێتە بەهەشت (یا: هاوڕێمە لەبەهەشتا)؟ پیاوێك لەپشتیوانەكان چووە پێشەوە بۆیان، جەنگا لەگەڵیانا هەتا كوژرا، بەوشێوەیە هەتا هەر حەوتەكەیان كوژران، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەدوو هاوڕێكەی فەرموو: بەئینصاف نەبووین لەگەڵ هاوەڵەكانماندا)).

## ( ٦ ) برینداربوونی پێغەمبەر( ﷺ )

١١١١ـ عَنْ أَبِي حَازِمٍ: عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَاعدي يَسْأَلُ عَنْ جُرْحِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: جُرِحَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ وَهُشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِهِ، فَكَانَتْ فَاطِمَةُ (ﷺ) –بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)– تَغْسِلُ الدَّمَ، وَكَانَ عَلِيُّ [بْنُ أَبِي طَالِبٍ](ﷺ) يَسْكُبُ عَلَيْهَا بِالْمِجَنِّ، فَلَمَّا رَأَتْ فَاطِمَةُ أَنَّ الْمَاءَ لَا يَزِيدُ الدَّمَ إِلَّا كَثْرَةً، أَخَذَتْ قِطْعَةَ حَصِيرٍ فَأَحْرَقَتْهُ حَتَّى صَارَ رَمَادًا، ثُمَّ أَلْصَقَتْهُ بِالْجُرْحِ، فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ. [بخاري/ الجهاد/ ٢٧٥٤]

(أبو حزام) دەڵێ: گوێی لە (سهل) كوڕی (سعد الساعدي) بوە كە پرسیاری لێكرا لە بارەی برینداری پێغەمبەر خوا (ﷺ) لە ڕۆژی اُحد دا، سعد وتی: دەمو چاوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بریندار بوو و یەكێ لە چواردانەكەی پێشەوەی شكێنرا، خودەكەی سەرسەری پارچە پارچە بوو، فاطمة (ﷺ) –كچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) –خوێنەكەی دەشۆری، وە (علي) كوڕی (ابو طالب)(ﷺ) ئاوی دەكرد بەسەر خوێنەكەدا بە (قەڵغان)، هەر كە فاطمة بینی كە ئاوەكە تا دێ خوێنەكە زیاتر دەكات، پارچە حەسیرێكی سوتاند هەتا بویە خۆڵەمێش، پاشان لكاندی بە زامەكەوە و، خوێنەكەی وەستایەوە.

١١١٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ يَوْمَ أُحُدٍ، وَشُجَّ فِي رَأْسِهِ، فَجَعَلَ يَسْلُتُ الدَّمَ عَنْهُ وَيَقُولُ: ((كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ شَجُّوا نَبِيَّهُمْ، وَكَسَرُوا رَبَاعِيَتَهُ، وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ)). فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ [آل‌عمران: ١٢٨]

(انس)(ﷺ) دەڵێ: لە ڕۆژی(أحـد)دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێ لە [چوارینەی] پێشەوەی شکێنرا، سەری بریندار کرا، کەوتە سڕینی خوێنەکەی سەری خۆی و دەیوت: ((چۆن قەومێ ڕزگار دەبێ کە سەری پێغەمبەرەکەیان شکاندبێ، دانیان شکاندبێ، لە کاتێکدا کە ئەو بانگی دەکردن بۆ لای خوا)) خوای بالادەست ئەم ئایەتەی سەرەوەی ناردە خوارەوە، کە ئەمە ماناکەیەتی: ﴿تۆ هیچ شتێکت لە کاروباری بەندەکان بەدەست نییە، بەڵکو هەموو شت بە دەست خوا خۆیەتی ئەگەر تەوبە و پەشیمانیان لێوەربگرێت یان سزا و ئازاریان بدات (سەربەستە) چونکە ئەوانە ستەمکارن﴾

## (٧) بەرگریی جبریل و میکائیل لە پێغەمبەر (ﷺ)

١١١٣- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (ﷺ) قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ يَوْمَ أُحُدٍ عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَعَنْ يَسَارِهِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيضٌ، ما رأيتهما قبلُ ولا بعدُ، [يعني] جبريل وميكائيل (ﷺ). وفي رواية: يُقَاتِلَانِ عَنْهُ كَأَشَدِّ الْقِتَالِ.

(سعد) کوڕی (ابو وقاص) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژی (أحد) دوو پیاوم بینی بەلای ڕاست و بەلای چەپی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە پۆشاکی سپیان پۆشی بوو. نە لەوەو پێش بینیومن و نەلەوەو پاشیش بینیمنەوە (واتە) جبریل و میکائیل بوون سەلامی خوایان لێبێت، لە ڕیوایەتێکدا: دەجەنگان و بەرگریان لێدەکرد زۆر بەگەرمی.

## (٨) تووڕەیی خوا سەختە لەسەر ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوشتویەتی

١١١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ عَلَى قَوْمٍ فَعَلُوا [هَذَا] بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ))). وَهُوَ حِينَئِذٍ يُشِيرُ إِلَى رَبَاعِيَتِهِ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ (ﷻ) عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)). [البخاري/ المغازي/ ٣٨٤٥]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((تووڕەیی خوا سەختە لەسەر کەسانێ ئەوەیان کرد بە پێغەمبەری خوا (ﷺ))) لەوکاتەدا ئاماژەی دەکرد بۆ دانی پێشەوەی خۆی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:

((تورەیی خوا (ﷻ) سەختە لەسەر ئەو پیاوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیکوژێ لە پێناوی خوادا))

## ( ٩ ) ئەو دەردی سەریەی تووشی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو لەلایەن قەومەکەیەوە

١١١٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ فَقَالَ: ((لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ، وَكَانَ أَشَدَّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلَّا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ [عَزَّ وَجَلَّ] قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رُدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، قَالَ: فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ وَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَأَنَا مَلَكُ الْجِبَالِ، وَقَدْ بَعَثَنِي رَبُّكَ إِلَيْكَ لِتَأْمُرَنِي بِأَمْرِكَ، فَمَا شِئْتَ؟ إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الْأَخْشَبَيْنِ)). فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلَابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وَحْدَهُ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا)). [البخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٩٥]

(عائشة) (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) وت: ئایا ئەی پێغەمبەری خوا ڕۆژی وات بەسەردا هاتووە کە سەختتربێت لە ڕۆژی أُحد؟ فەرمووی: ((دەردی سەری زۆرم بەسەرهاتووە لە قەومەکەتەوە، سەختترین شت کە بەسەرم هاتووە لێیان ڕۆژی (العقبة) بوو، چوومە لای (إبن عبد یالیل) کوڕی (عبد کلال) داواکەی جێبەجێ نەکردم، ڕۆیشتم و خەفەت دایگرتم و ئاگام لە خۆم نەما، تا لە (قرن الثعالب)[1] بە ئاگا هاتمەوە، کە سەرم بەرز کردەوە، هەورێکم بینی سێبەری بۆ کردبووم، کە سەیرم کرد جوبرەئیلی لەناودابوو، بانگی لێکردم ووتی: خوای (ﷻ)قسەی قەومەکەتی بیست کە پێیان وتی وتی: داواکەیان ڕەت کردیتەوە، ئەوا فریشتەی کێوەکانی بۆ ناردویت تا فەرمانی پێبکەیت چیت دەوێ پێیان بکات، فریشتەی کێوەکان بانگی کردم و سەلامی لێکردم، پاشان وتی: ئەی محمد خوا قسەی قەومەکەتی بیست کە

---

[1] قرن الثعالب: شوێنێکە نزیکی مەککە.

پێیان وتی، منیش فریشتەی کێوەکانم پەروەردگارەکەت ناردومی بۆلای تۆ تا چیت دەوێ فەرمانم پێبکەیت؟ ئەگەر بتەوێ هەردوو کێوەکەی (مەککە) دەهێنمەوە یەك بەسەریاندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بەڵکو ئەوەم دەوێ کە خوای گەورە هەر لە پشتی خۆیان کەسانێکیان لێدەربهێنێ خوای تاك و تەنها بپەرستن و هیچ شتێ نەکەنە هاوەڵی)).

١١١٦ـ عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ (ﷺ) قَالَ: دَمِيَتْ إِصْبَعُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ تِلْكَ الْمَشَاهِدِ، فَقَالَ:

هَلْ أَنْتِ إِلَّا إِصْبَعٌ دَمِيتِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ

[بخاري/ الجهاد/ ٢٦٤٨]

(جندب) کوڕی (سفیان) (ﷺ) دەڵێ: پەنجەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە یەکێ لە جەنگەکاندا خوێنی لێهات، فەرمووی: ((هل انت إلا إصبعٌ دَميت و في سبيل الله ما لَقيتِ))

تۆ تەنها پەنجەیەکی خوێنت لێهاتووە و لە پێناوی خوادا ئەوەت بەسەرهاتووە.

١١١٧ـ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ، وَقَدْ نُحِرَتْ جَزُورٌ بِالْأَمْسِ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: أَيُّكُمْ يَقُومُ إِلَى سَلَا جَزُورِ بَنِي فُلَانٍ، فَيَأْخُذُهُ فَيَضَعُهُ فِي كَتِفَيْ مُحَمَّدٍ (ﷺ) إِذَا سَجَدَ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَى الْقَوْمِ فَأَخَذَهُ، فَلَمَّا سَجَدَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَضَعَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، قَالَ: فَاسْتَضْحَكُوا، وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَمِيلُ عَلَى بَعْضٍ، وَأَنَا قَائِمٌ أَنْظُرُ، لَوْ كَانَتْ لِي مَنَعَةٌ طَرَحْتُهُ عَنْ ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَالنَّبِيُّ (ﷺ) سَاجِدٌ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ، حَتَّى انْطَلَقَ إِنْسَانٌ فَأَخْبَرَ فَاطِمَةَ (ﷺ) فَجَاءَتْ وَهِيَ جُوَيْرِيَةٌ فَطَرَحَتْهُ عَنْهُ، ثُمَّ أَقْبَلَتْ عَلَيْهِمْ تَشْتِمُهُمْ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (ﷺ) صَلَاتَهُ رَفَعَ صَوْتَهُ ثُمَّ دَعَا عَلَيْهِمْ، وَكَانَ إِذَا دَعَا دَعَا ثَلَاثًا، وَإِذَا سَأَلَ سَأَلَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: ((اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ)) ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا سَمِعُوا صَوْتَهُ ذَهَبَ عَنْهُمُ الضِّحْكُ، وَخَافُوا دَعْوَتَهُ، ثُمَّ قَالَ: ((اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ، وَعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ ابْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ..)). وَذَكَرَ السَّابِعَ وَلَمْ أَحْفَظْهُ، فَوَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّدًا (ﷺ) بِالْحَقِّ، لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِينَ سَمَّى صَرْعَى يَوْمَ بَدْرٍ، ثُمَّ سُحِبُوا إِلَى

الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ، قَالَ أَبُو إِسْحَقَ: الْوَلِيدُ بْنُ عُقْبَةَ غَلَطٌ فِي هَذَا الْحَدِيثِ.
[البخاري/ الوضوء/ ٢٣٧]

(ابن مسعود) (ﷺ) دەڵێ:لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا لە پەنای کەعبەدا نوێـژی دەکـرد، ابـو جـهل و چـەند هـاوەڵێکی دانیشـتبوون، ڕۆژی پێشـووتر حوشترێك سەربڕابوو، ابو جهل وتی: کامتان هەڵدەستێ و ورگ و ڕیخۆڵەی ئەو حوشترەی فلان تیرە هەڵدەگرێ و دەیخاتە سەر هەدوو شانی محمد (ﷺ) هەر کە سوجدەی برد؟ نەگبەتترین کەسی قەومەکە پەلاماری دایە و هەڵیگرت، کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) سوجدەی برد خستیە نێوان هەردوو شانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا هەموو دایانە قاقای پێکەنین، بە جۆرێ کە لاردەبوونەوە و دەکەوتن بەسەریەکتریدا، منیش وەستا بووم سەیرم دەکرد، ئەگەر هێز و پشتێکم ببوایە فرێم دەدا لەسەرپشتی پێغەمبەر (ﷺ) ، پێغەمبەریش (ﷺ) سوجدەی بردبوو سەری بەرز نەکردەوە، هەتا کەسێ چوو هەواڵی دابە (فاطمة) (ﷺ) ، (فاطمة) بەپەلە هات کە ئەو کاتە کچۆڵەیەك بوو، ڕیخۆڵەکانی لابردن، پاشان ڕوویکردە کۆمەڵەکە و کەوتە قسەی ناشرین پێوتنیان، کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد بە دەنگی بەرز دۆعای لێکردن، هەر کاتێ داخوازی ببوایە سێ جار داخوازی دەکرد ئینجا فەرمووی: ((خوایە تۆ بچۆ بە گژ قورەیشدا)) سێ جار لەسەر یەك، هەر کە دەنگی پێغەمبەریان (ﷺ) بیست پێکەنینەکەیان نەما، وەترسان لە دۆعاکەی، پاشان فەرمووی: ((خوایە دەتکەم بە گژ (ابو جهل) کوڕی (هشام)، وە (عتبة) کوڕی (ربيعة)، وە (شيبه) کوڕی (ربيعة) وە (وليد) کوڕی (عقبة) ،وە (أمية) کوڕی (خلف)، وە (عتبة) کوڕی (ابو معيط)..)) حەوتەمیشی وت کە من بیرم نەماوە، سوێند بەو کەسەی کە محمدی (ﷺ) بەڕاستی ناردووە، لە ڕۆژی بەدردا هەموو ئەوانەم بە کوژراوی بینی کە ناوی بردن، پاشان ڕاکێشران بۆ (قليب) بیرەکەی بەدر. ابو اسحاق وتی: وليد کوڕی عقبة لەم فەرموودەیەدا بە هەڵە هاتووە، (ڕاستیەکەی (وليد کوڕی عتبة) یە وەك لە شەرحی النووي دا هاتووە)

## (١٠) ئارامگرتنی پێغەمبەران لەسەر ئازاری قەومەکەیان

١١١٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ ضَرَبَهُ قَوْمُهُ، وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ وَيَقُولُ: ((رَبِّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٩٠]

(عبدالله) کوری (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: هەر دەڵێی چاوم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)یە باسی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی دەکرد کە قەومەکەی لێیان دابوو، ئەویش خوێنەکەی لە دەموچاوی دەسڕی و دەیفەرموو: ((پەروەردگارم لە قەومەکەم خۆش ببە ئەوان کەسانێکن نازانن)).

## (١١) کوشتنی أبو جهل

١١١٩ـ عَنْ أَنَس بْنُ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ((مَنْ يَنْظُرُ لَنَا مَا صَنَعَ أَبُو جَهْلٍ)). فَانْطَلَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَوَجَدَهُ قَدْ ضَرَبَهُ ابْنَا عَفْرَاءَ حَتَّى بَرَكَ، قَالَ: فَأَخَذَ بِلِحْيَتِهِ فَقَالَ: آنْتَ أَبُو جَهْلٍ؟ فَقَالَ: وَهَلْ فَوْقَ رَجُلٍ قَتَلْتُمُوهُ، أَوْ قَالَ: قَتَلَهُ قَوْمُهُ؟ قَالَ: وَقَالَ أَبُو مِجْلَزٍ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: فَلَوْ غَيْرُ أَكَّارٍ قَتَلَنِي. [البخاري/ المغازي/ ٣٧٤٥]

(أنس) کوری (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((کێ سەیرێکمان بۆ دەکات (بزانێ) أبو جهل چی لێهات)). (ابن مسعود) ڕۆیشت و ابوجهلی بینییەوە کە دوو کوڕەکەی عفراء لێیان داوە و کەوتوە و لە دوا هەناسەکانیدایە، (انس) وتی: ڕاستەوخۆ ڕیشم گرت و وتم: تۆ (ابو جهل)ی؟ وتی: ئایا شانازی بەسەر کەسێکەوە دەکەیت کە ئێوە کوشتوتانە؟ (ابو مجلز) وتی: ابو جهل وتی: خۆزگایە کەسێ بیکوشتمایە کشتیار نەبوایە.

## (١٢) کوشتنی (کعب) کوری (الاشرف)

١١٢٠ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ((مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ؟ فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ)). فَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: ائْذَنْ لِي فَلْأَقُلْ، قَالَ: ((قُلْ)). فَأَتَاهُ فَقَالَ لَهُ، وَذَكَرَ مَا بَيْنَهُمَا، وَقَالَ: إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ قَدْ أَرَادَ صَدَقَةً، وَقَدْ عَنَّانَا. فَلَمَّا سَمِعَهُ قَالَ: وَأَيْضًا وَاللَّهِ لَتَمَلُّنَّهُ. قَالَ: إِنَّا قَدِ اتَّبَعْنَاهُ الْآنَ، وَنَكْرَهُ أَنْ نَدَعَهُ حَتَّى نَنْظُرَ إِلَى أَيِّ شَيْءٍ يَصِيرُ أَمْرُهُ، قَالَ: وَقَدْ أَرَدْتُ أَنْ تُسْلِفَنِي سَلَفًا، قَالَ: فَمَا تَرْهَنُنِي؟ [قَالَ: مَا تُرِيدُ، قَالَ]: تَرْهَنُنِي نِسَاءَكُمْ، قَالَ: أَنْتَ أَجْمَلُ الْعَرَبِ. أَنَرْهَنُكَ نِسَاءَنَا؟ قَالَ: لَهُ

ترْهَنُوني أوْلَادكُمْ، قَالَ يُسَبُّ ابْنُ أحَدِنَا، فيُقَالُ: رُهِنَ فِي وَسْقَيْنِ مِنْ تَمْرٍ، ولَكِنْ نَرْهَنُك اللّأْمَةَ، يَعْنِي السِّلَاحَ، قَالَ: فَنَعَمْ، وَوَاعَدَهُ أنْ يَأْتِيَهُ بِالْحَارِثِ وَأبِي عَبْسِ بْنِ جَبْرٍ وعَبَّادِ بْنِ بِشْرٍ، قَالَ: فَجَاءُوا فدعَوْهُ لَيْلًا، فنَزَلَ إلَيْهِمْ. قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ غَيْرُ عَمْرٍو: قَالَتْ [لَهُ] امْرَأتُهُ: إنِّي لَأسْمَعُ صَوْتًا كَأنَّهُ صَوْتُ دَمٍ. قَالَ: إنَّمَا هَذَا مُحَمَّدُ [بْنُ مَسْلَمَةَ] ورَضِيعُهُ وَأبُو نَائِلَةَ، إنَّ الْكَرِيمَ لوْ دُعِيَ إلَى طَعْنَةٍ لَيْلًا لَأجَابَ. قَالَ مُحَمَّدٌ: إنِّي إذَا جَاءَ فَسَوْفَ أمُدُّ يَدِي إلَى رَأْسِهِ، فَإذَا اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَدُونَكُمْ. قَالَ: فَلَمَّا نَزَلَ نَزَلَ وَهُوَ مُتَوَشِّحٌ، فَقَالُوا: نَجِدُ مِنْكَ رِيحَ الطِّيبِ، قَالَ: نَعَمْ، تَحْتِي فُلَانَةُ، هِيَ أعْطَرُ نِسَاءِ الْعَرَبِ، قَالَ: فَتَأْذَنُ لِي أنْ أشُمَّ مِنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ فَشُمَّ، فَتَنَاوَلَ فشَمَّ، ثُمَّ قَالَ: أتَأْذَنُ لِي أنْ أعُودَ؟ قَالَ فَاسْتَمْكَنَ مِنْ رَأْسِهِ، ثُمَّ قَالَ: دُونَكُمْ، قَالَ فَقَتَلُوهُ. [البخاري/ المغازي/ ٣٨١١]

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((کێ بۆ (کعب) کوڕی (الاشرف) بێ؟)) واتە (کێ کعب کوڕی الاشرفم بۆ دەکوژێ؟) چونکە ئەو ئازاری خوا و پێغەمبەرەکەیی داوە. (محمد) کوڕی (مسلمة) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەزدەکەیت بیکوژم؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) . وتی: مۆڵەتم بدە تا شتێکت لەسەر بڵێم، فەرمووی: ((بڵێ)) محمد هاتە لای (کعب) و باس و خواسی نێوان خۆیانی کرد، ئینجا وتی: بەڕاستی ئەم پیاوە خێری لێمان دەوێ، لە ڕاستیدا ماندووی کردوین و زەحمەتی داوین، هەر کە (کعب) ئەمەی لێبیست، وتی: بەخوا دواجار لێی بێزاردەبن، (محمد) وتی: ئێستە ئێمە شوێنی ئەو کەوتووین و، حەزناکەین وازی لێبهێنین تا بزانین چارەنووسی ئەم کارەی بەچی دەگات، وتی: ئێستە دەمەوێ قەرزێکم بدەیتێ، (کعب) وتی: چیم بە بارمتە دەدەیتێ؟ (وتی: هەر چیت دەوێ،) وتی: ژنەکانتانم بدەنێ بە بارمتە، وتی: تۆ جوانترینی هەموو عەرەبی ئایا ژنەکانمان بخەینە بارمتەی تۆ؟ وتی: منداڵەکانتانم بە بارمتە بدەنێ، وتی: کوڕی یەکێکمان جوێنی پێدەدرێ و دەوترێ: دراوە بە بارمتەی دوو بار حوشتر لە خورما، بەڵکو چەکەکەمان دەکەین بە بارمتەت (واتە:چەك) وتی: زۆر باشە، ئەمجا مەوعیدی دایە کە بێتەوە لای و (حارث) و أبي عبس بن جبرِ و عباد بن شبرِ لەگەڵدا بێت، وتی: بەشەو هاتنەوە و بانگیان لێکرد، هاتە خوارەوە بۆلایان، سفیان وتی: جگە لە عمرو وتی: ژنەکەی (پێی) وت: من دەنگێ دەبیستم وەك دەنگی خوێن بێت، وتی: ئەوە (محمد) (کوڕی

مسلمة)یە و ابو نائلەی برا شیریمە، بەخشندە ئەگەر بەشەو بانگی لێکرا بە شیر و ڕم لێی بدرێ هەر دەچێ بەدەم بانگەکەوە. محمد وتی: هەر کە هات من دەستم درێژ دەکەم بۆ سەری، هەر کە توند گرتم ئێوە و ئەو، کاتێ (لە قەڵاکە) دابەزی، و پۆشاکی جەنگی بە تەواوی پۆشیبوو وە چەکەکەی ڕاست و چەپ کرد بوو بە ملیدا، وتیان: بۆنی عەترت لێبەدی دەکەین، وتی: بەڵێ، ژنەکەم فلانە کەسە، کە بۆن خۆشترین ژنانی عەرەبە، (محمد) وتی: مۆڵەتم بدەیت بۆنێکی ئەو عەترە بکەم؟ وتی: بەڵێ بۆنی بکە، سەری گرت و بۆنی کرد، دووبارە وتی: ئایا مۆڵەتم دەدەیت جارێکی تر بۆنت بکەم؟ جابر دەڵێ: ئەمجارە توند سەری گرت، پاشان وتی: دەی ئێوە و ئەو، وتی: ئەمجا کوشتیان.

## (١٣) جەنگی الرّقاع

١١٢١ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، وَنَحْنُ سِتَّةُ نَفَرٍ، بَيْنَنَا بَعِيرٌ نَعْتَقِبُهُ، قَالَ: فَنَقِبَتْ أَقْدَامُنَا، فَنَقِبَتْ قَدَمَايَ وَسَقَطَتْ أَظْفَارِي، فَكُنَّا نَلُفُّ عَلَى أَرْجُلِنَا الْخِرَقَ، فَسُمِّيَتْ غَزْوَةَ ذَاتِ الرِّقَاعِ، لِمَا كُنَّا نُعَصِّبُ عَلَى أَرْجُلِنَا مِنَ الْخِرَقِ. قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: فَحَدَّثَ أَبُو مُوسَى بِهَذَا الْحَدِيثِ ثُمَّ كَرِهَ ذَلِكَ، قَالَ: كَأَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَكُونَ شَيْئًا مِنْ عَمَلِهِ أَفْشَاهُ... وَفِي رواية: وَاللَّهُ يُجْزِي بِهِ. [البخاري/ المغازي/ ٣٨٩٩]

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕۆیشتین بۆ جەنگێك، ئێمە شەش کەس بووین، حوشترێکمان پێبوو بە نۆرە سواری دەبووین، هەر دوو پێم شەق شەق بوو بوون و نینۆکەکانم کەوتبوون، پەڕۆمان دەپێچا بە قاچمانەوە و دەمانبەست، ئەو جەنگە ناونرا بە جەنگی (ذات الرّقاع)، چونکە ئێمە بە پەڕۆ قاچەکانمان دەبەست، (ابو بردة) وتی: (ابو موسى) ئەم قسەیەی دەگێڕایەوە پاشان بە باشی نەدەزانی باسی بکات، وتی: هەروەك بە باشی نەزانیبێ شتی نهێنی لەو کردەوەیەیدا بووبێ و بیخاتە ڕوو... وە لە ڕیوایەتێکدا: خوا پاداشتی بداتەوە لەسەری.

## (١٤) جەنگی الأحزاب (الخندق)

١١٢٢ـ عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ حُذَيْفَةَ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَوْ أَدْرَكْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَاتَلْتُ مَعَهُ وَأَبْلَيْتُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: أَنْتَ كُنْتَ تَفْعَلُ ذَلِكَ؟ لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لَيْلَةَ الْأَحْزَابِ وَأَخَذَتْنَا رِيحٌ شَدِيدَةٌ وَقُرٌّ، فَقَالَ

رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَلَا رَجُلٌ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللَّهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). فَسَكَتْنَا فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَ: ((أَلَا رَجُلٌ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللَّهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). فَسَكَتْنَا فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَ: ((أَلَا رَجُلٌ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللَّهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). فَسَكَتْنَا فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ، فَقَالَ: ((قُمْ يَا حُذَيْفَةُ فَأْتِنَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ)). فَلَمْ أَجِدْ بُدًّا إِذْ دَعَانِي بِاسْمِي أَنْ أَقُومَ، قَالَ: ((اذْهَبْ فَأْتِنِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ، وَلَا تَذْعَرْهُمْ عَلَيَّ)). فَلَمَّا وَلَّيْتُ مِنْ عِنْدِهِ، جَعَلْتُ كَأَنَّمَا أَمْشِي فِي حَمَّامٍ حَتَّى أَتَيْتُهُمْ، فَرَأَيْتُ أَبَا سُفْيَانَ يَصْلِي ظَهْرَهُ بِالنَّارِ، فَوَضَعْتُ سَهْمًا فِي كَبِدِ الْقَوْسِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْمِيَهُ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): ((وَلَا تَذْعَرْهُمْ عَلَيَّ)). وَلَوْ رَمَيْتُهُ لَأَصَبْتُهُ، فَرَجَعْتُ وَأَنَا أَمْشِي فِي مِثْلِ الْحَمَّامِ، فَلَمَّا أَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِ الْقَوْمِ وَفَرَغْتُ قُرِرْتُ، فَأَلْبَسَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ فَضْلِ عَبَاءَةٍ كَانَتْ عَلَيْهِ يُصَلِّي فِيهَا، فَلَمْ أَزَلْ نَائِمًا حَتَّى أَصْبَحْتُ، [فَلَمَّا أَصْبَحْتُ] قَالَ: ((قُمْ يَا نَوْمَانُ)).

(إبراهيم التيمي) لە باوکیەوە دەڵێ: ئێمە لەلای (حذیفة) بووین، پیاوێك وتی: ئەگەر بە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بگەیشتمایە شان بەشانی دەجەنگام بە هەموو توانایەکم، حذیفة وتی: تۆ ئەوەت دەکرد؟ شەوی (الآحزاب) ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووین، بایەکی توند و سەرمایەکی سەخت دایگرتبووین ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئای بۆ پیاوێك دەنگوباسی ئەو خەڵکەم بۆ بهێنێ، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بیکاتە هاوەڵم)) ئێمە بێدەنگ بووین کەسێکمان وەڵامی نەدایەوە، دووبارە فەرمووی: ((ئای بۆ پیاوێك دەنگوباسی ئەو قەومەم بۆ بهێنێ، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بیکاتە هاوەڵم)) . ئێمە بێدەنگ بووین کەسێکمان وەڵامی نەدایەوە، پاشان فەرمووی: ((ئای بۆ پیاوێك دەنگوباسی ئەو قەومەم بۆ بهێنێ، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بیکاتە هاوەڵم)). هەموو بێدەنگ بووین و کەسێکمان وەڵامی نەدایەوە، ئینجا فەرمووی: ((ئەی حذیفة هەستە بڕۆ هەواڵی ئەو لەشکرەم بۆ بێنە)). کە بە ناوی خۆمەوە بانگی کردم ئیتر هیچ چارێکم نەما کە هەڵنەستم، فەرمووی: ((بڕۆ هەواڵی ئەو خەڵکەم بۆ بهێنە و نەشیان شڵەژێنی))لێم. هەر کە بەجێم هێشت، کەوتمە حاڵێ هەروەك بە ناو گەرماوێکدا بڕۆم هەتا گەیشتمە لایان، ابو سفیانم بینی کە پشتی بە ئاگر گەرم دەکردەوە، تیرێکم خستە چەقی کەوانەکەم و ویستم بیگرمە ابو سفیان، فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)م

بیرکەوتەوەکە فەرمووی: ((نەشیان شڵەژێنی لێم)) کە ئەگەر تیرەکەم تێبگرتایە دەم پێکا، گەڕامەوە و هەروەك بەناو گەرماودا بڕۆم. هەر کە گەیشتمەوە خزمەتی دەنگوباسی خەڵکەکەم پێدا و کە لێبوومەوە سەرمام بۆ هاتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە لایەکی ئەو عەبایەی کە لەبەریدابوو وە نوێژی لەسەر دەکرد داییپۆشیم، هەتا بەیانی لێی نوستم، (هەر کە بەیانیم لێهات) فەرمووی: ((هەستە ئەی خەواڵو)).

١١٢٣ـ عَنْ الْبَرَاءَ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ الْأَحْزَابِ يَنْقُلُ مَعَنَا التُّرَابَ، وَلَقَدْ وَارَى التُّرَابُ بَيَاضَ بَطْنِهِ، وَهُوَ يَقُولُ:

((وَاللَّهِ لَوْلَا أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا ... وَلَا تَصَدَّقْنَا وَلَا صَلَّيْنَا

فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا ... إِنَّ الْأُلَى قَدْ أَبَوْا عَلَيْنَا))

قَالَ: وَرُبَّمَا قَالَ:

((إِنَّ الْمَلَا قَدْ أَبَوْا عَلَيْنَا ... إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا))

وَيَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ. [البخاري/ الجهاد/ ٢٨٧٠]

(البراء) (رضي الله عنه) دەڵێ: لە ڕۆژی الأحزاب دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵماندا خۆڵی دەگواستەوە، بەجۆرێ کە خۆڵ سپیایی سکی داپۆشیبوو، ئەو دەیفەرموو:

سوێند بە خوا بەتۆ نەبێ هیدایەتمان وەرنەدەگرت

نەخێرمان دەکرد و نە نوێژمان دەکرد

ئارامی داباریێنە سەرمان ... چونکە ئەوان یاخی بوون لێمان

البراء دەڵێ: لەوانەیە فەرمووبێتی:

ئەوانە یاخی بوون لێمان ... ڕازیمان نیە فیتنە گێڕیان

بە وتنی هۆنراوەکە دەنگی بەرز دەکردەوە.

١١٢٤ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) كَانُوا يَقُولُونَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدًا ... عَلَى الْإِسْلَامِ مَا بَقِينَا أَبَدًا

أَوْ قَالَ: عَلَى الْجِهَادِ أبداً –شَكَّ حَمَّادٌ– وَالنَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ:

((اللّهُمَّ إِنَّ الْخَيْرَ خَيْرُ الْآخِرَهْ فاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ وَالمُهَاجِرَهْ)).
[البخاري/ الجهاد/ ٢٦٨٠]

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: هاوەڵانی (محمد) (ﷺ) ڕۆژی (الخندق) دەیانووت:

نحن الذين بايعوا محمداً على الأسلام ما بقينا أبداً

ئێمە ئەوانەین پەیمانمان دا بە محمد لەسەر ئیسلام بمێنین هەتا ئەبەد.

یا وتی:

لەسەر (جهاد) بمێنین هەتا ئەبەد[1] – پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو:

خوایە خێر و خۆشی تەنها هی ئەو جیهانە

دەخۆش ببە لەو پشتیوان و کۆچبەرانە

## (١٥) باسی بنو قریظة

١١٢٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (ﷺ) قَالَ: نَادَى فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ انْصَرَفَ عَنِ الْأَحْزَابِ أَنْ: ((لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الظُّهْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ)). فَتَخَوَّفَ نَاسٌ فَوْتَ الْوَقْتِ فَصَلَّوْا دُونَ بَنِي قُرَيْظَةَ، وَقَالَ آخَرُونَ: لَا نُصَلِّي إِلَّا حَيْثُ أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَإِنْ فَاتَنَا الْوَقْتُ. قَالَ: فَمَا عَنَّفَ وَاحِدًا مِنَ الْفَرِيقَيْنِ. [البخاري/ صلاة الخوف/ ٩٠٤]

(عبدالله) کوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەنگی الأحزاب گەڕایەوە بانگی کردین و فەرمانی پێداین کە: ((با هیچ کەس نوێژی نیوەڕۆ نەکات لە بني قريظة نەبێ)). هەندێ کەس ترسان لەوە کە کاتەکە بگوزەرێ پێش ئەوەی بگەنە (بني قريظة) نوێژیان کرد، کەسانێکی تر وتیان: ئێمە نوێژ ناکەین تا نەگەینە ئەو شوێنە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوین با کاتەکەشمان لە دەست بچێ (عبدالله) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ یەکێ لەو دوو گرووپەی سەرزەنشت نەکرد.

---

[1] حماد کوڕی سلمة یەکێك لە ڕیوایەت کەرانی فەرموودەکەیە. گومانی هەیە دەڵێ لەوانەیە (انس) وتبێتی.

## ( ١٦ ) جەنگی ذي قَرَدَ

١١٢٦ـ عَنْ إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي (ﷺ) قَالَ: قَدِمْنَا الْحُدَيْبِيَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَنَحْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، وَعَلَيْهَا خَمْسُونَ شَاةً لَا تُرْوِيهَا، قَالَ: فَقَعَدَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى جَبَا الرَّكِيَّةِ، فَإِمَّا دَعَا وَإِمَّا بَصَقَ فِيهَا، قَالَ: فَجَاشَتْ، فَسَقَيْنَا وَاسْتَقَيْنَا، قَالَ: ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) دَعَانَا لِلْبَيْعَةِ فِي أَصْلِ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَبَايَعْتُهُ أَوَّلَ النَّاسِ، ثُمَّ بَايَعَ وَبَايَعَ، حَتَّى إِذَا كَانَ فِي وَسَطٍ مِنَ النَّاسِ قَالَ: ((بَايِعْ يَا سَلَمَةُ)). قَالَ: قُلْتُ: قَدْ بَايَعْتُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي أَوَّلِ النَّاسِ، قَالَ: ((وَأَيْضًا)). قَالَ: وَرَآنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَزِلًا -يَعْنِي لَيْسَ مَعَهُ سِلَاحٌ- قَالَ: فَأَعْطَانِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَجَفَةً أَوْ دَرَقَةً، ثُمَّ بَايَعَ، حَتَّى إِذَا كَانَ فِي آخِرِ النَّاسِ قَالَ: ((أَلَا تُبَايِعُنِي يَا سَلَمَةُ)). قَالَ: قُلْتُ: قَدْ بَايَعْتُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي أَوَّلِ النَّاسِ، وَفِي أَوْسَطِ النَّاسِ، قَالَ: ((وَأَيْضًا)). قَالَ: فَبَايَعْتُهُ الثَّالِثَةَ، ثُمَّ قَالَ لِي: ((يَا سَلَمَةُ أَيْنَ حَجَفَتُكَ -أَوْ دَرَقَتُكَ- الَّتِي أَعْطَيْتُكَ)). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقِيَنِي عَمِّي عَامِرٌ عَزِلًا فَأَعْطَيْتُهُ إِيَّاهَا. قَالَ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، وَقَالَ: ((إِنَّكَ كَالَّذِي قَالَ الْأَوَّلُ: اللَّهُمَّ أَبْغِنِي حَبِيبًا هُوَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي)). ثُمَّ إِنَّ الْمُشْرِكِينَ رَاسَلُونَا الصُّلْحَ حَتَّى مَشَى بَعْضُنَا فِي بَعْضٍ وَاصْطَلَحْنَا، قَالَ: وَكُنْتُ تَبِيعًا لِطَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَسْقِي فَرَسَهُ وَأَحُسُّهُ، وَأَخْدُمُهُ وَآكُلُ مِنْ طَعَامِهِ، وَتَرَكْتُ أَهْلِي وَمَالِي مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ (ﷺ)، قَالَ: فَلَمَّا اصْطَلَحْنَا نَحْنُ وَأَهْلُ مَكَّةَ وَاخْتَلَطَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ أَتَيْتُ شَجَرَةً، فَكَسَحْتُ شَوْكَهَا فَاضْطَجَعْتُ فِي أَصْلِهَا، قَالَ: فَأَتَانِي أَرْبَعَةٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، فَجَعَلُوا يَقَعُونَ فِي رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَبْغَضْتُهُمْ فَتَحَوَّلْتُ إِلَى شَجَرَةٍ أُخْرَى، وَعَلَّقُوا سِلَاحَهُمْ وَاضْطَجَعُوا، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ نَادَى مُنَادٍ مِنْ أَسْفَلِ الْوَادِي: يَا لِلْمُهَاجِرِينَ قُتِلَ ابْنُ زُنَيْمٍ. قَالَ: فَاخْتَرَطْتُ سَيْفِي، ثُمَّ شَدَدْتُ عَلَى أُولَئِكَ الْأَرْبَعَةِ وَهُمْ رُقُودٌ، فَأَخَذْتُ سِلَاحَهُمْ فَجَعَلْتُهُ ضِغْثًا فِي يَدِي، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ وَالَّذِي كَرَّمَ وَجْهَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) لَا يَرْفَعُ أَحَدٌ مِنْكُمْ رَأْسَهُ إِلَّا ضَرَبْتُ الَّذِي فِيهِ عَيْنَاهُ، قَالَ: ثُمَّ جِئْتُ بِهِمْ أَسُوقُهُمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: وَجَاءَ عَمِّي عَامِرٌ بِرَجُلٍ مِنَ الْعَبَلَاتِ يُقَالُ لَهُ مِكْرَزٌ، يَقُودُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى فَرَسٍ مُجَفَّفٍ فِي سَبْعِينَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: ((دَعُوهُمْ يَكُنْ لَهُمْ بَدْءُ الْفُجُورِ وَثِنَاهُ)). فَعَفَا عَنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، وَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ

أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ الْآيَةَ كُلَّهَا، قَالَ: ثُمَّ خَرَجْنَا رَاجِعِينَ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا، بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَنِي لَحْيَانَ جَبَلٌ وَهُمُ الْمُشْرِكُونَ، فَاسْتَغْفَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِمَنْ رَقِيَ هَذَا الْجَبَلَ اللَّيْلَةَ كَأَنَّهُ طَلِيعَةٌ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) وَأَصْحَابِهِ، قَالَ سَلَمَةُ: فَرَقِيتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِظَهْرِهِ مَعَ رَبَاحٍ غُلَامِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَأَنَا مَعَهُ، وَخَرَجْتُ مَعَهُ بِفَرَسِ طَلْحَةَ أُنَدِّيهِ مَعَ الظَّهْرِ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا إِذَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ الْفَزَارِيُّ قَدْ أَغَارَ عَلَى ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَاسْتَاقَهُ أَجْمَعَ، وَقَتَلَ رَاعِيَهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَبَاحُ خُذْ هَذَا الْفَرَسَ فَأَبْلِغْهُ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ، وَأَخْبِرْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّ الْمُشْرِكِينَ قَدْ أَغَارُوا عَلَى سَرْحِهِ، قَالَ: ثُمَّ قُمْتُ عَلَى أَكَمَةٍ فَاسْتَقْبَلْتُ الْمَدِينَةَ، فَنَادَيْتُ ثَلَاثًا: يَا صَبَاحَاهُ! ثُمَّ خَرَجْتُ فِي آثَارِ الْقَوْمِ أَرْمِيهِمْ بِالنَّبْلِ، وَأَرْتَجِزُ أَقُولُ: أَنَا ابْنُ الْأَكْوَعِ وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ فَأَلْحَقُ رَجُلًا [مِنْهُمْ] فَأَصُكُّ سَهْمًا فِي رَحْلِهِ حَتَّى خَلَصَ نَصْلُ السَّهْمِ إِلَى كَتِفِهِ، قَالَ: قُلْتُ: خُذْهَا وَأَنَا ابْنُ الْأَكْوَعِ وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا زِلْتُ أَرْمِيهِمْ وَأَعْقِرُ بِهِمْ، فَإِذَا رَجَعَ إِلَيَّ فَارِسٌ أَتَيْتُ شَجَرَةً فَجَلَسْتُ فِي أَصْلِهَا، ثُمَّ رَمَيْتُهُ فَعَقَرْتُ بِهِ، حَتَّى إِذَا تَضَايَقَ الْجَبَلُ فَدَخَلُوا فِي تَضَايُقِهِ عَلَوْتُ الْجَبَلَ، فَجَعَلْتُ أُرَدِّيهِمْ بِالْحِجَارَةِ، قَالَ: فَمَا زِلْتُ كَذَلِكَ أَتْبَعُهُمْ حَتَّى مَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ بَعِيرٍ مِنْ ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِلَّا خَلَّفْتُهُ وَرَاءَ ظَهْرِي، وَخَلَّوْا بَيْنِي وَبَيْنَهُ، ثُمَّ اتَّبَعْتُهُمْ أَرْمِيهِمْ حَتَّى أَلْقَوْا أَكْثَرَ مِنْ ثَلَاثِينَ بُرْدَةً وَثَلَاثِينَ رُمْحًا يَسْتَخِفُّونَ، وَلَا يَطْرَحُونَ شَيْئًا إِلَّا جَعَلْتُ عَلَيْهِ آرَامًا مِنَ الْحِجَارَةِ، يَعْرِفُهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ، حَتَّى أَتَوْا مُتَضَايِقًا مِنْ ثَنِيَّةٍ، فَإِذَا هُمْ قَدْ أَتَاهُمْ فُلَانُ بْنُ بَدْرٍ الْفَزَارِيُّ: فَجَلَسُوا يَتَضَحَّوْنَ -يَعْنِي يَتَغَدَّوْنَ- وَجَلَسْتُ عَلَى رَأْسِ قَرْنٍ، قَالَ الْفَزَارِيُّ: مَا هَذَا الَّذِي أَرَى؟ قَالُوا: لَقِينَا مِنْ هَذَا الْبَرْحَ، وَاللَّهِ مَا فَارَقَنَا مُنْذُ غَلَسٍ يَرْمِينَا حَتَّى انْتَزَعَ كُلَّ شَيْءٍ فِي أَيْدِينَا، قَالَ: فَلْيَقُمْ إِلَيْهِ نَفَرٌ مِنْكُمْ أَرْبَعَةٌ، قَالَ: فَصَعِدَ إِلَيَّ مِنْهُمْ أَرْبَعَةٌ فِي الْجَبَلِ، قَالَ: فَلَمَّا أَمْكَنُونِي مِنَ الْكَلَامِ، قَالَ: قُلْتُ: هَلْ تَعْرِفُونِي؟ قَالُوا: لَا، وَمَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: قُلْتُ: أَنَا سَلَمَةُ بْنُ الْأَكْوَعِ، وَالَّذِي كَرَّمَ وَجْهَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) لَا أَطْلُبُ رَجُلًا مِنْكُمْ إِلَّا أَدْرَكْتُهُ، وَلَا يَطْلُبُنِي رَجُلٌ مِنْكُمْ فَيُدْرِكَنِي، قَالَ أَحَدُهُمْ: أَنَا أَظُنُّ، قَالَ: فَرَجَعُوا، فَمَا بَرِحْتُ مَكَانِي حَتَّى رَأَيْتُ فَوَارِسَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَتَخَلَّلُونَ الشَّجَرَ، قَالَ: فَإِذَا أَوَّلُهُمُ الْأَخْرَمُ الْأَسَدِيُّ عَلَى إِثْرِهِ أَبُو قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيُّ، وَعَلَى إِثْرِهِ الْمِقْدَادُ بْنُ الْأَسْوَدِ الْكِنْدِيُّ [(ﷺ)] قَالَ: فَأَخَذْتُ بِعِنَانِ الْأَخْرَمِ، قَالَ فَوَلَّوْا مُدْبِرِينَ، قُلْتُ: يَا أَخْرَمُ

احْذَرْهُمْ، لَا يَقْتَطِعُوكَ حَتَّى يَلْحَقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ، قَالَ: يَا سَلَمَةُ إِنْ كُنْتَ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتَعْلَمُ أَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ، وَالنَّارَ حَقٌّ، فَلَا تَحُلْ بَيْنِي وَبَيْنَ الشَّهَادَةِ، قَالَ: فَخَلَّيْتُهُ، فَالْتَقَى هُوَ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ، قَالَ: فَعَقَرَ بِعَبْدِ الرَّحْمَنِ فَرَسَهُ، وَطَعَنَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَقَتَلَهُ، وَتَحَوَّلَ عَلَى فَرَسِهِ، وَلَحِقَ أَبُو قَتَادَةَ فَارِسُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِعَبْدِ الرَّحْمَنِ فَطَعَنَهُ فَقَتَلَهُ فَوَالَّذِي كَرَّمَ وَجْهَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) لَتَبِعْتُهُمْ أَعْدُو عَلَى رِجْلَيَّ حَتَّى مَا أَرَى وَرَائِي مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَلَا غُبَارِهِمْ شَيْئًا، حَتَّى يَعْدِلُوا قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ إِلَى شِعْبٍ فِيهِ مَاءٌ يُقَالُ لَهُ، ذُو قَرَدٍ، لِيَشْرَبُوا مِنْهُ وَهُمْ عِطَاشٌ، قَالَ: فَنَظَرُوا إِلَيَّ أَعْدُو وَرَاءَهُمْ، فَخَلَّيْتُهُمْ عَنْهُ -يَعْنِي أَجْلَيْتُهُمْ عَنْهُ- فَمَا ذَاقُوا مِنْهُ قَطْرَةً، قَالَ: وَيَخْرُجُونَ فَيَشْتَدُّونَ فِي ثَنِيَّةٍ، قَالَ: فَأَعْدُو فَأَلْحَقُ رَجُلًا مِنْهُمْ، فَأَصُكُّهُ بِسَهْمٍ فِي نُغْضِ كَتِفِهِ، قَالَ: قُلْتُ: خُذْهَا وَأَنَا ابْنُ الْأَكْوَعِ وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ. قَالَ: يَا ثَكِلَتْهُ أُمُّهُ أَكْوَعُهُ بُكْرَةَ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ يَا عَدُوَّ نَفْسِهِ أَكْوَعُكَ بُكْرَةَ، قَالَ: وَأَرْدَوْا فَرَسَيْنِ عَلَى ثَنِيَّةٍ، قَالَ: فَجِئْتُ بِهِمَا أَسُوقُهُمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: وَلَحِقَنِي عَامِرٌ بِسَطِيحَةٍ فِيهَا مَذْقَةٌ مِنْ لَبَنٍ وَسَطِيحَةٍ فِيهَا مَاءٌ، فَتَوَضَّأْتُ وَشَرِبْتُ، ثُمَّ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ عَلَى الْمَاءِ الَّذِي حَلَّأْتُهُمْ عَنْهُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ أَخَذَ تِلْكَ الْإِبِلَ، وَكُلَّ شَيْءٍ اسْتَنْقَذْتُهُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، وَكُلَّ رُمْحٍ وَبُرْدَةٍ، وَإِذَا بِلَالٌ نَحَرَ نَاقَةً مِنَ الْإِبِلِ الَّذِي اسْتَنْقَذْتُ مِنَ الْقَوْمِ، وَإِذَا هُوَ يَشْوِي لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ كَبِدِهَا وَسَنَامِهَا، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خَلِّنِي فَأَنْتَخِبُ مِنَ الْقَوْمِ مِائَةَ رَجُلٍ فَأَتَّبِعُ الْقَوْمَ، فَلَا يَبْقَى مِنْهُمْ مُخْبِرٌ إِلَّا قَتَلْتُهُ، قَالَ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ فِي ضَوْءِ النَّارِ، فَقَالَ: ((يَا سَلَمَةُ، أَتُرَاكَ كُنْتَ فَاعِلًا)). قُلْتُ: نَعَمْ وَالَّذِي أَكْرَمَكَ، فَقَالَ: ((إِنَّهُمُ الْآنَ لَيُقْرَوْنَ فِي أَرْضِ غَطَفَانَ)). قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ غَطَفَانَ فَقَالَ: نَحَرَ لَهُمْ فُلَانٌ جَزُورًا، فَلَمَّا كَشَفُوا جِلْدَهَا رَأَوْا غُبَارًا، فَقَالُوا: أَتَاكُمُ الْقَوْمُ، فَخَرَجُوا هَارِبِينَ. فَلَمَّا أَصْبَحْنَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ خَيْرَ فُرْسَانِنَا الْيَوْمَ أَبُو قَتَادَةَ وَخَيْرَ رَجَّالَتِنَا سَلَمَةُ)). قَالَ: ثُمَّ أَعْطَانِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) سَهْمَيْنِ: سَهْمَ الْفَارِسِ وَسَهْمَ الرَّاجِلِ، فَجَمَعَهُمَا لِي جَمِيعًا. ثُمَّ أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَرَاءَهُ عَلَى الْعَضْبَاءِ رَاجِعِينَ إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَبَيْنَمَا نَحْنُ نَسِيرُ، قَالَ: وَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ لَا يُسْبَقُ شَدًّا، قَالَ: فَجَعَلَ يَقُولُ: أَلَا مُسَابِقٌ إِلَى الْمَدِينَةِ؟ هَلْ مِنْ مُسَابِقٍ؟ فَجَعَلَ يُعِيدُ ذَلِكَ، قَالَ: فَلَمَّا سَمِعْتُ كَلَامَهُ قُلْتُ: أَمَا تُكْرِمُ كَرِيمًا وَلَا تَهَابُ شَرِيفًا؟ قَالَ: لَا إِلَّا أَنْ يَكُونَ

رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي وَأُمِّي ذَرْنِي فَلأُسَابِقَ الرَّجُلَ. قَالَ: ((إِنْ شِئْتَ)). قَالَ: قُلْتُ: اذْهَبْ إِلَيْكَ، وَثَنَيْتُ رِجْلِيَّ فَطَفَرْتُ فَعَدَوْتُ، قَالَ: فَرَبَطْتُ عَلَيْهِ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، أَسْتَبْقِي نَفَسِي، ثُمَّ عَدَوْتُ فِي إِثْرِهِ، فَرَبَطْتُ عَلَيْهِ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، ثُمَّ إِنِّي رَفَعْتُ حَتَّى أَلْحَقَهُ، قَالَ: فَأَصُكُّهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، قَالَ: قُلْتُ: قَدْ سُبِقْتَ وَاللَّهِ، قَالَ: أَنَا أَظُنُّ، قَالَ: فَسَبَقْتُهُ إِلَى الْمَدِينَةِ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا لَبِثْنَا إِلَّا ثَلَاثَ لَيَالٍ حَتَّى خَرَجْنَا إِلَى خَيْبَرَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: فَجَعَلَ عَمِّي عَامِرٌ يَرْتَجِزُ بِالْقَوْمِ:

تَاللَّهِ لَوْلَا اللَّهُ مَا اهْتَدَيْنَا ... وَلَا تَصَدَّقْنَا وَلَا صَلَّيْنَا

وَنَحْنُ عَنْ فَضْلِكَ مَا اسْتَغْنَيْنَا ... فَثَبِّتِ الْأَقْدَامَ إِنْ لَاقَيْنَا

وَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ هَذَا)). قَالَ: أَنَا عَامِرٌ، قَالَ: ((غَفَرَ لَكَ رَبُّكَ)). قَالَ: وَمَا اسْتَغْفَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِإِنْسَانٍ يَخُصُّهُ إِلَّا اسْتُشْهِدَ، قَالَ: فَنَادَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) وَهُوَ عَلَى جَمَلٍ لَهُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ لَوْلَا مَا مَتَّعْتَنَا بِعَامِرٍ، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا خَيْبَرَ قَالَ: خَرَجَ مَلِكُهُمْ مَرْحَبٌ يَخْطِرُ بِسَيْفِهِ وَيَقُولُ:

قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي مَرْحَبُ ... شَاكِي السِّلَاحِ بَطَلٌ مُجَرَّبُ

إِذَا الْحُرُوبُ أَقْبَلَتْ تَلَهَّبُ

قَالَ وَبَرَزَ لَهُ عَمِّي عَامِرٌ فَقَالَ:

قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي عَامِرٌ ... شَاكِي السِّلَاحِ بَطَلٌ مُغَامِرٌ

قَالَ: فَاخْتَلَفَا ضَرْبَتَيْنِ فَوَقَعَ سَيْفُ مَرْحَبٍ فِي تُرْسِ عَامِرٍ وَذَهَبَ عَامِرٌ يَسْفُلُ لَهُ، فَرَجَعَ سَيْفُهُ عَلَى نَفْسِهِ فَقَطَعَ أَكْحَلَهُ، فَكَانَتْ فِيهَا نَفْسُهُ. قَالَ سَلَمَةُ: فَخَرَجْتُ فَإِذَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) يَقُولُونَ: بَطَلَ عَمَلُ عَامِرٍ، قَتَلَ نَفْسَهُ. قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَنَا أَبْكِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَطَلَ عَمَلُ عَامِرٍ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ قَالَ ذَلِكَ)). قَالَ: قُلْتُ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِكَ. قَالَ: ((كَذَبَ مَنْ قَالَ ذَلِكَ، بَلْ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ)). ثُمَّ أَرْسَلَنِي إِلَى عَلِيٍّ (ﷺ) وَهُوَ أَرْمَدُ فَقَالَ: ((لَأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ رَجُلًا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أَوْ يُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ)). قَالَ: فَأَتَيْتُ عَلِيًّا (ﷺ) فَجِئْتُ بِهِ أَقُودُهُ وَهُوَ أَرْمَدُ، حَتَّى أَتَيْتُ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَبَسَقَ فِي عَيْنَيْهِ فَبَرَأَ، وَأَعْطَاهُ الرَّايَةَ.

وَخَرَجَ مَرْحَبٌ فَقَالَ:

قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي مَرْحَبُ شَاكِي السِّلَاحِ بَطَلٌ مُجَرَّبُ
إِذَا الْحُرُوبُ أَقْبَلَتْ تَلَهَّبُ

فَقَالَ عَلِيٌّ (ﷺ):

أَنَا الَّذِي سَمَّتْنِي أُمِّي حَيْدَرَهْ كَلَيْثِ غَابَاتٍ كَرِيهِ الْمَنْظَرَهْ
أُوفِيهِمُ بِالصَّاعِ كَيْلَ السَّنْدَرَهْ

قَالَ: فَضَرَبَ رَأسَ مَرْحَبٍ فَقَتَلَهُ ثُمَّ كَانَ الْفَتْحُ عَلَى يَدَيْهِ.

(إياس) کوڕی (سَلَمة) دەڵێ: باوکم (ﷺ) بۆی گێڕامەوە و وتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) گەیشتینە حودەیبیە و ئێمە چواردەسەد (هەزار و چوارسەد) کەس بووین، پەنجا سەر مەڕ لەسەر ئاوەکەن بوون بەشی نەدەکردن تێرئاویان بکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر کۆماخۆڵی دەوری بیرەکە دانیشت یان دۆعای کرد وەیان تفی کردە ناو بیرەکە، وتی: ئاو هاتە سەر، خۆمان ئاومان خواردەوە و ئاژەڵەکانیشمان لێئاودا، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کردین بۆ پەیمان دان لە ژێر درەختەکەدا[1] لەگەڵ خەڵکانی پێشەوە و لەدەستەی یەکەمدا پەیمانم پێدا، پاشان یەک لەدوای یەک پەیمانی بەست لەگەڵ خەڵکەکە تانیوە بوو، فەرمووی: ((ئەی سَلَمة پەیمان بدە)) وتم ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ دەستەی یەکەمدا پەیمانم پێدایت، فەرمووی: ((دووبارەی کەرەوە)). پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بینیمی بێچەکم قەڵغانێکی پێدام، دیسانەوە دەستی کردەوە بە پەیمان وەرگرتن تا گەیشتە کۆتایی خەڵکەکە و دیسانەوە فەرمووی: ((ئەی سَلَمة پەیمانم پێنادەیت))، وتم ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ دەستەی یەکەمدا پەیمانم پێدایت، وە لەناوەڕاستی خەڵکەکەیشدا پەیمانم پێدایت، فەرمووی: ((دیسانەوە))، منیش بۆ سێیەم جار پەیمانم پێدا، پاشان فەرمووی پێم: ((ئەی سَلَمة کوا ئەو قەڵغانەی کە پێم دایت)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (عامر)ی مامم گەیشت پێم و بێچەك بوو دام بەو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: ((تۆ وەك ئەو پێشینە وایت کە وتویەتی: خوایە خۆشەویستێکم بدەرێ لە خۆم خۆشترم بووێت)). پاشان

---

[1] مەبەست درەختی الرضوانە.

بێباوەڕان ناردیانە لامان بۆ ئاشتەوایی، هەتا هاتووچۆ كەوتە نێوانمان و ڕێكەوتین، باوكم وتی: ئەو كاتە منیش ڕەنجبەری (طلحة) كوڕی (عبیدالله) بووم ئەسپەكەیم ئاودەدا و ڕنەم دەكرد (تۆزم لێ دەوراند)، خزمەتی خۆیشیم دەكرد و لە خواردنەكەیم دەخوارد، خێزان و ماڵی خۆمم بە جێهێشتبوو كۆچم كردبوو بۆ لای خوا و پێغەمبەرەكەی (ﷺ). هەركە ئێمە و خەڵكی مەككە ئاشتەوایمان كرد ئیتر تێكەڵ بەیەك بووین، من هاتمە بنی درەختێك دڕكەكەیم ماڵی و لە بنی دارەكەدا ڕاكشام، چوار لە بێباوەڕانی خەڵكی مەككە هاتنە تەنیشتم بۆبنی درەختەكە، وتی: كەوتنە قسەی نابەجێ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لێیان بێزاربووم و گوێزامەوە بۆ بنی درەختێكی تر، ئەوانیش چەكەكانیان هەڵواسی (بە درەختەكەدا) و لێی ڕاكێشان، لە كاتێكدا كە ئەوان لەو حاڵەتەدا بوون، لە خوارووی دۆڵەكەوە بانگكەرێك بانگی كرد: ئۆ هۆ.. كۆچبەران (ابن زُنیم) كوژرا، منیش شمشێرەكەمم لەكێلان دەرهێنا و چوومە سەر ئەو چواركەسەی (لە نزیكمەوە) كەلە خەودا بوون، چەكەكانیانم هەڵگرت و كرد من یەك باوەش لە دەستمدا، پاشان وتم: سوێند بەو كەسەی كە ڕێزی بە ڕوخساری محمد (ﷺ) بەخشیوە هەر كەستان سەری بەرزبكاتەوە دەكێشم بە ناوچاوانیدا. پاشان پێشی خۆمم دان و هێنانم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەر لەوكاتەدا عامری مامیشم پیاوێكی (العَبَلات)[1]ی هێنابوو پێی دەوترا (مِكرَز) پێشی كەوتبوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر ئەسپێكەوە بوو كە جلی زۆری لەسەر بوو لەناو حەفتاكەس لە بێباوەڕاندا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیرێكی كردن و فەرمووی: ((وازیان لێ بهێنە با سەرەتا و دووبارە بوونەوەی تاوانیش لەوانەوە بێ)). پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێیان خۆش بوو، خوای (ﷻ) ئەم ئایەتەی سەرەوەی ناردە خوارەوە، كە ئەمە ماناكەیەتی: ﴿هەر ئەو خوایە دەستی بێباوەڕانی لە ئێوە بەستەوە، (نەیهێشت بە گژتاندا بێن دەستی ئێوەشی گرتەوە دژیان و (نەیهێشت جەنگ بێت) دوای ئەوەی ئێوەی زاڵ كرد بەسەریاندا: لەناو جەرگەی مەككە دا، خوا هەمیشە و بەردەوام بینایە بەوەی كە دەیكەن) پاشان گەڕاینەوە بۆ مەدینە لە مەنزڵێكدا دابەزین بۆ

---

[1] العبلات: تیرەیەكە لە قورەیش.

حەوانەوە، لە نێوان ئێمە و (بنو لحیان) دا کە بێباوەڕ بوون کەژێك هەبوو. ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای لێخۆشبوونی کرد بۆ ئەو کەسەی کە ئەو شەوە دەچێتە سەر کەژەکە و وەك پێشەنگێك بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی، سلمة دەڵێ: ئەو شەوە دووجار یان سێجار سەرکەوتمە سەر کەژەکە، پاشان کەگەیشتینەوە مەدینە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ولاغی سوارییەکەیی نارد لەگەڵ (رباح) دا کە بەردەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو بۆ (لەوەڕ) منیشی لەگەڵدابوو بەئەسپەکەی (طلحة)وە تا لەگەڵ وشترەکەی پێغەمبەردا بیلەوەڕێنم. هەر کە بەیانیمان لێبوویەوە (عبدالرحمن الفزاري) هەڵیکوتایە سەر حوشترەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەموویانی ڕاپێچ کردن و شوانەکەی کوشت، منیش وتم: ئەی (رباح) ئەو ئەسپە ببە و بیگەیەنەرە (طلحة)ی کوڕی (عبدالله)و، هەواڵ بدە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بێباوەڕان هەڵیانکوتاوەتە سەر ئاژەڵەکانی، (باوکم) وتی: پاشان هەستام و چوومە سەر بەرزاییەك و ڕووم کردە مەدینە و سێجار هاوارم کرد: ئای هاوار بۆ ئەم بەیانیە! پاشان ڕۆیشتم و شوێن پێی بێباوەڕان کەوتم و تیرم تێگرتن. بە ئاوازەوە دەمووت: من کوڕی (الأكوعم) ئەمڕۆش ڕۆژی لەناو چوونی ئەو کەسەیە بە نامەردی شیری دایکی خۆی مژیوە[1]، کە دەگەیشتمە پیاوێك (لەوان) تیرێکم دەگرتە بارەکەی تیرەکە لەسەر شانی جێگیردەبوو، دەمووت دەوەریگرە لە کوڕەکەی (الأكوع)ەوە ئەمڕۆش ڕۆژی لەناو چوونی ئەو کەسەیە کە بە نامەردی شیری دایکی خۆی مژیوە،سوێند بە خوا بەردەوام تیرم تێدەگرتن و لە خۆیان و لە ئەسپەکانیانم دەکوشت،ئەگەر سوارێکیان بگەڕایەتەوە بۆم سەنگەرم دەگرت لەبن درەختێکداوتیرم تێدەگرتو ئەسپەکەشم دەکوشت تا کەژەکە بەرەو تەنگەبەرایی دەچوو ئەوانیش دەهاتنە ناو تەنگەبەرایی دەربەندەکەوە منیش دەچوومە سەر چیاکە و دەکەوتمە تلۆرکردنەوەی بەرد بەسەریاندا، هەروا بەردەوام بەو شێوەیە بەدوایانەوە بووم هەتا ئەوەی خوا دروستی کردبوو لەحوشتری سواری پێغەمبەری خوا (ﷺ) خستمە پشتەوەی خۆم و،پێیم بەجێهێشتن،پاشان هەر شوێنیان کەوتم و تیرم تێدەگرتن تازیاتر لەسیعەباو

[1] بڕوانە (لسان العرب) (لأبن المنظور . مادة (الرضَع)

سی ڕمیان فڕێدا و باری خۆیان سوك دەکرد، هەر شتێکیان فڕێبدایە لەبەرد (قۆچکە)یەکم لەسەر دروست دەکرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵەکانی دەیانناسیەوە، هەتا گەیشتنە دەربەندێك لە ڕێگەی شاخەکەدا، ئالەوێدا پیاوێك بەناوی فلانە کوڕی (بدر الفزاري) هاتە لایان، دانیشتن و نانیان دەخوارد منیش لەسەر کورسیەك [قوچکەیەك] دانیشتم، (الفزاري)یەکە وتی: ئائەوە کە دەیبینم چیە؟ وتیان: ئالەوەوە توشی ناڕەحەتی سەخت هاتین، بەخوا لە تاریکایی شەوەوە لێمان جیانەبوەتەوە تیرمان تێدەگرێت هەتا هەرچی لەدەستماندا بوو لێی سەندین، (الفزاري)یەکە وتی: با چوار کەستان هەستن بچن بۆی، (باوکم) وتی: چوارکەسیان بە شاخەکەدا سەرکەوتن بۆم، هەر کە نزیك بوونەوە تا بتوانم دەنگم بیانگاتێ، وتم: ئایا دەمناسن؟وتیان: نەخێر، تۆ کێیت؟ وتم: من (سلمة کوڕی الاکوعم) سوێند بەو کەسەی محمدی (ﷺ) ڕێزدار کردووە شوێن هەر کەسێکتان بکەوم دەیگەمێ، هەر کەسێکیشتان شوێنم بکەوێ نامگاتێ. یەکێکیان وتی: گومان دەبەم وابێت، هەموو گەڕانەوە، لە شوێنی خۆم نەجوڵام هەتا سوارەکانی پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی لە نێوان درەختکانەوە دەرکەوتن، یەکەم کەسیان(الأخرم الأسدي) بوو، (أبو قتادة)ی الأنصاري بە شوێنیەوە بوو، بە شوێن ئەوانیشدا (المقداد بن الأسود الكندي) (ﷺ) هاتن، جڵەوی ئەسپەکەی (الأخرمم) گرت، بێباوەڕان پشتیان هەڵکرد و هەڵاتن، وتم: ئەی الاخرم وریایان بە، نەکەی دات بڕن هەتا پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی دەگەن، وتی: ئەی (سَلَمة) ئەگەر باوەڕت بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە دەزانی کە بە هەشت ڕاستەو، دۆزەخ ڕاستە، مەکەوەرە نێوان من و شەهید بوون، لێی گەڕام ،ئەو و (عبدالرحمن)بەیەك گەیشتن، ئەسپەکەی(عبدالرحمن)ی کوشت، عبدالرحمانیش دای لە (اخرم)و کوشتی، چووە سەر ئەسپەکەی ئەو، ئینجا (أبوقتادة)ی سوارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە (عبدالرحمن)و لێی داو کوشتی، سوێند بەو کەسەی کە ڕێزی بە محمد (ﷺ) بەخشیوە هێزم دایە سەر هەردوو قاچم و شوێنیان کەوتم هەتا لەدوامەوە نە هاوەڵانی محمد (ﷺ) و نە هیچ لە تەپو تۆزیانم نەدەبینی، تالە پێش خۆر ئاوابووندا تینویان بوو لایاندایە دۆڵێك کە کانیەکی تێدابوو بۆ ئاو خواردنەوە پێی دەوترا: (ذو قَرَدٍ) کە سەیریان کردم بە دوایانەوەم. لە ئاوەکەم کردن- واتە دوورم خستنەوە لێی- تامی تەنها

دڵۆپێکیان نەکرد لێی، کەوتنە ڕۆیشتن و هەورازەکە ناڕەحەتی کردن، وتی: کەوتمە شوێنیان و هەر کە دەگەیشتم بە پیاوێکیان ، تیرێکم دەسرەواندە ئێسقانی سەرشانی و، دەمووت: وەریگرە من کوڕی الاکوعم و ، ئەمڕۆش ڕۆژی لەناو چوونی ئەو کەسەیە کە بە نامەردی شیری دایکی خۆی مژیوە وتی: ئەی دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات تۆ ئەو أکوعەی کەلە بەیانیەوە بە شوێنمانەوەیت؟ وتم: بەڵێ ئەی ئەو کەسەی کە دوژمنی خۆیەتی من ئەو(اکوعەم)کەلە بەیانیەوە بە شوێنتەوەم، لەسەر دەربەندەکەدا دوو ئەسپیان بەجێهێشت، : پێش خۆمم دان و هەردووکیانم هێنا بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، (عامر) گەیشت پێم بە جەوەندەکەیەوە کە ماستاوی تێدابوو و جەوەندەیەکی تریش کە ئاوی تێدابوو ئینجا، دەست نوێژم گرت و ئاویشم خواردەوە ، پاشان هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسە ئەو ئاوە دانیشتبوو کە بێباوەڕانم دوورخستەوە لێی، بینیم وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو حوشترەکان هەمووشتەکانی تری لەعەباو ڕم کەلەبێباوەڕانم سەندبوونەوەو (بلال) حوشترێك لەو حوشترانەی سەربڕیوە کە لە بێباوەڕەکانم سەندبوونەوە، خەریك بوو لە جگەر و لە کۆپارەکەی دەبرژاند بۆ پێغەبمەری خوا (ﷺ)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لێم گەڕێ با سەد پیاو لەم خەڵکە هەڵبژێرم و شوێنی بێباوەڕان بکەوم، هەموویان بکوژم و کەسێکیان لێنەمێنێتەوە هەواڵ بباتەوە بۆ (قەومەکەی)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی هەتا لەبەر ڕۆشنایی ئاگرکەدا خرێکانی دەرکەوت، ئینجا فەرمووی: ((ئەی سلمة، بەخۆتدا ڕادەبینی کە ئەوەت بۆ دەکرێت)). وتم: بەڵێ و سوێند بەو کەسەی ڕێزی لێ گرتوویت. ئینجا فەرمووی: ((ئێستە ئەوان لە خاکی غطفان دا میوانداریان دەکرێ)). لەوکاتەدا پیاوێکی (غطفاني) هات و وتی: فلانە کەس حوشترێکی بۆسەربڕیون، لەدوای ئەوە کە پێستەکەیان داماڵی تەپوتۆزێکیان بینی، وتیان: قەومەکە (واتە موسڵمانان) هاتن بۆتان، ڕۆیشتن و ڕایان کرد، کە بەیانیمان لێبوویەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: چاکترین سوارەمان لەم ڕۆژەدا (ابو قتادة) بوو، وە چاکترین جەنگاوەری پیادەمان (سلمة) بوو)) (باوکم) وتی: پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشکی لە دەستکەوتی جەنگی پێدام: پشکی سوار و پشکی پیادە، هەردووکیانی کرد بەیەك بۆم، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاشکۆی خۆیەوە (لەسەر حوشترە

قەڵەوەکە) سواری کردم و گەڕاینەوە بۆ مەدینە، لە کاتێکدا کە ئێمە لە ڕۆیشتندا بووین، پیاوێك لە پشتیوانان هەبوو کەس لە ڕۆیشتندا پێشی نەدەکەوت، هەر دەیوت: ئایا کەسێ هەیە پێشبڕکێم لەگەڵدا بکات بۆ مەدینە؟ ئایا کەسێ هەیە پێشبڕکێ بکات؟ هەر ئەوەی دووبارە دەکردەوە، هەر کە گوێم لە قسەکانی بوو وتم: ئەی تۆ ڕێز لە بەڕێزێك ناگری و سڵ ناکەیت لە پیاوماقوڵی؟ وتی: نەخێر مەگەر ئەو کەسە پێغەمبەری خوا بێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا باوك و دایکم فیدات بن لێم گەڕێ با پێشبڕکێ بکەم لەگەڵ ئەو پیاوەدا، فەرمووی: ((ئەگەر ئەتەوێ)) وتم: وا هاتم بۆ لات. هەردوو قاچم جووت کرد و کەوتمە بازدان و بە شوێنیەوە بووم، یەك یا دوو تەپۆڵکە خۆم دواخست، تا هەناسەم سوار نەبێ، پاشان کەوتمە شوێنی، تەپۆڵکەیەك یان دوو تەپۆڵکەی تر خۆمم لێ هێواش کرد، پاشان پێم هەڵگرت و هەتا پێی گەیشتمەوە، ئینجا دەستم ماڵی بە ناو شانیدا، وتم: بەخوا پێشتم دایەوە وتی: وادەبینم. وتی: لەپێشیەوە گەیشتمە مەدینە وتم: بەخوا سێ شەو نەبێ ئیتر لە مەدینە نەماینەوە تا چووین بۆ (خیبر) لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا، عامری مامم بەناو خەڵکەکەدا کەوتە وتنی ئەم شیعرانە:

تالله لولا الله ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا

ونحن عن فضلك ما استغنينا فثّبت الأقدام إن لاقينا

وانزل سكينة علينا

سوێند بەخوا بەتۆنەبێ هیدایەتمان وەرنەدەگرت

نەخێرمان دەکردو نەنوێژمان دەکرد

ئێمە لە بەخشندەیی تۆ بێنیاز نین

دامەزراومان بکە گەر توشی دوژمن هاتین

دڵئارامی و ئاسودەیی دابەزێنە سەرمان

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە کێیە)). وتی: من عامرم. فەرمووی: ((خوای گەورە لێت خۆش بوو)). پێغەمبەری خوا (ﷺ) دۆعای لێخۆشبوونی بەتایبەتی بۆ هەر کەس بکردایە شەهید دەبوو، وتی: (عمر) کوڕی (الخطاب) بەسەر حوشترێکەوە بوو هاواری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر دلخۆشت بکردینایە بە عامر (واتە لەناوماندا دەما و قسەی خۆشی بۆ

دەکردین)، وتی:کاتێ گەیشتینە (خیبر) وتی: (مَرحب)ی پادشایان دەرچووە دەرەوە و شمشێرەکەی بادەدا و دەیلەراند و دەیوت:

قد علمت خيبرُ اني مَرحَب　　شاكي السلاح بطلٌ مجربٌ

إذا الحروب اقبلت تَلهّبٌ

خیبر دەزانێ کە من مرحبم

چەکەکەم بەهێز و تیژە و پاڵەوانێکی بە ئەزموونم

هەر کە شەڕ هاتە پێش ئاگر دەگرێ

ئینجا عامری مام لێی چووە پێش وتی:

قد علمت خيبرُ اني عامرُ　　شاكي السلاح بطل مغامر

خیبر دەزانێ منیش عامرم

چەکەکەم بەهێز و تیژە و گوێنادەم و دەچمە پێش

یەکی شیرێکیان بۆ یەکتر داهێنا، شمشێرەکەی مَرحَب دای لە قەڵغانەکەی عامر و عامریش بە ئەنقەست کەوتە لێدانی قاچ و قولی مُرحَب، شمشێرەکەی عامر گەڕایەوە بۆ خۆی و ڕەگی باڵی بڕی (کە خوێنی ناوەستێتەوە) بە جۆرێ کە گیانی لێسەند، (سلمة) دەڵێ: ئینجا چوومە دەرێ، و چەند کەسێکم لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بینی دەیانوت: عامر ڕەنجەڕۆ بوو خۆی خۆی کوشت، وتی:دەم بە گریانەوە هاتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و عەرزم کرد، ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا عامر ڕەنجەڕۆ بووە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((کێ ئەوە دەڵێ)). وتم: کەسانێك لە هاوەڵانت. فەرمووی: ((هەر کەسێ ئەوەی وت درۆی کرد بەڵکو دوو قات پاداشتی هەیە)). لە پاشان ناردمی بۆلای (علي) (ﷺ) کە چاو ئێشەی بوو فەرمووی: ((ئەم ئاڵایە دەدەم بە پیاوێك کە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش بووێت و خوا و پێغەمبەرەکەیشی ئەویان خۆش بوێت)). هاتمە لای (علي)(ﷺ) دەستم گرت هێنام کە چاوئێشەی بوو هەتا هێنامە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تفی کردە هەردوو چاوی و چاك بوویەوە، ئینجا ئاڵاکەی دایە دەستی.

مرحب دەرچوو وتی:

قد علمت خيبر اني مرحبُ　　شاكي السلاح بطلُ مجّرب

إذا الحروب اقبلت تَلَهّبُ

خيبر دەزانێ كە من مرحبم
چەكەكەم بەهێز و تيژە و پاڵەوانێكی بە ئەزموونم
ئەگەر شەڕەكان هاتنە پێش گڕ دەگرێ و بەرەو ڕوويان دەبێتەوە
ئينجا علي (ﷺ) وتی:

انا الذي سمتني امي حَيدَرة كليث غاباتٍ كريهِ المنظرةَ
أو فيهم بالصاع كيل السَندَرة

من ئەو كەسەم كە دايكم ناوی ناوم حيدرة
وەك شێری بێشەوام و ديمەنێكی بەهەيبەتم هەيە
بە (مەنێ) دەياندەمەوە كە مەنی (سندرة) بێ
(مەبەستی ئەوەيە دەستيان لێناپارێزێت)

ئينجا دای لە سەری مَرحَب و كوشتی، ڕزگار كردنی خيبر لەسەر دەستی ئەو دابوو.

## (١٧) ئاشتەوايی (الحديبية)

١١٢٧ـ عَنِ الْبَرَاءِ بن عازب(ﷺ) قَالَ: لَمَّا أُحْصِرَ النَّبِيُّ (ﷺ) عِنْدَ الْبَيْتِ صَالَحَهُ أَهْلُ مَكَّةَ عَلَى أَنْ يَدْخُلَهَا فَيُقِيمَ بِهَا ثَلَاثًا، وَلَا يَدْخُلَهَا إِلَّا بِجُلُبَّانِ السِّلَاحِ: السَّيْفِ وَقِرَابِهِ، وَلَا يَخْرُجَ بِأَحَدٍ مَعَهُ مِنْ أَهْلِهَا، وَلَا يَمْنَعَ أَحَدًا يَمْكُثُ بِهَا مِمَّنْ كَانَ مَعَهُ، قَالَ لِعَلِيّ (ﷺ): ((اكْتُبِ الشَّرْطَ بَيْنَنَا: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ))). فَقَالَ لَهُ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ تَابَعْنَاكَ، وَلَكِنِ اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، فَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يَمْحَاهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لَا وَاللَّهِ لَا أَمْحَاهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَرِنِي مَكَانَهَا)). فَأَرَاهُ مَكَانَهَا، فَمَحَاهَا وَكَتَبَ: ((ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ)). فَأَقَامَ بِهَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا أَنْ كَانَ يَوْمُ الثَّالِثِ، قَالُوا لِعَلِيّ (ﷺ): هَذَا آخِرُ يَوْمٍ مِنْ شَرْطِ صَاحِبِكَ، فَأْمُرْهُ فَلْيَخْرُجْ. فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ: ((نَعَمْ)). فَخَرَجَ. [البخاري/ الصلح/ ٢٥٥١]

(البراء) كوڕی (عازب) (ﷺ) دەڵێ: كاتێ كە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێی لێگيرا لەوە كە بچێت بۆ كەعبە، دانيشتوانی مەككە ڕێكەوتننامەی ئاشتيان لەگەڵدا مۆر كرد، كە (ساڵی داهاتوو)بێتە مەككەو سێ ڕۆژ تيايدا بمێنێتەوە، بەو مەرجەش بێ كە نابێ بچێتە ناوی تا شمشێرەكان لەناو كێلاندا نەبن، نابێ كەسێ لە

خەڵکی مەککە لەگەڵ خۆی ببات، نابێ کەس قەدەغە بکات لەمانەوە تیایدا لەو خەڵکەی لەگەڵیدان، فەرمووی بە علي (ﷺ) ((مەرجەکە لە نێوانماندا بنووسە: بسم الله الرحمن الرحيم: محمد پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوە ڕێکەوت)) بێباوەڕەکان وتیان پێی: ئەگەر بمانزانیایە کە تۆ پێغەمبەری خوایت شوێنت دەکەوتین، بەڵام بنووسن محمد کوڕی عبدالله، فەرمانی دا بە علي کە (رسول الله) بکوژێنێتەوە، علي وتی: نە بە خوا نایکوژێنمەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((شوێنەکەیم نیشان بدە)). شوێنەکەی نیشان دا، بە دەستی خۆی کوژاندیەوە و نووسی: ((کوڕی عبدالله))، ساڵی داهاتوو هاتنەوە، سێ ڕۆژ لەمەککەدا مایەوە، هەر کە ڕۆژی سێیەم هات، وتیان بە علي (ﷺ) ئەمڕۆ دوایەمین ڕۆژی مەرجی هاوەڵەکەتە، پێی بڵێ با دەربچێت، (علي) ئاگاداری کرد، ئینجا فەرمووی: ((بەڵێ)) و دەرچوو

١١٢٨- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا. لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَوْزًا عَظِيمًا﴾ مَرْجِعَهُ مِنَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَهُمْ يُخَالِطُهُمُ الْحُزْنُ وَالْكَآبَةُ، وَقَدْ نَحَرَ الْهَدْيَ بِالْحُدَيْبِيَةِ، فَقَالَ: ((لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آيَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعًا)).

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: لە کاتێکدا ئەم ئایەتانەی سەرەوە دابەزین کە ئەمە ماناکەیەتی﴿ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕاستیدا ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت واتە ڕێکەوتنی (حودەیبیە)، تا خوا لە هەموو گوناهی ڕابردوو ئایندەشت خۆش ببێت، و... تا ئەم بەڵێنە لەلایەن خواوە دەست کەوت کەسەرفرازیەکی بێسنوورن بۆ ئیمانداران)) پێغەمبەر (ﷺ) لە حودەیبیە گەڕایەوە، هاوەڵانیشی خەم و خەفەت دایگرتبوون، پێغەمبەر قوربانیەکەی لە حودەیبیە سەربڕی بوو، فەرمووی: ((بەڕاستی ئایەتێك دابەزیوەتە سەرم ئەو ئایەتە لە هەمووی دونیا خۆشەویسترە لەلام)).

## (١٨) جەنگاوەرانی خیبر

١١٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى خَيْبَرَ، فَفَتَحَ اللَّهُ عَلَيْنَا، فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَبًا وَلَا وَرِقًا، غَنِمْنَا الْمَتَاعَ وَالطَّعَامَ وَالثِّيَابَ، ثُمَّ انْطَلَقْنَا إِلَى الْوَادِي، وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَبْدٌ لَهُ وَهَبَهُ لَهُ رَجُلٌ مِنْ جُذَامَ، يُدْعَى رِفَاعَةَ بْنَ زَيْدٍ مِنْ بَنِي الضُّبَيْبِ، فَلَمَّا نَزَلْنَا الْوَادِي قَامَ عَبْدُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَحُلُّ رَحْلَهُ

فَرُمِيَ بِسَهْمٍ، فَكَانَ فِيهِ حَتْفُهُ، فَقُلْنَا: هَنِيئًا لَهُ الشَّهَادَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كَلَّا وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، إِنَّ الشَّمْلَةَ لَتَلْتَهِبُ عَلَيْهِ نَارًا، أَخَذَهَا مِنَ الْغَنَائِمِ يَوْمَ خَيْبَرَ لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ)). قَالَ: فَفَزِعَ النَّاسُ، فَجَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أَوْ شِرَاكَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَبْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((شِرَاكٌ مِنْ نَارٍ. أَوْ: شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ)). [البخاري/ المغازي/ ٣٩٩٣]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕۆیشتین بۆ خیبر، خوای گەورە سەرکەوتووی کردین، دەستکەوتی جەنگیمان ئاڵتون و زیو نەبوو، بەڵکو دەستکەوتمان شمەك و خواردەمەنی و پۆشاك بوو، پاشان دەرچووین بەرەو دۆڵەکە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەندەیەکی لە گەڵدا بوو کە پیاوێکی (جذام) ی پێی بەخشیبوو، (بەندەکە) ناوی (رفاعة) کوڕی (زيد) لە (بني الضُّبيب)، کاتێ دابەزینە دۆڵەکە بەندەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەریکی داگرتنی بارەکەی بوو، تیرێکی تێگیرا و، بوە هۆی مردنی، ئێمەش وتمان: شەهید بوونی پیرۆز بێت ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((نەخێر و سوێند بێ بەو کەسەی گیانی (محمد) بەدەستیەتی، ئەو پۆشاکەی کەلەبەریدایە دەبێتە ئاگر و گڕ دەگرێ بەسەریدا، ڕۆژی خیبر لە نێو دەستکەوتەکانی جەنگدا هەڵیگرتوە و بەربەشکردن نەکەوتوە))، خەڵکی شڵەژان و پیاوێك بەقایشێك یان دووقایشەوە هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەم لە ڕۆژی خیبردا هەڵگرتووە. پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ((قایشێك لە ئاگر ، یان دوو قایش لە ئاگر)).

## ( ١٩ ) کۆچبەران بەخشراوەکان دەگێڕنەوە بۆ یارمەتی دەران

١١٣٠ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ مِنْ مَكَّةَ الْمَدِينَةَ، قَدِمُوا وَلَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ، وَكَانَ الْأَنْصَارُ أَهْلَ الْأَرْضِ وَالْعَقَارِ، فَقَاسَمَهُمُ الْأَنْصَارُ عَلَى أَنْ أَعْطَوْهُمْ أَنْصَافَ ثِمَارِ أَمْوَالِهِمْ كُلَّ عَامٍ، وَيَكْفُونَهُمُ الْعَمَلَ وَالْمَئُونَةَ، وَكَانَتْ أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَهِيَ تُدْعَى أُمَّ سُلَيْمٍ، وَكَانَتْ أُمُّ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ كَانَ أَخًا لِأَنَسٍ لِأُمِّهِ، وَكَانَتْ أَعْطَتْ أُمُّ أَنَسٍ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عِذَاقًا لَهَا، فَأَعْطَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أُمَّ أَيْمَنَ مَوْلَاتَهُ أُمَّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لَمَّا فَرَغَ مِنْ قِتَالِ أَهْلِ خَيْبَرَ، وَانْصَرَفَ إِلَى الْمَدِينَةِ، رَدَّ الْمُهَاجِرُونَ إِلَى الْأَنْصَارِ مَنَائِحَهُمُ الَّتِي كَانُوا مَنَحُوهُمْ

مِنْ ثِمَارِهِمْ، قَالَ: فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى أُمِّي عِذَاقَهَا، وَأَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أُمَّ أَيْمَنَ مَكَانَهُنَّ مِنْ حَائِطِهِ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ مِنْ شَأْنِ أُمِّ أَيْمَنَ أُمِّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ): أَنَّهَا كَانَتْ وَصِيفَةً لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَكَانَتْ مِنَ الْحَبَشَةِ، فَلَمَّا وَلَدَتْ آمِنَةُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ مَا تُوُفِّيَ أَبُوهُ فَكَانَتْ أُمُّ أَيْمَنَ تَحْضُنُهُ، حَتَّى كَبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَأَعْتَقَهَا، ثُمَّ أَنْكَحَهَا زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، ثُمَّ تُوُفِّيَتْ بَعْدَ مَا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِخَمْسَةِ أَشْهُرٍ. [البخاري/ الهبة/ ٢٤٨٧]

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: كاتێ كە كۆچكەران لە مەككەوە هاتنە مەدینە، بە دەستی خاڵی هاتن، یارمەتیدەرەكانیش خاوەنی زەوی و زار و خانووبەرە بوون، یارمەتیدەران كۆچبەرانیان كردە برابەشی خۆیان، لەسەر ئەوەی كە هەموو ساڵێ نیوەی بەروبوومی سامانی خۆیانیان بدەنێ، هەر ئەوەیان لێدەویست ئیشی تێدا بكەن و ئاوی بدەن، دایكی (انس) كوڕی (مالك)یش كە ناوی (أم سلیم) بوو، دایكی (عبدالله) كوڕی (طلحة) بوو، كە (عبدالله) برای دایكی (أنس) بوو، دایكی (انس) دارخورمایەكی خۆی دابوو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دارخورماكەی دابە دایكی (أیمن) كە دایكی (أسامە) كوڕی (زید)ە كە زوو لە ماڵی خۆیاندا بوو، (ابن شهاب) وتی: (انس) كوڕی (مالك) هەواڵی پێدام: كاتێ كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێبوویەوە لە جەنگی (خیبر) و، گەڕایەوە بۆ مەدینە، كۆچبەران ئەو دارخورمایانەیان گێڕایەوە بۆ یارمەتیدەران كە پێشتر بەروبومەكەیان پێبەخشیبوون، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دارخورمایەكەی گێڕایەوە بۆ دایكم، لە جێگەكەیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەباغەكەی خۆی بەشی دایكی (أم ایمن)ی دا، (ابن شهاب) وتی: لە باسی دایكی (ایمن) وە كە دایكی أسامة كوڕی زیدە (ﷺ)، ئەوە هەیە كە لە كاتی خۆیدا كەنیزەكی (عبدالله) كوڕی (عبدالمطلب) بووە، (لەنەژاد) دا خەڵكی حەبەشە بوو، كاتی (آمنة) پێغەمبەری خوای (ﷺ) لێبوو لە دوای مردنی باوكی، (أم ایمن) دایەنی پێغەمبەری (ﷺ) دەكرد، هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورە بوو ئینجا ئازادی كرد، و مارەی كرد لە زەیدی كوڕی حارثة، ئەویش پێنج مانگ دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كۆچی دوایی كرد.

## (٢٠) رزگاركردنی مەككە

١١٣١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَبَاحٍ –عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)– قَالَ: وَفَدَتْ وُفُودٌ إِلَى مُعَاوِيَةَ (ﷺ)، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ، فَكَانَ يَصْنَعُ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ الطَّعَامَ، فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ مِمَّا يُكْثِرُ أَنْ يَدْعُونَا إِلَى رَحْلِهِ، فَقُلْتُ: أَلَا أَصْنَعُ طَعَامًا فَأَدْعُوَهُمْ إِلَى رَحْلِي؟ فَأَمَرْتُ بِطَعَامٍ يُصْنَعُ، ثُمَّ لَقِيتُ أَبَا هُرَيْرَةَ مِنَ الْعَشِيِّ فَقُلْتُ: الدَّعْوَةُ عِنْدِي اللَّيْلَةَ، فَقَالَ: سَبَقْتَنِي؟ قُلْتُ: نَعَمْ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَلَا أُعْلِمُكُمْ بِحَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِكُمْ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ؟ ثُمَّ ذَكَرَ فَتْحَ مَكَّةَ، فَقَالَ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، فَبَعَثَ الزُّبَيْرَ عَلَى إِحْدَى الْمُجَنِّبَتَيْنِ، وَبَعَثَ خَالِدًا عَلَى الْمُجَنِّبَةِ الْأُخْرَى، وَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ عَلَى الْحُسَّرِ، فَأَخَذُوا بَطْنَ الْوَادِي، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي كَتِيبَةٍ، قَالَ: فَنَظَرَ فَرَآنِي، فَقَالَ: ((أَبُو هُرَيْرَةَ)). قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: ((لَا يَأْتِينِي إِلَّا أَنْصَارِيٌّ)). زَادَ غَيْرُ شَيْبَانَ: فَقَالَ: ((اهْتِفْ لِي بِالْأَنْصَارِ)). قَالَ: فَأَطَافُوا بِهِ، وَوَبَّشَتْ قُرَيْشٌ أَوْبَاشًا لَهَا وَأَتْبَاعًا، فَقَالُوا: نُقَدِّمُ هَؤُلَاءِ، فَإِنْ كَانَ لَهُمْ شَيْءٌ كُنَّا مَعَهُمْ، وَإِنْ أُصِيبُوا أَعْطَيْنَا الَّذِي سُئِلْنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تَرَوْنَ إِلَى أَوْبَاشِ قُرَيْشٍ وَأَتْبَاعِهِمْ)). ثُمَّ قَالَ بِيَدَيْهِ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى، ثُمَّ قَالَ: ((حَتَّى تُوَافُونِي بِالصَّفَا)). قَالَ: فَانْطَلَقْنَا، فَمَا شَاءَ أَحَدٌ مِنَّا أَنْ يَقْتُلَ أَحَدًا إِلَّا قَتَلَهُ، وَمَا أَحَدٌ مِنْهُمْ يُوَجِّهُ إِلَيْنَا شَيْئًا، قَالَ: فَجَاءَ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُبِيحَتْ خَضْرَاءُ قُرَيْشٍ، لَا قُرَيْشَ بَعْدَ الْيَوْمِ. ثُمَّ قَالَ: ((مَنْ دَخَلَ دَارَ أَبِي سُفْيَانَ فَهُوَ آمِنٌ)). فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَمَّا الرَّجُلُ فَأَدْرَكَتْهُ رَغْبَةٌ فِي قَرْيَتِهِ، وَرَأْفَةٌ بِعَشِيرَتِهِ. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَجَاءَ الْوَحْيُ، وَكَانَ إِذَا جَاءَ الْوَحْيُ لَا يَخْفَى عَلَيْنَا، فَإِذَا جَاءَ فَلَيْسَ أَحَدٌ يَرْفَعُ طَرْفَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى يَنْقَضِيَ الْوَحْيُ، فَلَمَّا انْقَضَى الْوَحْيُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ)). قَالُوا: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((قُلْتُمْ: أَمَّا الرَّجُلُ فَأَدْرَكَتْهُ رَغْبَةٌ فِي قَرْيَتِهِ)). قَالُوا: قَدْ كَانَ ذَاكَ، قَالَ: ((كَلَّا، إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، هَاجَرْتُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَيْكُمْ، وَالْمَحْيَا مَحْيَاكُمْ، وَالْمَمَاتُ مَمَاتُكُمْ)). فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَبْكُونَ وَيَقُولُونَ: وَاللَّهِ مَا قُلْنَا الَّذِي قُلْنَا إِلَّا الضِّنَّ بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُصَدِّقَانِكُمْ وَيَعْذِرَانِكُمْ)). قَالَ: فَأَقْبَلَ النَّاسُ إِلَى دَارِ أَبِي سُفْيَانَ، وَأَغْلَقَ النَّاسُ أَبْوَابَهُمْ، قَالَ: وَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى أَقْبَلَ إِلَى الْحَجَرِ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ، قَالَ: فَأَتَى عَلَى صَنَمٍ إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ كَانُوا يَعْبُدُونَهُ، قَالَ: وَفِي

يَدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَوْسٌ، وَهُوَ آخِذٌ بِسِيَةِ الْقَوْسِ، فَلَمَّا أَتَى عَلَى الصَّنَمِ جَعَلَ يَطْعُنُهُ فِي عَيْنِهِ، وَيَقُولُ: ((جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ)). فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ طَوَافِهِ أَتَى الصَّفَا فَعَلَا عَلَيْهِ حَتَّى نَظَرَ إِلَى الْبَيْتِ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَحْمَدُ اللَّهَ وَيَدْعُو بِمَا شَاءَ أَنْ يَدْعُوَ.

(عبدالله) كوڕی (رباح) –له أبو هريرة وه– دەڵێ: نوێنەر گەلێك لە مانگی ڕەمەزاندا هاتن بۆ لای معاوية (ﷺ)، هەندێكمان خواردنمان بۆ هەندێكی ترمان دروست دەكرد، (أبو هريرە) بە زۆری بانگی دەكردین بۆ ماڵی خۆی، منیش وتم: ئەی بۆ منیش خواردنێك دروست نەكەم و بانگیان بكەم بۆ ماڵی خۆم؟ فەرمانم دا خواردنێك دروست بكرێ، پاشان لە تەنگی ئێوارەدا گەیشتم بە (أبو هريرة) و وتم: میوانداریەكە ئەمشەو لای منە، ئەویش وتی: پێشم كەوتی؟ وتم: بەڵێ، ئینجا بانگهێشتم كردن، (أبو هريرة) (ﷺ) وتی: ئەی خەڵكانی (انصار) ئایا ئاگادارتان نەكەم بە سەربوردێكی خۆتان؟ پاشان باسی ڕزگاركردنی مەككەی كرد و، وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووبە مەككە هات تا گەیشتە ئەوێ، (زبير)ی نارده سەر باڵێ لەباڵەكانی (لای ڕاست یان چەپی) لەشكرەكە، (خالد) یشی نارده سەر باڵەكەی تری، (أبو عبيدة)ی نارده سەر ئەو جەنگاوەرانە كە زرێ پۆشیان نەپۆشیبوو، ناو دۆڵەكەیان گرتە بەر، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لەناو (كتيبة)یەكدا بوو، وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیرێكی كرد و منی دی فەرمووی، (أبو هريرة) وتم: لەخزمەت دام ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: ((جگە لە یارمەتیدەران كەسێ نەیەت بۆلام)) ، ڕاویەكان جگە لە (شيبان) ئەمەیان بۆ زیادكردوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((یارمەتیدەرانم بۆ بانگ بكە)) هەموو كۆبووینەوە لە دەوری، لەولاشەوە قورەیشیش خەڵكانێكی زۆریان كۆكردبووەوە لە هەموو تیرەكان، قورەیشیەكان وتیان: ئەوانە پێش خۆمان دەخەین، ئەگەر سەركەوتنێكیان بەدەست هێنا ئەوا ئێمە لەگەڵیاندایین، ئەگەر شكستیان خوارد(ئەوا ئەوەمان پێ‌دەدرێ كە داوامان كردووە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو تیرە جیاجیایانەی قورەیش و شوێنكەوتوانیان دەبینن؟)) پاشان هەردوو دەستی لەسەر یەك دانا و ئاماژەی پێكردن و، فەرمووی: ((تا لە (صفا) پێم دەگەن)). (أبو هريرة) وتی: ئێمە دەرچووین و هەركەسێ لە ئێمە بیویستایە یەكێ لەوان بكوژێ، دەیكوشت،

لەوانیش كەسێكیان نەبوو شتێك بگرێتە ئێمە، ئینجا (أبو سفیان) هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: قورەیش ڕیشەكەن بوون، لە ئەمڕۆ بەدواوە قورەیش نامێنێ، دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هەركەس بچێتە ماڵی ابوسفیان پارێزراوە)) یارمەتیدەرەكان هەندێكیان بە هەندێكی تریانیان وت: ئەم پیاوە دڵی جولا بۆ شارەكەی خۆی و، سۆزی بزوا بۆ هۆزەكەی خۆی، (أبو هريرة) وتی: لەو كاتەدا وەحی هاتە خوارەوە، هەركاتێكیش وەحی بهاتایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) شاراوە نەبوو لە ئێمە هەر كاتێ وەحی بهاتایە كەسمان چاوی بەرزنەدەكردەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا وەحیەكە كۆتایی دەهات، كاتێ كە وەحی‌یەكە تەواو بوو ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی كۆمەڵی یارمەتیدەران)) وتیان: لەخزمەتداین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). فەرمووی: ((ئێوە وتتان: ئەم پیاوە دڵی بۆ شارەكەی خۆی جولا)) وتیان: بەڵێ وابوو، فەرمووی: ((نەخێر، وانیە من بەندەی خوا و پێغەمبەری ئەوم كۆچم كرد بۆ لای‌خوا و بۆ لای ئێوە، ژیانم لەگەڵ ژیانتاندایە، مردنم لەگەڵ مردنتاندایە))، بەپەلە هاتنە خزمەتی دەگریان و دەیانووت: سوێند بەخوا ئەوەی كەوتوومانە تەنها پەرۆشیمان بووە بۆ ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەرەكەی، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((خوا و پێغەمبەرەكەی بڕواتان پێدەكەن و مەعزەرەتتان قبوڵ دەكەن)). خەڵكی ڕوویان كردە ماڵی (أبو سفیان)، خەڵكی مەككە دەرگاكانی خۆیانیان داخست، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەركەوت و هات و ڕوویكردە بەردەڕەشەكە و باوەشی پێداكرد، لە پاشان سوڕایەوە بە دەوری كەعبەدا، هاتە سەربتێك كە لە تەنیشت كەعبەوە بوو، بێباوەڕەكان دەیانپەرست، پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەوانێكی بەدەستەوە بوو كە لاراییەكەیی گرتبوو، هەر كە گەیشتە سەربتەكە دەیژەندە چاووی‌یەوە و دەیفەرموو: ((حەق هات و ناحەقی ڕاماڵی)).

كاتێ لە (طواف)ی كەعبە بوویەوە، هات بۆ (صفا) و سەركەوتە سەری تاكەعبەی لێوە دەركەوت، ئینجا هەردوو دەستی بەرز كردەوە و سوپاسی خوای كرد و دەپاڕایەوە بەو شێوەیە كە خوای گەورە پێی خۆش بێ.

## (٢٢) فڕێدانی بتەکانی دەوری کەعبە

١١٣٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَكَّةَ، وَحَوْلَ الْكَعْبَةِ ثَلَاثُ مِائَةٍ وَسِتُّونَ نُصُبًا، فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ كَانَ بِيَدِهِ، وَيَقُولُ: ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾ [الإسراء:٨١] ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ [سبأ: ٤٩] زَادَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: يَوْمَ الْفَتْحِ. [البخاري/ المظالم/ ٢٣٤٦]

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو مەککە، بە دەوری کەعبەدا سێسەد و شەست بت هەبوون، بەدارێك كەبە دەستیەوە بوو کەوتە لێدانیان و ئەم ئایەتەی سەرەوەی دەفەرموو کە ئەمە ماناکەیەتی: ﴿حەق هات و ناحەقی تیاچوو، لە ڕاستیدا نا حەق تیا چووە﴾. ﴿هەق هات و ناهەقی جارێکی تر سەر هەڵناداتەوە و دوبارە نابێتەوە﴾ [سبأ: ٤٩] کوڕەکەی (ابو عمر) دەڵێ: لە ڕۆژی فەتحدا ئەمەی فەرمووە.

## (٢٣) هیچ قوڕەیشیەك لە دوای فەتح بەدیلی ناکوژرێت

١١٣٣ـ عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُطِيعٍ، عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: ((لَا يُقْتَلُ قُرَشِيٌّ صَبْرًا بَعْدَ هَذَا الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)).

(عبدالله) کوڕی (مطیع) لە باوکیەوە (ﷺ) دەڵێ: لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست دەیفەرموو: ((لە ئەمڕۆ بەدواوە هەتا ڕۆژی قیامەت هیچ قوڕەیشیەك بە دیلی ناکوژرێت)).

## (٢٤) پەیمان دانی دوای فەتح

١١٣٤ـ عَنْ مُجَاشِعُ بْنُ مَسْعُودٍ السُّلَمِيُّ (ﷺ) قَالَ: جِئْتُ بِأَخِي أَبِي مَعْبَدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ الْفَتْحِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَايِعْهُ عَلَى الْهِجْرَةِ. قَالَ: ((قَدْ مَضَتِ الْهِجْرَةُ بِأَهْلِهَا)). قُلْتُ: فَبِأَيِّ شَيْءٍ تُبَايِعُهُ؟ قَالَ: ((عَلَى الْإِسْلَامِ وَالْجِهَادِ وَالْخَيْرِ)). قَالَ أَبُو عُثْمَانَ، يعني النهدي: فَلَقِيتُ أَبَا مَعْبَدٍ، فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ مُجَاشِعٍ، فَقَالَ: صَدَقَ. [البخاري/ المغازي/ ٤٠٤٥]

(مجاشع) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: لە دوای فەتح (ابو معبد)ی برامم هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، پەیمانی لێوەربگرە لەسەر کۆچکردن فەرمووی: ((سەردەمی کۆچ تێپەڕی و کاتی نەما، وە خەڵکەکەشی تێپەڕین)) وتم: ئەی لەسەر چی پەیمانی لێوەردەگریت؟

فەرمووی: ((لەسەر ئیسلامەتی و تێکۆشان و چاکە کردن)) أبو عثمانی النهدي وتی: گەیشتم بە (ابو معبد)، وتەکەی (مجاشع)م بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: ڕاست دەکات.

## (٢٥) لە دوای (فەتح)ەوە کۆچ کردن نیە بەڵکو جیهاد و لێبڕانە بۆی

١١٣٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْهِجْرَةِ فَقَالَ: ((لَا هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا)).

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی کۆچ کردنەوە، ئەویش فەرمووی: ((لە دوای فەتحەوە کۆچکردن نیە، بەڵکو جیهاد و لێبڕان هەیە، هەر کات داواتان لێکرا بچن بۆ جیهاد بڕۆن)).

## (٢٦) فەرماندان بە چاکە کردن بۆ کەسێ کۆچی لەلاگران بێت

١١٣٦ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْهِجْرَةِ؟ فَقَالَ: ((وَيْحَكَ، إِنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ لَشَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ)). قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ((فَهَلْ تُؤْتِي صَدَقَتَهَا)). قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ((فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ الْبِحَارِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا)). [البخاري/ الزكاة / ١٣٨٤]

(أبو سعيد الخدري) (ﷺ) دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکی لەبارەی کۆچکردنەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد،؟ فەرمووی: ((کۆست کەوێ، ئەرکی کۆچکردن سەختە، ئایا حوشترت هەیە؟)) وتی: بەڵی، فەرمووی: ((ئایا زەکاتەکەی دەدەیت؟)) وتی: بەڵێ فەرمووی: ((کاری چاکە بکە لەودیو دەریاکانیشەوە بێ –واتە لەهەر کوێ بویت– خوای گەورە هیچ لە خێری کردارەکانت کەم ناکاتەوە)).

## (٢٧) ژیان لە دەوارنشینیدا پاش کۆچکردن

١١٣٧ـ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (ﷺ): أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى الْحَجَّاجِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ الْأَكْوَعِ ارْتَدَدْتَ عَلَى عَقِبَيْكَ، تَعَرَّبْتَ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَذِنَ لِي فِي الْبَدْوِ. [البخاري/ الفتن/ ٦٦٧٦]

(سلمة) کوری (الأکوع) (ﷺ) دەڵێ: چوەتە لای (حجاج)، و (حجاج) وتویەتی: ئەی کوڕی (اکوع) گەڕاویتەوە دۆخی جارانت، بویتەوە بە دەشتەکی؟ وتی: نەخێر، بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی پێداوم کە لە بیاباندا بژیم.

## (٢٨) جەنگی حُنَیْن

١١٣٨ـ عَنْ كَثِيرُ بْنُ عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: قَالَ عَبَّاسٌ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ حُنَيْنٍ، فَلَزِمْتُ أَنَا وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمْ نُفَارِقْهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ بَيْضَاءَ، أَهْدَاهَا لَهُ فَرْوَةُ بْنُ نُفَاثَةَ الْجُذَامِيُّ، فَلَمَّا الْتَقَى الْمُسْلِمُونَ وَالْكُفَّارُ وَلَّى الْمُسْلِمُونَ مُدْبِرِينَ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَرْكُضُ بَغْلَتَهُ قِبَلَ الْكُفَّارِ، قَالَ عَبَّاسٌ: وَأَنَا آخِذٌ بِلِجَامِ بَغْلَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَكُفُّهَا إِرَادَةَ أَنْ لَا تُسْرِعَ، وَأَبُو سُفْيَانَ آخِذٌ بِرِكَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَيْ عَبَّاسُ نَادِ أَصْحَابَ السَّمُرَةِ )). فَقَالَ عَبَّاسٌ، وَكَانَ رَجُلًا صَيِّتًا: فَقُلْتُ بِأَعْلَى صَوْتِي: أَيْنَ أَصْحَابُ السَّمُرَةِ؟ قَالَ: فَوَاللَّهِ لَكَأَنَّ عَطْفَتَهُمْ حِينَ سَمِعُوا صَوْتِي عَطْفَةُ الْبَقَرِ عَلَى أَوْلَادِهَا، فَقَالُوا: يَا لَبَّيْكَ، يَا لَبَّيْكَ. قَالَ: فَاقْتَتَلُوا وَالْكُفَّارَ، وَالدَّعْوَةُ فِي الْأَنْصَارِ يَقُولُونَ: يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، قَالَ: ثُمَّ قُصِرَتِ الدَّعْوَةُ عَلَى بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، فَقَالُوا: يَا بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ يَا بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ عَلَى بَغْلَتِهِ كَالْمُتَطَاوِلِ عَلَيْهَا إِلَى قِتَالِهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَذَا حِينَ حَمِيَ الْوَطِيسُ)). قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَصَيَاتٍ فَرَمَى بِهِنَّ وُجُوهَ الْكُفَّارِ، ثُمَّ قَالَ: ((انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ)). قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ فَإِذَا الْقِتَالُ عَلَى هَيْئَتِهِ فِيمَا أَرَى، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَمَاهُمْ بِحَصَيَاتِهِ، فَمَا زِلْتُ أَرَى حَدَّهُمْ كَلِيلًا، وَأَمْرَهُمْ مُدْبِرًا.

(كثير) کوڕی (عباس) کوڕی (عبدالمطلب) دەڵێ: (عباس)وتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا ئامادەی جەنگی (حنین) بووم، من و (أبو سفیانی) کوڕی (حارث)ی کوڕی (عبدالمطلب) هاوڕای پێغەبەری خوا (ﷺ) بووین و لێی جیانەبوینەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سواری ئێسترە سپیەکەی خۆی بوو بوو، کە (فروة) کوڕی (نفاثة الجذامي) بەدیاری پێی‌دابوو، هەر کە موسڵمانەکان و کافرەکان بەیەك گەیشتن و (بەیەکدا هاتن) موسڵمانەکان پشتیان هەڵکرد و هەڵاتن ئا لەوێدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێسترەکەی غاردەدا ڕوو بە کافران، (عباس) وتی: منیش جڵەوی ئێسترەکەی پێغەمبەری خوام (ﷺ) گرتبوو، هەر هێواشم دەکردەوە، نەمدەویست بەپەلە بڕوات، (ابوسفیان)یش ئاوزەنگی ئێسترەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) گرتبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:

((ئادەی (عباس) هاوەڵانی (سَمُرة) بانگ بكە))[1]. عباس كە پیاوێكی دەنگ بەرز بوو دەڵێ: بەهەموو دەنگمەوە وتم: كوان هاوڵانی سَمُرة؟ وتی: سوێند بەخوا هەر كە دەنگەكەیان بیستم بایاندایەوە هەر وەك چۆن مانگا بادەداتەوە بەلای بیچووەكانیدا. بەپەلە وتیان: گوێڕایەڵتین، گوێڕایەڵتین، ئەوان و كافرەكان كەوتنە شەڕ كردن بانگەوازكەرانی یارمەتیدەران دەیانووت: ئەی كۆمەڵی یارمەتیدەران، ئەی كۆمەڵی یارمەتیدەران، پاشان بانگەوازەكە چڕبوویەوە لەسەر نەوەی (حارث) كوڕی (خزرج) وتیان: ئەی نەوەی بني (الحارث) كوڕی الخزرج، ئەی نەوەی (الحارپ) كوڕی (الخزرج) پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە بەسەر ئێسترەكەیەوە بوو سەیری كرد وەك هەنگاو بنێ بۆ كوشتاریان، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمە ئەو كاتەیە كە ئاگری شەڕ كڵپەی سەندووە)). پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند وردەبەردێكی هەڵگرت و بەرەو ڕوی بێباوەڕان خستی، پاشان فەرمووی: ((سوێند بەپەروەردگاری (محمد) ئەوان شكان)). عباس وتی: ڕۆیشتم سەیر بكەم بینیم شەڕەكە هەر لەسەر شێوەی خۆی ماوە، سوێند بەخوا هەر ئەوەندە بوو تا پێغەمبەر (ﷺ) وردە بەردەكانی تێگرتن، ئیتر بەردەوام دەمبینی هێز و تیژیان كول بوە و بارودۆخیان بۆ دواوە دەچێ.

١١٣٩ـ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى الْبَرَاءِ فَقَالَ: أَكُنْتُمْ وَلَّيْتُمْ يَوْمَ حُنَيْنٍ يَا أَبَا عُمَارَةَ؟ فَقَالَ: أَشْهَدُ عَلَى نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) مَا وَلَّى، وَلَكِنَّهُ انْطَلَقَ أَخِفَّاءُ مِنَ النَّاسِ وَحُسَّرٌ، إِلَى هَذَا الْحَيِّ مِنْ هَوَازِنَ، وَهُمْ قَوْمٌ رُمَاةٌ، فَرَمَوْهُمْ بِرِشْقٍ مِنْ نَبْلٍ كَأَنَّهَا رِجْلٌ مِنْ جَرَادٍ، فَانْكَشَفُوا، فَأَقْبَلَ الْقَوْمُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ (ﷺ) يَقُودُ بِهِ بَغْلَتَهُ، فَنَزَلَ وَدَعَا وَاسْتَنْصَرَ وَهُوَ يَقُولُ: ((أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ. اللَّهُمَّ أَنْزِلْ نَصْرَكَ)). قَالَ الْبَرَاءُ: كُنَّا وَاللَّهِ إِذَا احْمَرَّ الْبَأْسُ نَتَّقِي بِهِ، وَإِنَّ الشُّجَاعَ مِنَّا لَلَّذِي يُحَاذِي بِهِ، يَعْنِي النَّبِيَّ (ﷺ).[البخاري/ المغازي/ ٤٠٦١]

---

[1] السَمُرة: ئەو درەختەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) لە حودەیبیە لە ژێریدا بیعة الرضوانی لە هاوەڵانی وەرگرت.

(ابو اسحاق) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای (براء) وتی: ئەی (ابو عُمارة) ئایا ئێوە بوون لە ڕۆژی (حنین)دا پشتتان هەڵکرد؟ ئەویش وتی: شاهیدی دەدەم لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەو پشتی هەڵنەکرد، بەڵکو کەسانێ لە خەڵکی کە کوڵ سوك بوون و زرێپۆشیان نەبوو ڕۆیشتن بۆ ئەو تیرەیەی (هوازن)، ئەوانیش خەڵکانێکی تیرئەندازبوون، کە بە (لێشاو) بە باقە تیریان تێدەگرتن، هەر وەك قاچە کوللە، تا دوژمن زاڵ بوو بەسەریاندا، خەڵکەکە ڕوویان کردە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە (ابو سفیان) کوڕی (حارث) (ﷺ) ئێسترەکەیی ڕادەکێشا، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دابەزی و پاڕایەوە و داوای سەرکەوتنی دەکرد و دەیفەرموو: ((من پێغەمبەرم، درۆنیە، من ڕۆڵەی عبدالمطلبم، خوایە سەرکەوتنی خۆت دابەزێنە)) (براء) وتی: سوێند بە خوا هەر کاتێ کە شەڕ وترس سەخت دەبوو ئێمە خۆمان دەدایە پەنای ئەوو ئازایشمان ئەو کەسە بوو شان بەشانی پێغەمبەر (ﷺ) بێت.

١١٤٠ـ عَنْ سَلَمَةَ بن الأكوع (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حُنَيْنًا، فَلَمَّا وَاجَهْنَا الْعَدُوَّ تَقَدَّمْتُ فَأَعْلُو ثَنِيَّةً، فَاسْتَقْبَلَنِي رَجُلٌ مِنَ الْعَدُوِّ فَأَرْمِيهِ بِسَهْمٍ، فَتَوَارَى عَنِّي، فَمَا دَرَيْتُ مَا صَنَعَ، وَنَظَرْتُ إِلَى الْقَوْمِ فَإِذَا هُمْ قَدْ طَلَعُوا مِنْ ثَنِيَّةٍ أُخْرَى، فَالْتَقَوْا هُمْ وَصَحَابَةُ النَّبِيِّ (ﷺ) فَوَلَّى صَحَابَةُ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَأَرْجِعُ مُنْهَزِمًا وَعَلَيَّ بُرْدَتَانِ، مُتَّزِرًا بِإِحْدَاهُمَا مُرْتَدِيًا بِالْأُخْرَى، فَاسْتَطْلَقَ إِزَارِي، فَجَمَعْتُهُمَا جَمِيعًا، وَمَرَرْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مُنْهَزِمًا وَهُوَ عَلَى بَغْلَتِهِ الشَّهْبَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَقَدْ رَأَى ابْنُ الْأَكْوَعِ فَزَعًا)). فَلَمَّا غَشُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَزَلَ عَنِ الْبَغْلَةِ، ثُمَّ قَبَضَ قَبْضَةً مِنْ تُرَابٍ مِنَ الْأَرْضِ، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ بِهِ وُجُوهَهُمْ فَقَالَ: ((شَاهَتِ الْوُجُوهُ)). فَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْهُمْ إِنْسَانًا إِلَّا مَلَأَ عَيْنَيْهِ تُرَابًا بِتِلْكَ الْقَبْضَةِ، فَوَلَّوْا مُدْبِرِينَ، فَهَزَمَهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، وَقَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) غَنَائِمَهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ.

(سلمة) کوڕی (الاکوع) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) جەنگی (حنین)مان کرد، کاتێ ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە، پێشکەوتم تا سەربکەومە سەر کەل، پیاوێ لە دوژمن هات بە ڕوومدا و تیرێکم تێگرت، لێم ون بوو، نەمزانی چی بەسەر هات، ئینجا سەیرێکی بێباوەڕانم کرد، بینیم وا لەدەم کەلێکی ترەوە دەرکەوتن، ئەوان و هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتن

بەیەك، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕایان كرد، منیش بە شكستی گەڕامەوە و دوو پۆشاكم لەبەردابوو، یەكێكیانم كردبوە پەشتەماڵ و ئەوی تریانم كردبوە بەرم، ئەوەی كە پەشتەماڵەكەم بوو كرایەوە و هەردووكیانم كۆكردەوە (كردنم بەیەك) بە شكستی و بە ڕاكردن دام بەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا، ئەویش لەسەر ئێسترە بۆرەكەی بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لە ڕاستیا كوڕەكەی (الاكوع) ترس و بیمی بینیوە)). كاتێ (بێباوەڕان) نزیك كەوتنەوە و دەورەی پێغەمبەریان دا ئەویش لە ئێسترەكەی دابەزی و، مشتێ خۆڵی لە زەوی هەڵگرت و كردی بە ڕوویاندا و فەرمووی: ((ئەم ڕوخسارانە شپرزوناشیرینن)) یەك كەسیان نەما چاوی پڕنەبووبێت لە خۆڵ، هەڵهاتن و ڕایان كرد، خوا (ﷻ) بەوە تێكی شكاندن، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دەستكەوتەكانی دابەش كرد لە نێوان موسڵماناندا.

## (٢٩) جەنگی طائف

١١٤١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ) قَالَ: حَاصَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَهْلَ الطَّائِفِ، فَلَمْ يَنَلْ مِنْهُمْ شَيْئًا، فَقَالَ: ((إِنَّا قَافِلُونَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ [تعالى])). قَالَ أَصْحَابُهُ: نَرْجِعُ وَلَمْ نَفْتَتِحْهُ؟ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ)). فَغَدَوْا عَلَيْهِ، فَأَصَابَهُمْ جِرَاحٌ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا)). قَالَ: فَأَعْجَبَهُمْ ذَلِكَ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ).[البخاري/ المغازي/ ٤٠٧٠]

(عبدالله) كوڕی (عمرو) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەمارۆی خەڵكی (طائف)ی دا، هیچی پێنەكردن، فەرمووی: ((ئێمە دەگەڕێینەوە بەویستی خوای (بالاّ دەست))). هاوەڵانی عەرزیان كرد: دەگەڕێینەوەو ڕزگاریشمان نەكرد؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێیان: ((سبەینێ بچن بۆ جەنگ)). بۆ سبەینێ چوونەوە سەری توشی برینداریەكی زۆر هاتن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێیان: ((ئێمە سبەینێ دەگەڕێینەوە)) ئەمجارە ئەمەیان پێخۆش بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێكەنی.

## (٣٠) ژمارەی جەنگەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

١١٤٢ـ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي بِالنَّاسِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ اسْتَسْقَى، قَالَ: فَلَقِيتُ يَوْمَئِذٍ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ، وَقَالَ: لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ غَيْرُ رَجُلٍ، أَوْ بَيْنِي وَبَيْنَهُ رَجُلٌ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: كَمْ غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَ:

تِسْعَ عَشْرَةَ [غزوة]. فَقُلْتُ: كَمْ غَزَوْتَ أَنْتَ مَعَهُ؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ غَزْوَةً، قَالَ: فَقُلْتُ: فَمَا أَوَّلُ غَزْوَةٍ غَزَاهَا؟ قَالَ: ذَاتُ الْعُسَيْرِ أَوِ الْعُشَيْرِ. [بخاري/ الاستسقاء/ ٩٧٦. المغازي/ ٣٧٣٣]

(ابو اسحاق) دەڵێ: (عبدالله) کوڕی (یزید) ڕۆیشت نوێژەبارانە بکات بۆ خەڵکی، دوو ڕکات نوێژی کرد و لەپاشان دۆعای باران بارینی کرد، دەڵێ: ئەو ڕۆژە گەیشتم بە (زید)ی کوڕی (ارقم)، جگە لە پیاوێ کەسی تر نەبوو لە نێوانماندا، یان نێوان من و ئەو پیاوێك بوو، پێم وت: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند جەنگی کردووە؟ وتی: نۆزدە جەنگ، منیش وتم: ئەی تۆ چەند جەنگت کردوە لە خزمەتیدا؟ وتی: حەڤدە جەنگ، ئەمجا وتم: یەکەم جەنگ کە کردی کام جەنگ بوو؟ وتی: ذات العُسیر یان (العُشَیر).

١١٤٣مكرّر - عَنْ بُرَيْدَةَ (ﷺ) قَالَ: غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تِسْعَ عَشْرَةَ غَزْوَةً، قَاتَلَ فِي ثَمَانٍ مِنْهُنَّ. [البخاري/ المغازي/ ٤٢٠٣]

(بریدة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ نۆزدە جەنگ چووە، لە هەشتیاندا کەوتوەتە جەنگەوە.

# (٣٦) بەشی فەرمانڕەوایی (كتاب الإمارة)

## (١) دانانی جێنشین و دانەنانی

١١٤٤ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ (ﷺ) فَقَالَتْ: أَعَلِمْتَ أَنَّ أَبَاكَ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ؟ قَالَ: قُلْتُ: مَا كَانَ لِيَفْعَلَ، قَالَتْ: إِنَّهُ فَاعِلٌ، قَالَ: فَحَلَفْتُ أَنِّي أُكَلِّمُهُ فِي ذَلِكَ، فَسَكَتُّ حَتَّى غَدَوْتُ وَلَمْ أُكَلِّمْهُ، قَالَ: فَكُنْتُ كَأَنَّمَا أَحْمِلُ بِيَمِينِي جَبَلًا، حَتَّى رَجَعْتُ فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَسَأَلَنِي عَنْ حَالِ النَّاسِ وَأَنَا أُخْبِرُهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ لَهُ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ مَقَالَةً، فَآلَيْتُ أَنْ أَقُولَهَا لَكَ، زَعَمُوا أَنَّكَ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ، وَإِنَّهُ لَوْ كَانَ لَكَ رَاعِي إِبِلٍ أَوْ رَاعِي غَنَمٍ، ثُمَّ جَاءَكَ وَتَرَكَهَا رَأَيْتَ أَنْ قَدْ ضَيَّعَ، فَرِعَايَةُ النَّاسِ أَشَدُّ. قَالَ: فَوَافَقَهُ قَوْلِي، فَوَضَعَ رَأْسَهُ سَاعَةً ثُمَّ رَفَعَهُ إِلَيَّ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَحْفَظُ دِينَهُ، وَإِنِّي لَئِنْ لَا أَسْتَخْلِفْ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لَمْ يَسْتَخْلِفْ، وَإِنْ أَسْتَخْلِفْ فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ (ﷺ) قَد اسْتَخْلَفَ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ ذَكَرَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَعْدِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَحَدًا، وَأَنَّهُ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ. [بخاري/ الأحكام/ ٦٧٩٢]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: سەردانی (حفصة)م (ﷺ) كرد، وتی: ئایا زانیوتە كە باوكت كەسی دانەناوە بە جێنشینی خۆی؟ وتم: لەو كەسانە نەبوو شتی وا بكات، وتی: كردویەتی، سوێندم خوارد دەبێ لەوبارەیەوە بیدوێنم، بێدەنگ بووم و تا بەیانی هیچم لەگەڵدا نەوت، لە حاڵێكدا بووم هەر وەك شاخێكم بە شانی ڕاستم هەڵگرتبێ، تا گەڕامەوە و چوومە لای، هەواڵی خەڵكی لێپرسیم و منیش ئاگادارم دەكرد، پاشان پێم وت: لە خەڵكیم بیست كە قسەیەكیان دەكرد، سوێندم خوارد كە هەر دەبێ پێت بڵێم، دەڵێن گوایە تۆ كەست دانەناوە بەجێنشینی خۆت، ئەم كارەت وەك ئەوە وایە شوانێكی حوشتر یان شوانێكی مەڕت هەبێ و، پاشان بەجێیان بهێڵێت و بێتەوە بۆ لات، دەبینی كە ماڵیاتەكەی زایە كردوە، خۆ چاودێری كردنی خەڵكی لەوە قورستر و سەخترە، ابن عمر دەڵێ: باوكم ڕازی بوو بە قسەكەم، ماوەیەك سەری دانەواندو پاشان بەرزی كردەوە و ڕووی تێكردم و وتی: خوای (ﷻ) ئاینی خۆی دەپارێزێ، جا ئەگەر منیش جێنشین دانەنێم خۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)یش جێنشینی دانەناوە،

# (٣٨) بەشی قوربانیی

## ( ١ ) لە دەرۆژەی ذي الحجة دا ئەوەی قوربانی دەكات نابێ موو و نینۆكی بكات

١١٩٧. عَنْ أُمَّ سَلَمَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ كَانَ لَهُ ذِبْحٌ يَذْبَحُهُ: فَإِذَا أُهِلَّ هِلَالُ ذِي الْحِجَّةِ، فَلَا يَأْخُذَنَّ مِنْ شَعْرِهِ وَلَا مِنْ أَظْفَارِهِ شَيْئًا، حَتَّى يُضَحِّيَ)).

(أم سلمة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو كەسەی كە حەیوانێكی هەیە و دەیكات بە قوربانیی ئەگەر مانگی ذی الحجة بینرا، با ئیتر هیچ لە مووی‌و لە نینۆكی لانەبات هەتا قوربانیەكە دەكات)).

## ( ٢ ) كاتی قوربانیی سەربڕین

١١٩٨ـ عَنْ جُنْدَبُ بْنُ سُفْيَانَ (ﷺ) قَالَ: شَهِدْتُ الْأَضْحَى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَلَمْ يَعْدُ أَنْ صَلَّى وَفَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ سَلَّمَ، فَإِذَا هُوَ يَرَى لَحْمَ أَضَاحِيَّ قَدْ ذُبِحَتْ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلَاتِهِ، فَقَالَ: ((مَنْ كَانَ ذَبَحَ أُضْحِيَّتَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ -أَوْ نُصَلِّيَ- فَلْيَذْبَحْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ كَانَ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللَّهِ)). [البخاري/ الذبائح والصيد/ ٤١٨١]

(جُندب) كوڕی (سفیان) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان بووم، زۆری نەخایاند نوێژی كرد و سەلامی دایەوە، یەكسەر گۆشتی قوربانیی بینی كە سەربڕابوو پێش ئەوەی كە لە نوێژەكەی ببێتەوە، ئینجا فەرمووی: ((ئەو كەسەی قوربانیی سەربڕیوە لە پێش ئەوەی نوێژ بكات -یان نوێژ بكەین- با یەكێكی تر لە جێگاكەیدا سەربڕێ، ئەو كەسەی كە قوربانیەكەی‌سەرنەبڕیوە با بەناوی خواوە سەری ببڕێت)).

## ( ٣ ) قوربانیی سەبڕین لە پێش نوێژی جەژندا دروست نیە

١١٩٩ـ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا نُصَلِّي، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَنْحَرُ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لِأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ)). وَكَانَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ

نيَار (ﷺ) قَدْ ذَبَحَ، فَقَالَ: عِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ. فَقَالَ: ((اذْبَحْهَا، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ)). [البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٤٠]

(البراء) كوڕی (عازب) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((یەکەمین کارێ کە لەم ڕۆژەماندا دەستی پێدەکەین ئەوەیە کە نوێژ بکەین، پاشان بگەڕێینەوە و قوربانیی سەربڕین، هەر کەسێ بەمجۆرەی کردبێ ئەوا لەسەر سوننەتی ئێمەیە، هەر کەسێکیش سەری بڕی بێ (پێش نوێژی جەژن) ئەوە گۆشتێکە و پێشکەشی ماڵ و منداڵی کردوە، ئەوە بە هیچ جۆرێ قوربانیی نییە)) (ابو بُردة) کوڕی (نیار) (ﷺ) پێشتر سەری بڕی بوو، پاشان وتی: گیسکێکم هەیە باشترە لەو حەیوانەی کە دوو ساڵی تەواو کردوە، فەرمووی: ((سەری ببڕە، بەڵام لە دوای تۆ ئیتر بۆ کەسی تر دروست نییە)).

## ( ٤ ) چ تەمەنێ دروستە بکرێتە قوربانیی

١٢٠٠ـ عَنْ جَابِرِ بن عبدالله(ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَذْبَحُوا إِلَّا مُسِنَّةً، إِلَّا أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ)).

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سەرمەبڕن جگە لە دوو ساڵە ، مەگەر دەستتان نەکەوێ ئەو کاتە دروستە کاوڕێك سەربڕن)).

## ( ٥ ) قوربانیی کردن بە گیسك

١٢٠١ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِينَا ضَحَايَا، فَأَصَابَنِي جَذَعٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ أَصَابَنِي جَذَعٌ؟ فَقَالَ: ((ضَحِّ بِهِ)). [البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٢٧]

(عقبة) کوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڕێ حەیوانی بەسەردا دابەشکرین کە بیکەینە قوربانی، من گیسکێکم بەرکەوت، عەرزم کرد، ئەی پێغەمبەری خوا، من گیسکێکم بۆ ماوەتەوە؟ فەرمووی: ((بیکە بە قوربانیی)).

## ( ٦ ) چاکترین قوربانیی

١٢٠٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، قَالَ: وَرَأَيْتُهُ يَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ، وَرَأَيْتُهُ وَاضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا، قَالَ: وَسَمَّى وَكَبَّرَ. [البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٣٨]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو بەرانی بۆری شاخداری کردە قوربانی، بینیم کە بەدەستی خۆی سەریان دەبڕێ، بینیم قاچی خستبووە لاملی هەردووکیان، ناوی خوای هێنا و الله اکبری کرد.

## ( ٧ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) لەبری خۆی و بنەماڵە و ئوممەتەکەی قوربانی سەربڕی

١٢٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ، يَطَأُ فِي سَوَادٍ وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ، فَأُتِيَ بِهِ لِيُضَحِّيَ بِهِ، فَقَالَ لَهَا: ((يَا عَائِشَةُ هَلُمِّي الْمُدْيَةَ)). ثُمَّ قَالَ: ((اشْحَذِيهَا بِحَجَرٍ)). فَفَعَلَتْ، ثُمَّ أَخَذَهَا وَأَخَذَ الْكَبْشَ فَأَضْجَعَهُ ثُمَّ ذَبَحَهُ، ثُمَّ قَالَ: ((بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ)). ثُمَّ ضَحَّى بِهِ.

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دابە بەرانێکی شاخدار چوارپەلی ڕەش بوو، ژێر سکی ڕەش بوو دەوری چاوەکانی ڕەش بوو بۆی هێنرا تا بیکاتە قوربانی، بە عائشةی فەرموو: ((ئەی عائشة چەقۆکە بهێنە)) پاشان فەرمووی: ((بەبەردێك تیژی بکە)) تیژی کرد ئینجا چەقۆکەی گرت بەدەستیەوە و بەرانەکەشی گرت و پاڵی خست و سەری بڕی و فەرمووی: ((بسم الله، خوایە قبوڵی بکە لە محمد و لە نەوەی محمد و ئوممەتی محمد)). پاشان کردیە قوربانی.

## ( ٨ ) ڕێگری لە خواردنی گۆشتی قوربانی لەدوای سێ شەو

١٢٠٤- عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ: أَنَّهُ شَهِدَ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ)، قَالَ: ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ)، قَالَ: فَصَلَّى لَنَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ نَهَاكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا لُحُومَ نُسُكِكُمْ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، فَلَا تَأْكُلُوا. [البخاري/ الاضاحي/ ٥٢٥١]

(ابو عبيد) کارگوزاری (ابن ازهَرَ) دەڵێ: لەگەڵ (عمر) کوڕی (خطاب) (ﷺ) ئامادەی نوێژی جەژن بووە، دواتر لەگەڵ (علي) کوڕی (أبي طالبیش) (ﷺ) نوێژم کردووە، پێش وتار نوێژی بۆ کردین، ئینجا وتاری بۆ خەڵکی داو وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لێکردوون کە لە دوای سێ شەو گۆشتی قوربانیەکەتان بخۆن، کەواتە ئێوەش مەیخۆن.

## ( ٩ ) مۆڵەتدان بە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی دوای سێشەو

١٢٠٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ وَاقِدٍ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلَاثٍ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرَةَ، فَقَالَتْ: صَدَقَ، سَمِعْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) تَقُولُ: دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ حَضْرَةَ الْأَضْحَى، زَمَنَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((ادَّخِرُوا ثَلَاثًا ثُمَّ تَصَدَّقُوا بِمَا بَقِيَ)). فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ النَّاسَ يَتَّخِذُونَ الْأَسْقِيَةَ مِنْ ضَحَايَاهُمْ، وَيَجْمُلُونَ مِنْهَا الْوَدَكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَمَا ذَاكَ)). قَالُوا: نَهَيْتَ أَنْ تُؤْكَلَ لُحُومُ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلَاثٍ، فَقَالَ: ((إِنَّمَا نَهَيْتُكُمْ مِنْ أَجْلِ الدَّافَّةِ الَّتِي دَفَّتْ، فَكُلُوا وَادَّخِرُوا وَتَصَدَّقُوا)). [البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٥٠]

(عبدالله) کوڕی (ابو بکر) لە (عبدالله) کوڕی (واقد)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە خواردنی گۆشتی قوربانی لە سێ ڕۆژ بەدواوە، (عبدالله) کوڕی (ابو بکر) دەڵێ: ئەمەم بۆ (عَمرَة) باسکرد، ئەویش وتی: ڕاست دەکات، لە عائشەم بیستوە (ﷺ) دەیوت: خەڵکانێ لە دانیشتوانی بیابان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە ڕۆژی جەژنی قورباندا هاتنە مەدینە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بەشی سێ ڕۆژ هەڵبگرن پاشان ئەوەی کە مایەوە بیکەنە خێر)). لە دوای ئەوە بە ماوەیەك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی هیزە دروست دەکەن لە قوربانیەکانیان و بەز و پیوی تێدا هەڵدەگرن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((جا ئەوە چی تیایە)). وتیان: ڕێگریت کرد لە گۆشتی قوربانیەکان لە دوای سێ شەوە بخورێ، فەرمووی: ((من لەبەر ئەوە ڕێگریم لێکردن لەبەر ئەو میوانانەی دەرەوە کە هاتبوونە ئێرە، ئێستە، بیخۆن و هەڵیبگرن و خێری لێبکەن)).

## ( ١٠ ) نۆسکەی حوشتر و سەربڕین لە دە ڕۆژی یەکەمی ڕەجەبدا

١٢٠٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا فَرَعَ وَلَا عَتِيرَةَ)). زَادَ ابْنُ رَافِعٍ فِي رِوَايَتِهِ: وَالْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ كَانَ يُنْتَجُ لَهُمْ، فَيَذْبَحُونَهُ. [البخاري/ العقيقة/ ٥٢٥٦]

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((نۆسـكە سـەرمەبڕن و لـە دەڕۆژی یەكـەمی ڕەجەبیشـدا سـەرمەبڕن)). ابـن رافـع لـە ڕیوایەتێكدا ئەمەی زیاد كردوە: (فرع): نۆسكەی حوشترە كە سەریان بڕیوە[١].

## ( ١١ ) سەربڕین بۆ جگە لە خوای گەورە

١٢٠٧ـ عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ عَامِرُ بْنُ وَاثِلَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُسِرُّ إِلَيْكَ؟ [قَالَ]: فَغَضِبَ وَقَالَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُسِرُّ إِلَيَّ شَيْئًا يَكْتُمُهُ النَّاسَ، غَيْرَ أَنَّهُ قَدْ حَدَّثَنِي بِكَلِمَاتٍ أَرْبَعٍ. قَالَ: فَقَالَ: مَا هُنَّ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قَالَ: ((لَعَنَ اللَّهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَهُ، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ آوَى مُحْدِثًا، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ غَيَّرَ مَنَارَ الْأَرْضِ)).

(أبو الطفيل) (عامر) كوڕی (واثلة) دەڵێ: لای (علي) كوڕی (أبو طالب) (ﷺ) بووم، پیاوێك هاتە لای و وتـی: پێغەمبـەر (ﷺ) چ نهێنییـەكی بـە تـۆ وتـووە؟ (علي) تووڕە بوو وتـی: پێغەمبـەر (ﷺ) شتێكی نهێنی بـە مـن نـەوتووە كـە لـە خـەڵكی بشارێتەوە، بـەڵام چـوار وشـەی فـەرمووە پێـم، پیاوەكـە وتـی: ئـەی پێشەوای باوەڕداران؟ ئەو چوار وشە كامەن؟ (علي)وتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوا نەفرینی كردووە لەو كەسەی كە جنێو بە باوك و دایكی خۆی دەدات، خـوا نـەفرینی كـردووە لـەو كەسـەی شتێ سەردەبڕێ بۆ غـەیری خـوا، خـوا نـەفرینی كـردووە لـەو كەسـەی پـەنای (بيدعة)چـی دەدات، هـەروەها خوا نەفرینی كردووە لەو كەسەی كە سنووری زەوییەكەی خۆی دەگۆڕێ)).

---

[١] پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری كردووە لەم جۆرە سەربڕینە چونكە لە نەفامیداسەربڕراه.

# (٣٩) بەشی خواردنەوەکان

## (١) حەرام کردنی ئارەق

١٢٠٨ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ خمرٍ حَرَامٌ)).

(إبـن عمـر) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((هـەموو سەرخۆشکەرێ مەیە، هەموو (مەیە) کیش حەرامە)).

١٢٠٩ـ عَنْ عَلِيِّ بن أبي طالب –(رضي الله عنه)– قَالَ: كَانَتْ لِي شَارِفٌ مِنْ نَصِيبِي مِنَ الْمَغْنَمِ يَوْمَ بَدْرٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَعْطَانِي شَارِفًا مِنَ الْخُمُسِ يَوْمَئِذٍ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَبْتَنِيَ بِفَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَاعَدْتُ رَجُلًا صَوَّاغًا مِنْ بَنِي قَيْنُقَاعَ يَرْتَحِلُ مَعِيَ، فَنَأْتِي بِإِذْخِرٍ أَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَهُ مِنَ الصَّوَّاغِينَ، فَأَسْتَعِينَ بِهِ فِي وَلِيمَةِ عُرْسِي، فَبَيْنَا أَنَا أَجْمَعُ لِشَارِفَيَّ مَتَاعًا مِنَ الْأَقْتَابِ وَالْغَرَائِرِ وَالْحِبَالِ، وَشَارِفَايَ مُنَاخَانِ إِلَى جَنْبِ حُجْرَةِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَرَجَعْتُ حِينَ جَمَعْتُ مَا جَمَعْتُ فَإِذَا شَارِفَايَ قَدِ اجْتُبَّتْ أَسْنِمَتُهُمَا، وَبُقِرَتْ خَوَاصِرُهُمَا وَأُخِذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَلَمْ أَمْلِكْ عَيْنَيَّ حِينَ رَأَيْتُ ذَلِكَ الْمَنْظَرَ مِنْهُمَا، قُلْتُ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ قَالُوا: فَعَلَهُ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَهُوَ فِي هَذَا الْبَيْتِ فِي شَرْبٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، غَنَّتْهُ قَيْنَةٌ وَأَصْحَابَهُ، فَقَالَتْ فِي غِنَائِهَا: أَلَا يَا حَمْزُ لِلشُّرُفِ النِّوَاءِ، فَقَامَ حَمْزَةُ بِالسَّيْفِ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا، وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا فَأَخَذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا. فَقَالَ عَلِيٌّ (رضي الله عنه): فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَعِنْدَهُ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، قَالَ: فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي وَجْهِيَ الَّذِي لَقِيتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا لَكَ)). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ قَطُّ، عَدَا حَمْزَةُ عَلَى نَاقَتَيَّ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا، وَهَا هُوَ ذَا فِي بَيْتٍ مَعَهُ شَرْبٌ. قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِرِدَائِهِ فَارْتَدَاهُ ثُمَّ انْطَلَقَ يَمْشِي، وَاتَّبَعْتُهُ أَنَا وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ حَتَّى جَاءَ الْبَابَ الَّذِي فِيهِ حَمْزَةُ، فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنُوا لَهُ، فَإِذَا هُمْ شَرْبٌ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَلُومُ حَمْزَةَ فِيمَا فَعَلَ فَإِذَا حَمْزَةُ مُحْمَرَّةٌ عَيْنَاهُ، فَنَظَرَ حَمْزَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَظرَ فَنَظَرَ إِلَى سُرَّتِهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ فَنَظَرَ إِلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ حَمْزَةُ: وَهَلْ أَنْتُمْ إِلَّا عَبِيدٌ لِأَبِي؟ فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ ثَمِلٌ، فَنَكَصَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى عَقِبَيْهِ الْقَهْقَرَى، وَخَرَجَ وَخَرَجْنَا مَعَهُ. [البخاري/ الخمس/ ٢٩٢٥]

(علی) کوڕی (أبو طالب) (ﷺ) دەڵێ: حوشترێکی پیرم هەبوو کە لە دەستکەوتی جەنگی بدر بەرم کەوتبوو، هەر لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوایش (ﷺ) حوشترێکی پیری تری پێدام لە پێنج یەك کاتێ کە ویستم (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بگوێزمەوە، بەڵێنم دابوو بە پیاوێکی زەرەنگەر لەجوولەکەی (بنی قینقاع) کەلەگەڵمدا بێت و، گیای (اذخر)[1] بهێنین بیفرۆشم بە زەرەنگەرەکان تا بیکەمە خەرجی خوانی شاییەکەم، لە کاتێکدا کە سەرقاڵی کۆکردنەوەی جلی سەرپشتی حوشترەکانم و کوڵ و بار و گوریسەکانم بووم، دوو حوشترەکەشم چۆکیان دادابوو بە تەنیشت ماڵی پیاوێکەوە لە یارمەتیدەران، لە دوای کۆکردنەوەی ئەوەی بۆم کۆکرایەوە گەڕامەوە سەیرم کرد کۆپارەی هەردوو حوشترەکەم براون، سکیان هەڵدڕاوە و لەجگەری هەردووکیان بڕاوە، هەر کە ئەو دیمەنەم بە هەردووکیانەوە بینی ئیتر هەردوو چاوم پەرپینە تەوقی سەرم، وتم: کێ ئەوەی کردووە؟ وتیان: (حمزة) کوڕی (عبد المطلب)کردویەتی. ئێستە ئەو لەوماڵەدایە لە ناو کۆمەڵێ ئارەق خۆری انصاردا. ئافرەتێکی گۆرانی بێژ گۆرانی دەوت بۆ خۆی و هاوەڵەکانی، لە گۆرانیەکانیدا دەیوت: ئەها ئەی (حمزە) بۆ ئەو حوشترە قەڵەوانە، ئینجا (حمزة) بە شمشێرەکەیەوە هەستا و کۆپارەی هەردووکیانی بڕی، سکی هەڵدڕین و لە جگەرەکانیانی برد، علی (ﷺ) دەڵێ: بەپرتاو ڕۆیشتم تا چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە (زید) کوڕی (حارثة)ی لەلابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕوخسارمدا گورج زانی کە چیم تووش بووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((چیتە)) عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بێ بەخوا هەرگیز ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە، (حمزة) داویەتی بەسەر حوشترەکانمداو کۆپارەی هەردووکیانی بڕیوە و سکی هەڵدڕیون، ئائەوەتا لەماڵێکدایەو ئارەق خۆرانی لەگەڵدایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای عەباکەی کردو کردیە بەری و بەپرتاو ڕۆیشت، من و (زید) کوڕی (حارثە)یش بەشوێنیەوە بووین تا گەیشتە دەرگای ئەو ماڵەی کە (حمزة)ی تێدابوو، داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتیان دا، ئەوان لە خواردنەوەدا بوون پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

[1] اذخر: جۆرە گیایەکە کەئاگری پێ دەکرێتەوە.

کەوتە سەرزەنشت کردنی (حمزة) لەوەی کە کردبووی، (حمزة) هەردووچاوی سور هەڵگەڕابوون، (حمزة) کەوتە سەیرکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاشان چاوی هەڵبڕی بۆ هەردوو ئەژنۆی موبارەکی، پاشان چاوی بەرزکردەوە و سەیری ناوکی کرد، دواتر چاوی هەڵبڕی و کەوتە سەیرکردنی ڕوخساری موبارەکی پێغەمبەر، ئینجا (حمزة) وتی: ئەی ئێوە کۆیلەی باوکم نین؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانی کە سەرخۆشە، گەڕایەوە دواوە و پشتی هەڵکرد و چووە دەرەوە و ئێمەش لەگەڵیدا چووینە دەرەوە.

## (٢) هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە

١٢١٠ـ عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رجُلًا قدمَ منْ جَيْشَانَ -وجَيْشَانُ منَ الْيَمنِ- فَسَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عنْ شَرَابٍ يَشْرَبُونَهُ بِأَرْضِهِمْ منَ الذُّرَةِ، يُقالُ لهُ: المِزْرُ، فقال النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَوَ مُسْكِرٌ هُوَ)). قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، إِنَّ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَهْدًا لِمَنْ يشْربُ الْمُسْكِرَ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ)). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ: ((عَرَقُ أَهْلِ النَّارِ، أَوْ: عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ)).

(جابر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك لە (جَیشان)ەوە هات -(جَیشان)لەیەمەنە- پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد لەبارەی خواردنەوەیەکەوە کەلە خاکی خۆیاندا دەیخۆنەوە و لە گەنمەشامی دروست دەکرا، پێی دەوترا: (المزر)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا سەرخۆشکەرە؟)). وتی: بەڵێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە، خوا بەڵێنێکی هەیە بۆ ئەو کەسەی کە سەرخۆشکەر دەخواتەوە تێری بکات لە قوڕی (الخَبال))) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا قوڕی (خَبال) چی‌یە؟ فەرمووی: ((ئارەقی خەڵکی نێو دۆزەخ، یان کیم و زوخاوی خەڵکی نێو دۆزەخ)).

## (٣) هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش بکات حەرامە

١٢١١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ: ((كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ)). [البخاري/ الأشربة/ ٥٢٦٣]

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا لەبارەی ئارەقی هەنگوینەوە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش بکات ئەوە حەرامە)).

## ( ٤ ) ئەوەی لە دونیادا ئارەق بخواتەوە لە ڕۆژی دواییدا نایخواتەوە مەگەر تەوبە بکات

١٢١٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ، إِلَّا أَنْ يَتُوبَ)). [البخاري/ اول كتاب الأشربة: ٥٢٥٣]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو کەسەی کە لە دونیادا ئارەق بخواتەوە ئەوا لە ڕۆژی دواییدا نایخواتەوە، مەگەر پەشیمان ببێتەوە)).

## ( ٥ ) ئارەقی خورما و ترێ

١٢١٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ: النَّخْلَةِ وَالْعِنَبَةِ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((ئارەق لەو دوو درەختەیە: درەختی خورما و درەختی ترێ)).

## ( ٦ ) ئارەق لە خورمای کاڵ و خورمای گەییو

١٢١٤ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا طَلْحَةَ وَأَبَا دُجَانَةَ وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ (ﷺ)، فِي رَهْطٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَدَخَلَ عَلَيْنَا دَاخِلٌ فَقَالَ: حَدَثَ خَبَرٌ، نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، فَأَكْفَأْنَاهَا يَوْمَئِذٍ، وَإِنَّهَا لَخَلِيطُ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ. قَالَ قَتَادَةُ: وَقَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: لَقَدْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ وَكَانَتْ عَامَّةُ خُمُورِهِمْ يَوْمَئِذٍ خَلِيطَ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ. [البخاري/ الأشربة/ ٥٢٦٠– ٥٢٦٢]

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: ئارەقم دەدا بە (ابو طلحة) و((ابو دجانة) و (معاذ کوڕی جبل) (ﷺ) لەناو دەستەیەك لە یارمەتیدەراندا، لەناکاودا یەکێ هاتە ناویان و وتی: ڕوداوێکی چاك ڕویدا، حەرامکردنی ئارەق دابەزی، هەر لەو ساتەدا ڕژاندمانە سەرزەوی، کە تێکەڵەیە لەفەریکەخورماو خورما بوو، (قتادة) و (انس) کوڕی (مالك) وتیان: لە ڕاستیدا ئارەق حەرام کرا، کە لەو ڕۆژەدا ئارەقەکەیان بە گشتی تێکەڵەی فەریکە خورما و خورما بوو.

## ( ٧ ) ئارەق لە پێنج شتە

١٢١٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: خَطَبَ عُمَرُ (ﷺ) عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَلَا وَإِنَّ الْخَمْرَ نَزَلَ تَحْرِيمُهَا يَوْمَ نَزَلَ

وَهِيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: مِنَ الْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ، وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ، وَثَلَاثَةُ أَشْيَاءَ وَدِدْتُ -أَيُّهَا النَّاسُ- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ عَهِدَ إِلَيْنَا فِيهَا: الْجَدُّ، وَالْكَلَالَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا. [البخاري/ الاشربة/ ٥٢٦٦]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: عمر (ﷺ) لەسەر دوانگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری داو، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان وتی: بزانن کە کاتێ حەرام کردنی ئارەق دابەزی، لە رۆژی دابەزینیدا لە پێنج شت دروست دەکرا: لە گەنم، لە جۆو خورماو، لە مێوژ و، لە هەنگوین، ئارەقیش ئەوەیە کەعەقڵ تێکدەدات -ئەی خەڵکینە- خۆزگایە پێغەمبەری خوا سێ شتی بە تەواوی بۆ روون دەکردینەوە:

١) بەشی باپیر لە میراتیدا

٢)(الكلالة) میراتی کەسێ بمرێ و باوك و منداڵی لەدوا بەجێنەمابێ.

٣)چەند بەشێك لە بەشەکانی سوو.

## ( ٨ ) رێگری لە تێکەڵ کردنی مێوژو و خورما بۆ خواردنەوە

١٢١٦ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ التَّمْرُ وَالزَّبِيبُ جَمِيعًا، وَنَهَى أَنْ يُنْبَذَ الرُّطَبُ وَالْبُسْرُ جَمِيعًا. [بخاري/ الأشربة/ ٥٢٧٩]

(جابر) کوری (عبدالله الانصاري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ): رێگری کردووە کە مێوژو و خورما تێکەڵ بەیەك بکرێن بۆ خواردنەوە، هەروەها رێگری کردووە کە خورمای تەڕ و بەرسیلەی خورما تێکەڵ بەیەك بکرێن بۆ خواردنەوە.

١٢١٧ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ شَرِبَ النَّبِيذَ مِنْكُمْ فَلْيَشْرَبْهُ زَبِيبًا فَرْدًا، أَوْ تَمْرًا فَرْدًا، أَوْ بُسْرًا فَرْدًا)).

(ابو سعيد) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: هەرکەسێکتان خواردنەوەی خواردەوە، باخواردنەوەی مێژوی تەنها، یان خورمای تەنها، یان فەریکە خورمای تەنها بخواتەوە)).

## ( ٩ ) رێگری لەدروستکردنی خواردنەوە لەناو کوولەکەو دەفری قیردراودا

١٢١٨ـ عَنْ زَاذَانَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ (ﷺ): حَدِّثْنِي بِمَا نَهَى عَنْهُ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنَ الْأَشْرِبَةِ بِلُغَتِكَ، وَفَسِّرْهُ لِي بِلُغَتِنَا، فَإِنَّ لَكُمْ لُغَةً سِوَى لُغَتِنَا. فَقَالَ: نَهَى

رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْحَنْتَمِ وَهِيَ الْجَرَّةُ، وَعَنِ الدُّبَّاءِ وَهِيَ الْقَرْعَةُ، وَعَنِ الْمُزَفَّتِ وَهُوَ الْمُقَيَّرُ، وَعَنِ النَّقِيرِ وَهِيَ النَّخْلَةُ تُنْسَحُ نَسْحًا وَتُنْقَرُ نَقْرًا، وَأَمَرَ أَنْ يُنْتَبَذَ فِي الْأَسْقِيَةِ.

(زازان) (ﷺ) دەڵێ: بە(ابن عمر)م (ﷺ) وت: بەزمانی خۆت ئەو دەفرانەم پێ بڵێ کەپێغەمبەر(ﷺ) ڕێگریی کردووە خواردنەوەیان تێدا بخورێتەوە، پاشتر بەزمانی خۆمان بۆم راڤە بکە، چونکە ئێوە زمانێکتان هەیە جیا لەزمانی ئێمە، (ابن عمر) وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگریی کردووە لە[خواردنەوە] لەگۆزەی سەوزدا، لەناو کوولەکە هەڵکۆڵراوی وشکدا، هەروەها لەدەفرێکدا کەبەقیر ماڵەدرابێت، هەروەها لە(نەقیر) کەدارخورمایە کەدەکرێ بەقەم [جگە لەوانە] ئیتر فەرمانی پێداوین لەهەموو دەفرێکی تردا خواردنەوە دروست بکەین.

## (١٠) خواردنەوە دروستکردن لەدۆڵی بەردیندا

١٢١٩ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ يُنْتَبَذُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي سِقَاءٍ، فَإِذَا لَمْ يَجِدُوا سِقَاءً نُبِذَ لَهُ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ -وَأَنَا أَسْمَعُ- لِأَبِي الزُّبَيْرِ: مِنْ بِرَامٍ؟ قَالَ: مِنْ بِرَامٍ.

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لە کوندەی پێست دا خواردنەوە دروست دەکرا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، ئەگەر کوندەکەیان دەست نەکەوتایە لە دۆڵی بەردیندا خواردنەوەی بۆ دروست دەکرا -گوێم لێبوو- هەندێ کەس وتیان بە (ابو زبیر) هی بەرد؟ وتی: بەڵێ‌هی بەرد؟

## (١١) مۆڵەتی دروستکردنی خواردنەوە لە هەموو دەفرێکدا، ڕێگری لە هەموو سەرخۆشکەرێ

١٢٢٠ـ عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((نَهَيْتُكُمْ عَنِ الظُّرُوفِ، وَإِنَّ الظُّرُوفَ -أَوْ ظَرْفًا- لَا يُحِلُّ شَيْئًا وَلَا يُحَرِّمُهُ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ)).

(بریدة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ڕێگریم کردوون لە (بەکارهێنانی) دەفرەکان، لە ڕاستیدا دەفرەکان -یان دەفر- نەهیچ شتێ حەڵاڵ دەکا و نەحەرامیشی دەکات، بەڵکو هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە)).

## ( ١٢ ) مۆڵەتی دروست کردنی خواردنەوە لە گۆزەی قیر نەدراودا

١١٢١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ) قَالَ: لَمَّا نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ النَّبِيذِ فِي الْأَوْعِيَةِ، قَالُوا: لَيْسَ كُلُّ النَّاسِ يَجِدُ، فَأَرْخَصَ لَهُمْ فِي الْجَرِّ غَيْرِ الْمُزَفَّتِ.

(عبدالله) کوڕی (عمرو) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە خواردنەوە لە دەفرەکاندا، وتیان: هەموو کەسێ دەفری پێستی دەست ناکەوێت، ئینجا مۆڵەتی پێدان دروستی بکەن لەناو گۆزەی قیر نەدراودا.

## ( ١٣ ) ماوەی مانەوەی خواردنەوەی دروستکراو

١٢٢٢ـ عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُنْتَبَذُ لَهُ أَوَّلَ اللَّيْلِ، فَيَشْرَبُهُ إِذَا أَصْبَحَ يَوْمَهُ ذَلِكَ، وَاللَّيْلَةَ الَّتِي تَجِيءُ وَالْغَدَ وَاللَّيْلَةَ الْأُخْرَى، وَالْغَدَ إِلَى الْعَصْرِ. فَإِنْ بَقِيَ شَيْءٌ سَقَاهُ الْخَادِمَ، أَوْ أَمَرَ بِهِ فَصُبَّ.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: لەسەرەتای شەوەوە خواردنەوە دروست کراوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەڕۆژی لێدەبوەوە لێی دەخواردەوە، ڕۆژی دوای ئەوە لێی دەخواردەوە، شەوی دووەمیش شەوی سێیەمیش، سێیەم ڕۆژیش هەتا کاتی عەسر، جا ئەگەر شتێکی لێبمایەتەوە دەیدابە کارگوزارەکەی ، یان فەرمانی دەدا بە ڕژاندنی.

١٢٢٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كُنَّا نَنْبِذُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي سِقَاءٍ يُوكَى أَعْلَاهُ، وَلَهُ عَزْلَاءُ، نَنْبِذُهُ غُدْوَةً فَيَشْرَبُهُ عِشَاءً، وَنَنْبِذُهُ عِشَاءً فَيَشْرَبُهُ غُدْوَةً.

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: خواردنەوەمان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامادە دەکرد لەناو جەوەندەیەکدا کە لەسەرەوە دەمەکەی دەبەسترا و، لەخوارەوە کونی وردی تێدابوو، بەیانیان بۆمان دەکرد و ئێواران دەیخواردەوە و، ئێواران بۆمان دەکرد و بەیانیان دەیخواردەوە.

## ( ١٤ ) ئارەق کردن بە سرکە

١٢٢٤ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) سُئِلَ عَنِ الْخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلًّا؟ فَقَالَ: ((لَا)).

(انس) (ﷺ) دەڵێ: دەربارەی ئارەق شتی تێبکرێ و بکرێت بە سرکە، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((نەخێر)).

## (١٥) چارەسەرکردن بەئارەق

١٢٢٥- عَنْ وَائِلٍ الْحَضْرَمِيِّ: أَنَّ طَارِقَ بْنَ سُوَيْدٍ الْجُعْفِيَّ (ﷺ): سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنِ الْخَمْرِ، فَنَهَاهُ -أَوْ كَرِهَ- أَنْ يَصْنَعَهَا، فَقَالَ: إِنَّمَا أَصْنَعُهَا لِلدَّوَاءِ، فَقَالَ: ((إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّهُ دَاءٌ)).

(وائل الحضرمي) دەڵێ: (طارق) کوڕی (سوید الجعفي)(ﷺ): لەبارەی ئارەقەوە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ)، ڕێگری کرد -یان پێی ناخۆش بوو- کە دروستی بکات، وتی: بە مەبەستی دەرمان دروستی دەکەم، فەرمووی: ((ئارەق دەرمان نیە بەڵکو دەردە)).

## (١٦) دا پۆشینی دەفر

١٢٢٦- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ (ﷺ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) بِقَدَحِ لَبَنٍ مِنَ النَّقِيعِ لَيْسَ مُخَمَّرًا، فَقَالَ: ((أَلَا خَمَّرْتَهُ، وَلَوْ تَعْرُضُ عَلَيْهِ عُودًا)). قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: إِنَّمَا أُمِرَ بِالْأَسْقِيَةِ أَنْ تُوكَأَ لَيْلًا، وَبِالْأَبْوَابِ أَنْ تُغْلَقَ لَيْلًا. [البخاري/ الاشربة/ ٥٢٨٣]

(ابو حمید الساعدي) (ﷺ) دەڵێ: لە (بقیع)ەوە جامێ شیرم هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە سەری دانەپۆشرابوو، فەرمووی: ((بادات پۆشیایە، ئەگەر چیلکەیەکیشت بخستایە بەسەریدا هەرباش بوو)) ابوحمید وتی: لە ڕاستیدا ئێمە فەرمانمان پێدرابوو کە بەشەودا دەمی کوندە ببەستین و دەرگاکانیش داخەین.

## (١٧) دەفرەکان دا پۆشن و دەمی کوندە ببەستن

١٢٢٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ -أَوْ أَمْسَيْتُمْ- فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ، وَأَغْلِقُوا الْأَبْوَابَ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئًا، وَأَطْفِئُوا مَصَابِيحَكُمْ)). [البخاري/ بدء الخلق/ ٣١٠٦]

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر تاریکایی شەو داهات -یان ئێوارەتان بەسەردا هات- منداڵەکانتان قەدەغە بکەن لە چوونە دەرەوە، چونکە شەیتان لەوکاتەدا بڵاوە دەکات، هەر کە سەعاتێ لەشەو تێپەڕی وازیان لێبێنن، دەرگاکانتان دابخەن و ناوی خوا بهێنن،

چونکە شەیتان ناتوانێ دەرگای داخراو بکاتەوە، هەروەها دەمی کوندە و مەشکەکانتان ببەستن و ناوی خوا بهێنن، دەفرەکانتان داپۆشن و ناوی خوا بهێنن، باشتێکیشتان رایەڵ کردبێ بەسەریدا، چراکانیشتان بکوژێننەوە)).

١٢٢٨ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((غَطُّوا الْإِنَاءَ وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ، لَا يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ إِلَّا نَزَلَ فِيهِ مِنْ ذَلِكَ الْوَبَاءِ)). و في رواية: قَالَ اللَّيْثُ -يعني ابن سعيد-: فَالْأَعَاجِمُ عِنْدَنَا يَتَّقُونَ ذَلِكَ فِي كَانُونَ الْأَوَّلِ.

واتە: (جابر)ی کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: ((دەفرەکان داپۆشن و دەمی کوندەکان ببەستن، لەساڵێکدا شەوێك هەیە کەدەردی تێدا دادەبەزێ، بەسەر هەر دەفرێکدا تێپەڕی کەسەرقاپی نەبێ، یان هەر کوندەیەکدا کەدەمی نەبەسترابێت ئەوا ئەو دەردودرمە دادەبەزێتە ناوی)) لەڕیوایەتێکدا: (لیث). واتە (ابن سعد) وتی: عەجەمەکانی لای ئێمە لەمانگی کانوونی یەکەمدات خۆیان لەوشەوە دەپارێزن.

## ( ١٨ ) خواردنەوەی هەنگوین و خۆشاوو خواردنەوەی شیر و ئاو و سرکە

١٢٢٩ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بِقَدَحِي هَذَا الشَّرَابَ كُلَّهُ: الْعَسَلَ وَالنَّبِيذَ وَالْمَاءَ وَاللَّبَنَ.

(انس) (ﷺ) دەڵێ: لەم جامۆڵکەیەمدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەنگوین و ئاووشیری خواردۆتەوە.

١٢٣٠ـ عَنْ الْبَرَاءِ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَأَتْبَعَهُ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ، قَالَ: فَدَعَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَسَاخَتْ فَرَسُهُ، فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ لِي وَلَا أَضُرُّكَ، قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ، قَالَ: فَعَطِشَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَمَرُّوا بِرَاعِي غَنَمٍ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ): فَأَخَذْتُ قَدَحًا، فَحَلَبْتُ فِيهِ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، فَأَتَيْتُهُ بِهِ فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ. [البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٩٦]

(براء) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەککە وە هات بۆ مەدینە، (سراقە)ی کوڕی (مالك) کوڕی (جُعشُم)شوێنی کەوتبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دۆعای لێکرد و ئەسپەکەی چەقی، ئینجا وتی: لای خوا دۆعام بۆ

بكە زیانم بۆت نابێ، لەخوا پاڕایەوە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) تینووی بوو، تێپەڕین بەلای شوانی مەڕێكدا، ابو بكر الصديق (ﷺ) وتی: جامۆڵكەیەكم هەڵگرت و، كەمێ شیرم دۆشییە ناوی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هێنام بۆی و لێی خواردەوە و دڵخۆش بووم كە تینوویەتی شكا.

١٢٣١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أُتِيَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا فَأَخَذَ اللَّبَنَ. فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ. [البخاري/ التفسير/ ٤٤٣٢]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: ئەو شەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) شەوڕەوی پێكرا لە (إيلياء –بيت المقدس) پەرداخێ شیر و پەرداخێ ئارەقیان بۆ هێنا، سەیرێكی كردن و شیرەكەی وەرگرت، جبريل (ﷺ) پێی فەرموو: سوپاس بۆ خوا كە ڕێنومایی كردیت بۆ سروشتی پاك ، ئەگەر ئارەقەكەت هەڵگرتایە ئوممەتەكەت گومڕا دەبوو.

## ( ١٩ ) خواردنەوە لە جامۆڵكەدا

١٢٣٢ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) امْرَأَةٌ مِنَ الْعَرَبِ، فَأَمَرَ أَبَا أُسَيْدٍ أَنْ يُرْسِلَ إِلَيْهَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا فَقَدِمَتْ، فَنَزَلَتْ فِي أُجُمِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى جَاءَهَا فَدَخَلَ عَلَيْهَا، فَإِذَا امْرَأَةٌ مُنَكِّسَةٌ رَأْسَهَا، فَلَمَّا كَلَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، قَالَ: ((قَدْ أَعَذْتُكِ مِنِّي)). فَقَالُوا لَهَا: أَتَدْرِينَ مَنْ هَذَا؟ فَقَالَتْ: لَا، فَقَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) جَاءَكِ لِيَخْطُبَكِ، قَالَتْ: أَنَا كُنْتُ أَشْقَى مِنْ ذَلِكَ. قَالَ سَهْلٌ: فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ حَتَّى جَلَسَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: ((اسْقِنَا)) لِسَهْلٍ، قَالَ: فَأَخْرَجْتُ لَهُمْ هَذَا الْقَدَحَ فَأَسْقَيْتُهُمْ فِيهِ، قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَأَخْرَجَ لَنَا سَهْلٌ ذَلِكَ الْقَدَحَ فَشَرِبْنَا فِيهِ، قَالَ: ثُمَّ اسْتَوْهَبَهُ بَعْدَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ (ﷺ)، فَوَهَبَهُ لَهُ. [البخاري/ الأشربة/ ٥٣١٤]

(سهل) كوڕی (سعد) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێكی عەرەب لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسكرا. فەرمانی دا بە (أبو أُسَيد) كە بنێرێ بە دوایدا، ناردی بە شوێنیدا و هات، لە قەڵای (بني ساعدة)لای دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت تا گەیشتە لای و چووە ژوورەوە بۆ لای كە دی ئافرەتێكە سەری داخستبوو، هەر كە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) قسەی لەگەڵدا کرد، ئافرەتەکە وتی: پەنا ئەگرم بە خوا لەتۆ، فەرمووی: ((تۆ پارێزراوی لە من)) پێیان وت: (ئەی ئافرەت) ئایا دەزانی ئەوە کێیە؟ وتی: نەخێر، وتیان: ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) هاتووە بۆلات بتخوازێ، وتی: من ئەوەندە بەختەوەر نیم بمخوازێ، (سهل) وتی: هەر ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە خۆی و هاوەڵانی لە (سقيفة بني ساعدة) دانیشتن، پاشان فەرمووی بە (سهل): ((ئاو بگێڕە بۆمان)). وتی: ئەو جامۆڵکەیەم بۆ دەرهێنا و ئاوم گێڕا بۆیان تیایدا، (أبو حازم) وتی: (سهل) ئەو جامەی بۆ دەرهێناین و ئاومان تێدا خواردەوە، وتی: پاشان (عمر) کوڕی (عبدالعزيز) (ﷺ) داوای لێکرد کە پێی ببەخشێ، ئەویش پێی بەخشی.

## ( ٢٠ ) ڕێگری کردن لەدەمەوخوارکردنەوەی کوندە

١٢٣٣ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ أَنْ يُشْرَبَ مِنْ أَفْوَاهِهَا. وَفِي رواية: وَاخْتِنَاثُهَا أَنْ يُقْلَبَ رَأْسُهَا ثُمَّ يُشْرَبَ مِنْهُ. [البخاري/ الأشربة/ ٥٣٠٢]

(ابو سعيد الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگری کردووە لەدەمەوخوارکردنەوەی کوندەو خواردنەوە لەدەمەکەیەوە، لەریوایەتێکدا سەرەوخوار بکرێتەوەو ئینجا لێی بخورێتەوە.

## ( ٢١ ) ڕێگری لە خواردنەوە لە دەفری ئاڵتون و زیودا

١٢٣٤ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُكَيْمٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ (ﷺ) بِالْمَدَائِنِ، فَاسْتَسْقَى حُذَيْفَةُ، فَجَاءَهُ دِهْقَانٌ بِشَرَابٍ فِي إِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ، فَرَمَاهُ بِهِ وَقَالَ: إِنِّي أُخْبِرُكُمْ أَنِّي قَدْ أَمَرْتُهُ أَنْ لَا يَسْقِيَنِي فِيهِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَشْرَبُوا فِي إِنَاءِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَا تَلْبَسُوا الدِّيبَاجَ وَالْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَهُوَ لَكُمْ فِي الْآخِرَةِ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). [البخاري/ الأطعمة/ ٥١١٠]

(عبدالله) کوڕی (عكيم) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ (حذيفة)دا (ﷺ) لە (مدائن) بووین، (حذيفة) داوای ئاوی کرد، سەر گەورەی (مدائن) خواردنەوەیەکی بۆ هێنا لەناو دەفرێکی زیوین دا، دەفرەکەی پێدایەوەو وتی: من ئاگادارتان دەکەم کە من فەرمانم پێداوە کە لەناو ئەو دەفرە زیوەدا دەرخواردم نەدات ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لە دەفری ئاڵتون و زیودا خواردنەوە

مەخۆنەوە، پۆشاکی (دیباج) و ئاوریشم مەپۆشن، ئەوە لە دونیادا بۆ ئەوانە و (واتە بۆ بێباوەڕان) لە ڕۆژی دوایشدا بۆ ئێوەیە، واتە لە ڕۆژی قیامەت دا)).

١٢٣٥ـ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ)). وفي رواية: ((أَنَّ الَّذِي يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ...)). [البخاري/ الأشربة/ ٥٣١١]

(أم سلمة) (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو کەسەی لە دەفری زیودا بخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخ لەناوسکیدا قوڵتە قوڵتی دێت)). لە ڕیوایەتێکی تردا: ((ئەو کەسەی خۆراك یان خواردنەوە بخواتەوە لەناو دەفری زیو و ئاڵتون دا...)).

## ( ٢٢ ) لای ڕاست لە پێشترە

١٢٣٦ـ عَنْ أَنَس بْن مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي دَارِنَا فَاسْتَسْقَى، فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً، ثُمَّ شُبْتُهُ مِنْ مَاءِ بِئْرِي هَذِهِ، قَالَ: فَأَعْطَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِهِ، وَعُمَرُ (ﷺ) وِجَاهَهُ، وَأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ شُرْبِهِ، قَالَ عُمَرُ: هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ، يُرِيهِ إِيَّاهُ، فَأَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْأَعْرَابِيَّ وَتَرَكَ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْأَيْمَنُونَ الْأَيْمَنُونَ الْأَيْمَنُونَ)). قَالَ أَنَسٌ: فَهِيَ سُنَّةٌ، فَهِيَ سُنَّةٌ فَهِيَ سُنَّةٌ. [البخاري/ الهبة/ ٢٤٣٢]

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ ماڵمان و داوای خواردنەوەیەکی کرد، ئێمەش مەڕێکمان بۆ دۆشی، پاشان لە ئاوی ئەو بیرەم تێکەڵ کرد، وتی: دام بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردیەوە، (أبو بكر) لای چەپیەوە بوو، (عمر) (ﷺ) بەرانبەری بوو، عەرەبێکی دەشتەکیش لەلای ڕاستیەوە بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخواردنەوەکەی لێبوویەوە، (عمر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە (أبو بكر)ە، پیشانی دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دای بە عەرەبە دەشتەکیەکە نەك (ابوبکر) و (عمر)و، فەرمووی: ((ئەوانەی لای ڕاستەوەن، ئەوانەی لای ڕاستەوەن)). انس وتی: ئەوە سوننەتە، ئەوە سوننەتە، ئەوە سوننەتە.

## (٢٣) مۆڵەت وەرگرتن لە بچوك تا بدریٚ بە بەساڵاچوان

١٢٣٧ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلَامٌ وَعَنْ يَسَارِهِ أَشْيَاخٌ، فَقَالَ لِلْغُلَامِ: ((أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هَؤُلَاءِ)). فَقَالَ الْغُلَامُ: لَا وَاللَّهِ، لَا أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَدًا. قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي يَدِهِ. [البخاري/ المظالم/ ٢٣١٩]

(سهل) کوری (سعد الساعدي) (ﷺ) دەڵێ: خواردنەوەیەك هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لێی خواردەوە، مێردمنداڵێك لای ڕاستیەوە و چەند بەساڵاچوویەکیش لای چەپیەوە بوون، پێغەمبەر (ﷺ) بە کوڕەکەی فەرموو: ((مۆڵەتم دەدەیت بیدەم بەوان)). کوڕەکە وتی: نەبەخوا ئەو بەشەی لە تۆوە پێم دەگات، کەس پێشی خۆم ناخەم، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دایە دەستی.

## (٢٤) ڕێگری لە فووکردن بە دەفری خواردنەوەدا

١٢٣٨ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الْإِنَاءِ. [البخاري/ الأشربة/ ٥٣٠٧]

(ابو قتادة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕیگری کردووە کە فووبکرێت بە دەفری خواردن و خواردنەوەدا.

## (٢٥) پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخواردنەوەدا هەناسەی دەدا

١٢٣٩ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلَاثًا، وَيَقُولُ: ((إِنَّهُ أَرْوَى وَأَبْرَأُ وَأَمْرَأُ)). قَالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلَاثًا. [البخاري/ الأشربة/ ٥٣٠٨]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی خواردنەوەدا سێ جار هەناسەی دەدا و دەیفەرموو: ((ئاوا باشتر تینویەتی دەشکێنێ و، سەلامەت ترە و، ئاسانتریش دەچێتە گەدەوە)). (انس) وتی: منیش لەکاتی خواردنەوەدا سێجار هەناسەم دەدا.

## (٢٦) ڕێگری لە خواردنەوە بە پێوە

١٢٤٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِمًا، فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقِئْ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((باکەستان بە پێوە خواردنەوە نەخواتەوە، هەرکەسێ لەبیری چوو با بڕشێتەوە)).

## (٢٧) مۆڵەت دان بە خواردنەوەی ئاوی زمزم بە پێوە

١٢٤١ـ عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ قَائِمًا، وَاسْتَسْقَى وَهُوَ عِنْدَ الْبَيْتِ. [البخاري/ الحج/ ١٥٥٦]

(إبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: ئاوی زمزمم دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپێوە خواردیەوە، ئەوکاتە لای (کەعبە)دابوو کەداوای ئاویکرد.

# (٤٠) بەشی خواردەمەنیەكان

## ( ١ ) ناو هێنانی خوای گەورە لەسەر خواردن

١٢٤٢ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا إِذَا حَضَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) طَعَامًا لَمْ نَضَعْ أَيْدِيَنَا حَتَّى يَبْدَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَيَضَعَ يَدَهُ، وَإِنَّا حَضَرْنَا مَعَهُ مَرَّةً طَعَامًا، فَجَاءَتْ جَارِيَةٌ كَأَنَّهَا تُدْفَعُ، فَذَهَبَتْ لِتَضَعَ يَدَهَا فِي الطَّعَامِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِيَدِهَا، ثُمَّ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ كَأَنَّمَا يُدْفَعُ، فَأَخَذَ بِيَدِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَنْ لَا يُذْكَرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذِهِ الْجَارِيَةِ لِيَسْتَحِلَّ بِهَا، فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا، فَجَاءَ بِهَذَا الْأَعْرَابِيِّ لِيَسْتَحِلَّ بِهِ، فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ فِي يَدِي مَعَ يَدِهَا)). وفي رواية: ثُمَّ ذَكَرَ اسْمَ اللَّهِ وَأَكَلَ.

(حذيفة) (ﷺ) دەڵێ: هەركات ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامادەی خواردنێك بووینایە دەستمان بۆ نەدەبرد هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی پێدەكرد و دەستی بۆ دەبرد، ئێمە جارێكیان ئامادەی خواردنێك بوین لە خزمەتیدا، كچۆڵەیەك هات و هەروەك پاڵی پێوە بنرێ، ڕۆیشت تا دەستی بخاتە نێو خواردنەكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی گرت، پاشان عەرەبێكی دەشتەكیش هات هەروەك پاڵی پێوە بنرێ. پێغەمبەر (ﷺ) دەستی ئەویشی گرت، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((شەیتان دەتوانێ لەو خواردنە بخوات كە ناوی خوای لەسەر ناهێنرێ، ئەو ئەم كچۆڵەیەی هێنا هەتا بتوانێ لێی بخوات، منیش دەستم گرت، پاشان ئەم عەرەبە دەشتەكیەی هێنا هەتا بتوانێ لێی بخوات، دەستی ئەویشم گرت، سوێند بێ بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە دەستی ئەو لەگەڵ دەستی ئەو كچۆڵەیە لەناو دەستمدا بوون)) لە ریوایەتێكیشدا: پاشان ناوی خوای گەورەی هێنا و خواردی.

١٢٤٣ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَذَكَرَ اللَّهَ (ﷻ) عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لَا مَبِيتَ لَكُمْ وَلَا عَشَاءَ، وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ، وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ)).

(جابر) كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستوە دەیفەرموو: ((ئەگەر پیاو چوەوەماڵی خۆی و ناوی خوای (ﷻ)ی هێنا لەكاتی چوونە ژوورەوە و لە كاتی خواردنیدا، شەیتان بەهاوڕێكانی دەڵێ : نەشوێنی

مانەوەتان هەیە و نەنانی ئێوارە، بەڵام ئەگەر هەرکەس چووە ژوورەوە و ناوی خوای‌نەهێنا، لە کاتی چوونە ژوورەوەیدا، شەیتان دەڵێ: شوێنی مانەوەتان دەست کەوت، ئەگەر لەکاتی خواردنیدا ناوی خوای نەهێنا دەڵێ: شوێنی شەومانەوە و نانی ئێوارەیشتان دەست کەوت)).

## (٢) خواردن بە دەستی ڕاست

١٢٤٤ـ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ)).

(ابن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەرکاتێ یەکێکتان خواردنی خوارد بابەدەستی ڕاستی بیخوات، هەرکاتێ ئاوی خواردەوە بابە دەستی ڕاستی بیخواتەوە، چونکە شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات و دەخواتەوە)).

١٢٤٥ـ عَنْ إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (رضي الله عنه): أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ: أَنَّ رَجُلًا أَكَلَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِشِمَالِهِ، فَقَالَ: ((كُلْ بِيَمِينِكَ)). قَالَ: لَا أَسْتَطِيعُ، قَالَ: ((لَا اسْتَطَعْتَ)). مَا مَنَعَهُ إِلَّا الْكِبْرُ، [قَالَ]: فَمَا رَفَعَهَا إِلَى فِيهِ.

لە (إياس) کوڕی (سلمة) کوڕی (الأكوع)ەوە (رضي الله عنه)، باوکی بۆی گێڕاوەتەوە: کە پیاوێك لەلای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەدەستی چەپی خواردنی خوارد، فەرمووی: ((بە دەستی ڕاستت بخۆ؟)) وتی: ناتوانم، فەرمووی: ((هەر ئەتوانی)). تەنها لووت بەرزی ڕێگری لێکردبوو (وتی) لەدوای ئەوەوە ئیتر نەیتوانی ئەو دەستەی بەرزبکاتەوە بۆ دەمی.

## (٣) بخۆر لەبەردەمی خۆیەوە بخوات

١٢٤٦ـ عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنْتُ فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي: ((يَا غُلَامُ، سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ)). [البخاري/ الأطعمة/ ٥٠٦١]

(عمر) کوڕی (أبو سلمة) (رضي الله عنه) دەڵێ: من لە بەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووم، دەستم بە هەموولایەکی قاپەکەدا دەگێڕا، پێی فەرمووم: ((ڕۆڵە، ناوی خوا بهێنە و بەدەستی ڕاستت بخۆ، لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ)).

### ( ٤ ) خواردن بە سێ پەنجە

١٢٤٧ـ عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَأْكُلُ بِثَلَاثِ أَصَابِعَ، وَيَلْعَقُ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يَمْسَحَهَا.

(كعب) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سێ پەنجە خواردنی دەخواردو، دەستی خۆی دەلێسایەوە پێش ئەوەی کە بیسڕێت.

### ( ٥ ) لێسانەوەی پەنجەکان و قاپی خواردن

١٢٤٨ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَ بِلَعْقِ الْأَصَابِعِ وَالصَّحْفَةِ، وَقَالَ: ((إِنَّكُمْ لَا تَدْرُونَ فِي أَيِّهِ الْبَرَكَةُ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە لێسانەوەی پەنجەکان و قاپەکەیش و، فەرمووی: ((ئێوە نازانن فەڕ و بەرەکەت لەکامیاندایە)).

### ( ٦ ) سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەر خواردن و خواردنەوە

١٢٤٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الْأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا)).

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوا لەوبەندەیە ڕازی دەبێ کە هەر خواردنێکی خوارد سوپاسی خوای لەسەر بکات، یان هەر خواردنەوەیەك بخواتەوە و سوپاسی خوای لەسەر بکات)).

### ( ٧ ) پرسیار دەکرێ لە نیعمەتی خواردن و خواردنەوە

١٢٥٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ لَيْلَةٍ، فَإِذَا هُوَ بِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ (ﷺ)، فَقَالَ: ((مَا أَخْرَجَكُمَا مِنْ بُيُوتِكُمَا هَذِهِ السَّاعَةَ)). قَالَا: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((وَأَنَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَخْرَجَنِي الَّذِي أَخْرَجَكُمَا، قُومُوا)). فَقَامُوا مَعَهُ فَأَتَى رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ فَإِذَا هُوَ لَيْسَ فِي بَيْتِهِ، فَلَمَّا رَأَتْهُ الْمَرْأَةُ قَالَتْ: مَرْحَبًا وَأَهْلًا، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَيْنَ فُلَانٌ)). قَالَتْ: ذَهَبَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا مِنَ الْمَاءِ، إِذْ جَاءَ الْأَنْصَارِيُّ، فَنَظَرَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَصَاحِبَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، مَا أَحَدٌ الْيَوْمَ أَكْرَمَ أَضْيَافًا مِنِّي، [قَالَ]: فَانْطَلَقَ فَجَاءَهُمْ بِعِذْقٍ فِيهِ بُسْرٌ وَتَمْرٌ وَرُطَبٌ، فَقَالَ: كُلُوا مِنْ هَذِهِ، وَأَخَذَ الْمُدْيَةَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِيَّاكَ وَالْحَلُوبَ)). فَذَبَحَ لَهُمْ. فَأَكَلُوا مِنَ الشَّاةِ وَمِنْ ذَلِكَ الْعِذْقِ وَشَرِبُوا، فَلَمَّا أَنْ شَبِعُوا وَرَوُوا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ

(ﷺ): ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُسْأَلُنَّ عَنْ هَذَا النَّعِيمِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمُ الْجُوعُ، ثُمَّ لَمْ تَرْجِعُوا حَتَّى أَصَابَكُمْ هَذَا النَّعِيمُ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێك یان شەوێك چووە دەرەوە، لەناکاودا گەیشت بە (ابو بکر) و (عمر) (ﷺ)، فەرمووی: ((ئالەم کاتەدا چی لەماڵەکانتان دەری کردوون؟)). وتیان: برسێتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، منیش هەرئەوە دەری کردووم کە ئێوەی دەکردووە، هەستن)). لە خزمەتیدا هەستان و تەشریفی هێنا بۆلای پیاوێك لەیارمەتیدەران ئەویش لە ماڵەوە نەبوو، هەر کە ژنەکە پێغەمبەری (ﷺ) بینی وتی: زۆر بەخێربێیت ئەی میوانی ماڵ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((فلان لە کوێیە)). وتی: ڕۆیشتوە ئاوی سازگارمان بۆ بهێنێ، ئالەوێدا یارمەتیدەرەکە هاتەوە، سەیرێکی پێغەمبەری خواو (ﷺ) دوو هاوەڵەکەیی کرد، پاشان وتی: سوپاس بۆخوا کەس نیە ئەمڕۆ میوانەکانی لە هی من بەڕێزتر بن. بە پرتاو ڕۆیشت هێشویەك خورمای هێنا، بەرسیلەو خورماو خورمای تەڕی تیابوو، وتی: لەوە بخۆن، چەقۆکەی گرت بەدەستەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێی: ((وریای شیردەربە)). مەڕێکی بۆ سەربڕین، لەمەڕەکە و لە هێشوە خورماکەیان خوارد و ئاویان خواردەوە، کاتێ کە تێر و پاراو بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (ابو بکر) و (عمر)ی (ﷺ) فەرموو: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاری ئەم نیعمەتەتان لێدەکرێ، برسێتی لەماڵەکانتانەوە هێنانیە دەرەوە و، نەگەڕانەوە هەتا ئەم نیعمەتانەتان دەست کەوت)).

## ( ٨ ) چوون بەدەم دەعوەتی دراوسێوە

١٢٥١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ جَارًا لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَارِسِيًّا كَانَ طَيِّبَ الْمَرَقِ، فَصَنَعَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ جَاءَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ: ((وَهَذِهِ)). لِعَائِشَةَ، فَقَالَ: لَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا)). فَعَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَهَذِهِ)). قَالَ: لَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا)). ثُمَّ عَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَهَذِهِ)). قَالَ: نَعَمْ، فِي الثَّالِثَةِ، فَقَامَا يَتَدَافَعَانِ حَتَّى أَتَيَا مَنْزِلَهُ.

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دراوسێیەکی فارسی هەبوو، شلە بەگۆشتەکەی بەتام و خۆش بو، خواردنێکی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دروست

کـرد و پاشـان هاتـە خزمـەتی و دەعوتـی کـرد بـۆ خواردنـی، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەویش)). واتە (عائشة)ش بێ لەگەڵم ؟ وتی: نەخێر، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((منیـش نـەخێر)) واتـە بـەبێ (عائشـە) نایـەم دیسـان گەڕایـەوە و دەعوەتـی کـردەوە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی ((ئـەویش)) . پیاوەکەی وتی: ((نەخێر)) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((نەخێر)) پاشان هاتەوە و دەعوەتی کردەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمیش)). وتی: بەڵێ، ئینجا لە جاری سێیەمدا، هەستان و بەپەلە یەك لەدوای یەك ڕۆیشتن تا گەیشتنەماڵەکەی.

## ( ٩ ) کەسێ کە شوێنی کەسێکی دەعوەت کراو دەکەوێ

١٢٥٢ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو شُعَيْبٍ وكَانَ لَهُ غُلَامٌ لَحَّامٌ، فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَعَرَفَ فِي وَجْهِهِ الْجُوعَ، فَقَالَ لِغُلَامِهِ: وَيْحَكَ، اصْنَعْ لَنَا طَعَامًا لِخَمْسَةِ نَفَرٍ، فَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَدْعُوَ النَّبِيَّ (ﷺ) خَامِسَ خَمْسَةٍ. قَالَ: فَصَنَعَ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَدَعَاهُ خَامِسَ خَمْسَةٍ، وَاتَّبَعَهُمْ رَجُلٌ، فَلَمَّا بَلَغَ الْبَابَ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((إِنَّ هَذَا اتَّبَعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ رَجَعَ)). قَالَ: لَا، بَلْ آذَنُ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. [البخاري/ البيوع/ ١٩٧٥٤]

(ابو مسعود الأنصاري) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هەبوو لە یارمەتیدەران پێـی دەوتـرا (ابـو شعیب)، کـارگوزارێکی هـەبوو گۆشـت فـرۆش بـوو، انصاریەکـە پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) بینـی و لـە ڕوخسـاریدا برسـێتی بـەدی کـرد، بەکارگوزارەکەیی وت: کۆستت کەوێ، خواردنێکمان بۆ دروسـت بکـە بەشـی پێنج کەس بکات، من دەمـەوێ دەعوەتـی پێغەمبـەر (ﷺ) بکەم و یەکێ بێ لـە پێنج کەسەکە. دروستیکرد، پاشان هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە یـەکێك بوو لە پێنج کەس، پیاوێك شوێنیان کەوت، کاتێ گەیشتە دەرگاکە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمە شوێنمان کەوتوە ئەگەر دەتەوێ مۆڵەتی بدەیت، ئەگـەر نـا دەگەڕێتـەوە)). وتـی: نـەخێر ؛ نایگێڕمـەوە ؛ بـەڵکو مۆڵـەتی دەدەم ئـەی پێغەمبەری خوا.

## ( ١٠ ) پێشخستنی مافی میوان

١٢٥٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي مَجْهُودٌ، فَأَرْسَلَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقَالَتْ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا عِنْدِي إِلَّا مَاءٌ،

ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى أُخْرَى فَقَالَتْ مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى قُلْنَ كُلُّهُنَّ مِثْلَ ذَلِكَ: لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا عِنْدِي إِلَّا مَاءٌ، فَقَالَ: ((مَنْ يُضِيفُ هَذَا اللَّيْلَةَ رَحِمَهُ اللَّهُ)). فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى رَحْلِهِ فَقَالَ لِامْرَأَتِهِ: هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ قَالَتْ: لَا إِلَّا قُوتُ صِبْيَانِي، قَالَ: فَعَلِّلِيهِمْ بِشَيْءٍ، فَإِذَا دَخَلَ ضَيْفُنَا فَأَطْفِئِ السِّرَاجَ وَأَرِيهِ أَنَّا نَأْكُلُ، فَإِذَا أَهْوَى لِيَأْكُلَ فَقُومِي إِلَى السِّرَاجِ حَتَّى تُطْفِئِيهِ، قَالَ: فَقَعَدُوا وَأَكَلَ الضَّيْفُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: ((قَدْ عَجِبَ اللَّهُ مِنْ صَنِيعِكُمَا بِضَيْفِكُمَا اللَّيْلَةَ)). [البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٨٧]

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پیـاوێك هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـواو (ﷺ) عەرزی كرد: برسێتی نارەحەتی كردووم، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی نارد بۆ لای یەكێ لە خێزانەكانی، وتی: سوێند بێ بەو كەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە كردووە جگە لە ئاو هیچی ترم لانیە، پاشان ناردی بۆلای یەكێكی تریان ئەویش هەمان وتەی دووبارە كردەوە، هەتا هەرهەموویان هەر ئەوەیان وت: نەخێر سوێندبێ بەو كەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە كردوە جگە لە ئاو هیچی ترم لەلانیە. ئینجا فەرمووی:((ڕەحمەتی خـوا لـەو كەسـەبێت ئەمشـەو میوانـداری ئـەم پیـاوە دەكات)). پیاوێك لە یارمەتیدەران هەستا و وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پیاوەكەی بردەوە ماڵی خۆیی و بە خێزانەكەی وت: ئایا شتێكت لاهەیە؟ وتی:نەخێر جگە لە خۆراكی منداڵەوردەكان، وتی: خەریكیان بكە بەشتێكەوە، هەر كە میوانەكەمان هاتە ژوورەوە، چراكە زۆر كز بكە وا دەربخە كە ئێمە خەریكی خواردنین، هەركە ئەو كەوتە خواردن هەستە و چراكە بكوژێنەرەوە، وتی: خۆیان دانیشتن و میوانەكە نانی خوارد، كەڕۆژ بوویەوە، هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش فەرمووی: ((خوای گەورە ئەوكارەی پەسەند كردن و ڕازی بوو لە كردەوەی ئەمشەوتان)).

### ( ١١ ) خواردەمەنی دوو كەس بەشی سێكەس دەكات

١٢٥٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((طَعَامُ الِاثْنَيْنِ كَافِي الثَّلَاثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلَاثَةِ كَافِي الْأَرْبَعَةِ)). [البخاري/ الأطعمة/ ٥٠٧٧]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((خواردەمەنی دوو کەس بەشی سێ‌کەس دەکات، خواردەمەنی سیانیش بەشی چوارکەس دەکات)).

١٢٥٥ـ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((طَعَامُ الْوَاحِدِ يَكْفِي الِاثْنَيْنِ، وَطَعَامُ الِاثْنَيْنِ يَكْفِي الْأَرْبَعَةَ، وَطَعَامُ الْأَرْبَعَةِ يَكْفِي الثَّمَانِيَةَ)).

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستوە کە دەیفەرموو: ((خواردەمەنی یەك کەس بەشی دوو کەس دەکات، خواردەمەنی دوو کەس بەشی چوار کەس دەکات، خواردەمەنی چوار کەسیش بەشی هەشت کەس دەکات)).

## ( ١٢ ) خواردنی کوولەکە

١٢٥٦ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: دَعَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلٌ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَجِيءَ بِمَرَقَةٍ فِيهَا دُبَّاءٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَأْكُلُ مِنْ ذَلِكَ الدُّبَّاءِ وَيُعْجِبُهُ، قَالَ: فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ جَعَلْتُ أُلْقِيهِ إِلَيْهِ وَلَا أَطْعَمُهُ، قَالَ: فَقَالَ أَنَسٌ: فَمَا زِلْتُ بَعْدُ [ذلك] يُعْجِبُنِي الدُّبَّاءُ. [البخاري/ الأطعمة/ ٥١٢٣]

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەعوەت کرد، لە خزمەتیدا ڕۆیشتم، شلە بەگۆشتێك هێنرا کە کولەکەی تێدابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە خواردنی کولەکەکە و بەلایەوە خۆش بوو، وتی: هەرکە ئەوەم بینی کولەکەکەم خستە لای ئەوەوە و خۆم نەم خوارد، انس وتی: ئیتر لە دوای ئەوەوە بەردەوام کولەکەم لابەلەزەت بوو.

## ( ١٣ ) سرکە پێخۆرێکی چاکە

١٢٥٧ـ عَنْ طَلْحَةُ بْنُ نَافِعٍ: أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِيَدِي ذَاتَ يَوْمٍ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَأَخْرَجَ إِلَيْهِ فِلَقًا مِنْ خُبْزٍ، فَقَالَ: ((مَا مِنْ أُدُمٍ)). فَقَالُوا: لَا إِلَّا شَيْءٌ مِنْ خَلٍّ، قَالَ: ((فَإِنَّ الْخَلَّ نِعْمَ الْأُدُمُ)). قَالَ جَابِرٌ: فَمَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهَا مِنْ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ). و قَالَ طَلْحَةُ: مَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهَا مِنْ جَابِرٍ.

لە(طلحة) کوڕی (نافع)ەوە: کەلە (جابر) کوڕی (عبدالله)ی (ﷺ) بیستوە کە دەیووت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێ دەستی گرتم و بردمی بۆ ماڵی خۆی،

پارچەیەك نانی بۆ دەرهێنـام، فـەرمووی: (( ئایـا پێخۆرێـك نیـیە؟)). وتیـان: نەخێر جگە لە هەندێ سركە، فەرمووی: (( بەڕاستی سركە پێخۆرێكی چاكە)). جابر وتـی: لەوكاتـەوە كـە لـە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیسـتووە ئیـتر بـەردەوام حـەزم لەسـركەیە، (طلحة) وتـی: منیش لەوكاتـەوە كەلە جابرم بیسـتووە ئیـتر بەردەوام حەزم لە سركەیە.

## ( ١٤ ) خواردنی خورما

١٢٥٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ (ﷺ) قَالَ: نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى أَبِي، قَالَ: فَقَرَّبْنَا إِلَيْهِ طَعَامًا وَوَطْبَةً، فَأَكَلَ مِنْهَا، ثُمَّ أُتِيَ بِتَمْرٍ، فَكَانَ يَأْكُلُهُ وَيُلْقِي النَّوَى بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ، وَيَجْمَعُ السَّبَّابَةَ وَالْوُسْطَى –قَالَ شُعْبَةُ: هُوَ ظَنِّي وَهُوَ فِيهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ [تعالى] إِلْقَاءُ النَّوَى بَيْنَ الْإِصْبَعَيْنِ– ثُمَّ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الَّذِي عَنْ يَمِينِهِ، قَالَ: فَقَالَ أَبِي، وَأَخَذَ بِلِجَامِ دَابَّتِهِ: ادْعُ اللَّهَ لَنَا. فَقَالَ: ((اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مَا رَزَقْتَهُمْ، وَاغْفِرْ لَهُمْ، وَارْحَمْهُمْ)).

(عبدالله) كوڕی (بُسر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە میوانی لای‌دایە لای باوكم، ئێمەش خواردنێك و خورما بەڕۆن، یان كەشك و ڕۆنمـان هێنایـە خزمـەتی، لێـی خـوارد، پاشـان خورمـای بـۆ هێـنرا، دەیخـوارد و ناوكەكـەی دەخستە نێوان پەنجەكانیەوە، پەنجـەی شـەهادەت و ناوەڕاسـتی دەهێنایـەوە یەك (شعبة) دەڵێ: ئەوە بۆچوونی منە، كە ناوكە خورمای خستبێتە نێوان دوو پەنجەیـەوە– پاشـان خواردنەوەیـەكمان بـۆ هێنـا و خواردیەوە، پاشـان دایـە دەستی ئەو كەسەی لەلای ڕاستیەوە بوو: باوكم وتـی، بەدەم گرتنـی دەسـتە جڵەوی وڵاغەكەیەوە عەرزم كرد: لای خوا بپاڕێرەوە بۆمان، فەرمووی: ((خوایە فەڕ و بەرەكەت بخەرە ئەو ڕزقەوە كە پێـت داون‌و، لێیـان خۆش ببە و، بەزەیت پێیاندا بێتەوە)).

## ( ١٥ ) خورما خواردن لەسەر چۆك

١٢٥٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك (ﷺ) قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِتَمْرٍ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقْسِمُهُ وَهُوَ مُحْتَفِزٌ، يَأْكُلُ مِنْهُ أَكْلًا ذَرِيعًا. وَفِي رِوَايَةٍ: رأيت النبي (ﷺ) مُقعياً يأكل تمراً.

(انـس) كـوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵـێ: خورما هێنرا بۆ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، پێغەمبـەر (ﷺ) هـەر بـە چیچكانەوە كەوتە دابەشـكردنی خۆیشـی بەپەلـە لێـی

خوارد، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی دانیشتبوو لەسەر چۆك خورمای دەخوارد.

## ( ١٦ ) هەرماڵێك خورمای تێدانەبێ خەڵکەکەی برسین

١٢٦٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا عَائِشَةُ، بَيْتٌ لَا تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ. يَا عَائِشَةُ، بَيْتٌ لَا تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ. أَوْ: جَاعَ أَهْلُهُ)). قَالَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا.

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی عائشة هەر ماڵێك خورمای تێدا نەبێ خەڵکەکەی برسین، ئەی عائشة هەر ماڵێك خورمای تێدا نەبێ خەڵکەکەی برسین، یان: خەڵکەکەی برسیانە)). دوو تا سێ جار ئەمەی فەرموو.

## ( ١٧ ) ڕێگری لەخواردنی خورما بەدوو دوو

١٢٦١ـ عَنْ جَبَلَةَ بْنَ سُحَيْمٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ الزُّبَيْرِ (ﷺ) يَرْزُقُنَا التَّمْرَ، قَالَ: وَقَدْ كَانَ أَصَابَ النَّاسَ يَوْمَئِذٍ جَهْدٌ، وَكُنَّا نَأْكُلُ فَيَمُرُّ عَلَيْنَا ابْنُ عُمَرَ وَنَحْنُ نَأْكُلُ فَيَقُولُ: لَا تُقَارِنُوا، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ الْإِقْرَانِ، إِلَّا أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ أَخَاهُ. قَالَ شُعْبَةُ: لَا أُرَى هَذِهِ الْكَلِمَةَ إِلَّا مِنْ كَلِمَةِ ابْنِ عُمَرَ، يَعْنِي الِاسْتِئْذَانَ. [البخاري/ الاطعمة/ ٥١٣١]

(جَبَلـة) کوڕی (سُحَيم) دەڵێ: (ابن زبیر) خورمای پێدەداین، خەڵکی لەوڕۆژەدا برسێتی ناڕەحەتی کردبوون، ئێمە خورمامان دەخوارد و (أبن عمر) سەری لێداین، ئێمەش لەوکاتەیا خورمامان خوارد دەیوت: دوو دوو خورما مەخۆن، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگریی کردووە لە بەجووت خواردنی خورما. مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێ کە پیاو مۆڵەت لەبراکەی وەربگرێت، (شعبة) وتی: ئەم وشەیەم نەبینیوە لە وتەی ابن عمردا نەبێ. واتە مۆڵەت خواستنەکە.

## ( ١٨ ) خواردنی تروزی بە خورماوە

١٢٦٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ. [البخاري/ الأطعمة/ ٥١٣٢]

(عبدالله)ی کوڕی (جعفر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی تروزیو خورمای تەڕی پێکەوە دەخوارد.

## ( ١٩ ) بەری رەشی داری ئەراك

١٢٦٣ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِمَرِّ الظَّهْرَانِ وَنَحْنُ نَجْنِي الْكَبَاثَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((عَلَيْكُمْ بِالْأَسْوَدِ مِنْهُ)). قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَأَنَّكَ رَعَيْتَ الْغَنَمَ؟ قَالَ: ((نَعَمْ، وَهَلْ مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا وَقَدْ رَعَاهَا)). أَوْ نَحْوَ هَذَا مِنَ الْقَوْلِ. [البخاري/ الأطعمة/ ٥١٣٨]

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە لە (مَرَّ الظهران)[1]دا لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، خەریکی ڕنینی بەری داری ئەراك[2] بووین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( ڕەشەکەی بڕنن)) ئێمەش وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەروەك شوانی مەڕ بووبیت؟ فەرمووی: ((بەڵێ ، ئایا پێغەمبەرێ هەیە شوانێتی مەڕی نەکردبێ)) یان شتێکی وای فەرموو.

## ( ٢٠ ) خواردنی گۆشتی کەروێشك

١٢٦٤ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: مَرَرْنَا فَاسْتَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَوْا عَلَيْهِ فَلَغَبُوا، قَالَ: فَسَعَيْتُ حَتَّى أَدْرَكْتُهَا، فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا، فَبَعَثَ بِوَرِكِهَا وَفَخِذَيْهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَتَيْتُ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَبِلَهُ. [البخاري/ الهبة/ ٢٤٣٣]

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆیشتین و لە (مرَّ الظهران) کەروێشکێکمان لە شوێنی خۆی هەڵسان، خەڵکی ڕایان کرد بەدوایدا بیگرن، ماندوو بوون، منیش ڕامکرد بە دوایدا هەتا گەیشتمە سەری و گرتم، هێنام بۆ لای (أبو طلحة) و سەری بڕی، سمتە جوڵەکەی و هەردوو ڕانی نارد بۆ پێغەمبەری خواو (ﷺ) منیش هێنام بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وەری گرت.

## ( ٢١ ) خواردنی گۆشتی بزن مژە

١٢٦٥ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ (ﷺ) -الَّذِي يُقَالُ لَهُ سَيْفُ اللَّهِ- أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَهِيَ خَالَتُهُ وَخَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَوَجَدَ عِنْدَهَا ضَبًّا مَحْنُوذًا، قَدِمَتْ بِهِ أُخْتُهَا حُفَيْدَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ مِنْ نَجْدٍ، فَقَدَّمَتِ الضَّبَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَكَانَ قَلَّمَا يُقَدِّمُ

---

[1] مرَّ الظهران: شوێنێکی نزیکە لە مەککەوە

[2] داری ئەراك : ئەو درەختەیە سیواکی لێ دروست دەکرێت.

إِلَيْهِ طَعَامٌ حَتَّى يُحَدَّثَ بِهِ وَيُسَمَّى لَهُ، فَأَهْوَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَدَهُ إِلَى الضَّبِّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنَ النِّسْوَةِ الْحُضُورِ: أَخْبِرْنَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بِمَا قَدَّمْتُنَّ لَهُ، قُلْنَ: هُوَ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: أَحَرَامٌ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((لَا، وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ)). قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَنْظُرُ فَلَمْ يَنْهَنِي. [البخاري/ الأطعمة/ ٥٠٧٦]

(عبدالله) کوڕی (عباس) (ﷺ) دەڵێ: (خالد) کوڕی (ولید) (ﷺ) -کە پێی دەوترا شمشێری خوا- هەواڵی پێداوە، کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چوو بۆلای (میمونە)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) کە پووری ئەو و (ابن عباس) بوو لەدایکەوە، بزن مژەیەکی برژاوی لەلای بینی، کە (حفیدة) کچی (حارث)ی خوشکی لە (نەجدە)وە بۆی هێنابوو، (میمونە) بزن مژەکەی خستە بەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کە بەدەگمەن خواردنێکی بخرایەتە بەردەم هەتا باسی بۆ نەکرایە و ناوی نەبرایە بۆی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی برد بۆ بزن مژەکە، یەکێ لەو ئافرەتانەی کە لەوێدا ئامادەبوون وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداربکەن بەوەی کە بۆتان داناوە، وتیان خواردنەکە بزن مژەیە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی کێشایەوە، ئینجا (خالد) کوڕی (ولید) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ بزن مژە حەرامە؟ فەرمووی: ((نەخێر، بەڵام لەخاکی قەومەکەی مندا نەبووە، بۆیە دەبینی دڵم ناچێتە سەری)). خالد وتی: لەتم کرد و خواردم، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) سەیری کردم وڕێگری لێنەکردم.

١٢٦٦ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (ﷺ): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي فِي غَائِطٍ مَضَبَّةٍ وَإِنَّهُ عَامَّةُ طَعَامِ أَهْلِي. قَالَ: فَلَمْ يُجِبْهُ، فَقُلْنَا: عَاوِدْهُ، فَعَاوَدَهُ، فَلَمْ يُجِبْهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ نَادَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي الثَّالِثَةِ فَقَالَ: ((يَا أَعْرَابِيُّ، إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ -أَوْ: غَضِبَ- عَلَى سِبْطٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَمَسَخَهُمْ دَوَابَّ يَدِبُّونَ فِي الْأَرْضِ، فَلَا أَدْرِي لَعَلَّ هَذَا مِنْهَا، فَلَسْتُ آكُلُهَا وَلَا أَنْهَى عَنْهَا)).

(ابو سعید) (ﷺ) دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وتی: نیشتەجێی شیو و دۆڵێکم کە بزن مژەی زۆرە و خۆراکی زۆرینەی خەڵکی لای ئێمەیە، وەڵامی نەدایەوە، وتمان: لێی دووبارە بکەرەوە، لێی

دووبارە كردەوە، تا سێ‌جار وەڵامی نەدایەوە. پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجاری سێیەمدا بانگی كرد و فەرمووی: ((ئەی دەشتەكی، خوا نەفرینی كردوە –یان: تورە بووە– لە تیرەیەكی (بنو اسرائیل)، لە ئادەمیی سرپیونیەتەوە و كردوونی بەیەكێ لەو گیاندارانەی سەرزەوی كەدێن و دەچن بەسەریدا، نازانم لەوانەیە ئەم بزن مژەیە لەوانە بێت. من نەدەیخۆم و نەرێگری خواردنیشی دەكەم)).

## ( ٢٢ ) خواردنی كوللە

١٢٦٧ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ نَأْكُلُ الْجَرَادَ. [البخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥١٧٦]

(عبدالله) كوڕی (أبو أوفی) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەوت جەنگمان كردووە و كوللەمان خواردووە.

## ( ٢٣ ) خواردنی گیانداری دەریایی و ئەوەی دەریا فڕێی دەدا

١٢٦٨ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، وَأَمَّرَ عَلَيْنَا أَبَا عُبَيْدَةَ، نَتَلَقَّى عِيرًا لِقُرَيْشٍ، وَزَوَّدَنَا جِرَابًا مِنْ تَمْرٍ لَمْ يَجِدْ لَنَا غَيْرَهُ، فَكَانَ أَبُو عُبَيْدَةَ يُعْطِينَا تَمْرَةً تَمْرَةً، قَالَ: فَقُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِهَا؟ قَالَ: نَمَصُّهَا كَمَا يَمَصُّ الصَّبِيُّ، ثُمَّ نَشْرَبُ عَلَيْهَا مِنَ الْمَاءِ، فَتَكْفِينَا يَوْمَنَا إِلَى اللَّيْلِ، وَكُنَّا نَضْرِبُ بِعِصِيِّنَا الْخَبَطَ، ثُمَّ نَبُلُّهُ بِالْمَاءِ فَنَأْكُلُهُ، قَالَ: وَانْطَلَقْنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ فَرُفِعَ لَنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ كَهَيْئَةِ الْكَثِيبِ الضَّخْمِ، فَأَتَيْنَاهُ فَإِذَا هِيَ دَابَّةٌ تُدْعَى الْعَنْبَرَ، [قَالَ]: قَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: مَيْتَةٌ، ثُمَّ قَالَ: لَا، بَلْ نَحْنُ رُسُلُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَقَدِ اضْطُرِرْتُمْ فَكُلُوا. قَالَ: فَأَقَمْنَا عَلَيْهِ شَهْرًا، وَنَحْنُ ثَلَاثُ مِائَةٍ، حَتَّى سَمِنَّا. قَالَ: وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا نَغْتَرِفُ مِنْ وَقْبِ عَيْنِهِ بِالْقِلَالِ الدُّهْنَ، وَنَقْتَطِعُ مِنْهُ الْقَدَرَ كَالثَّوْرِ، أَوْ كَقَدْرِ الثَّوْرِ، فَلَقَدْ أَخَذَ مِنَّا أَبُو عُبَيْدَةَ ثَلَاثَةَ عَشَرَ رَجُلًا فَأَقْعَدَهُمْ فِي وَقْبِ عَيْنِهِ، وَأَخَذَ ضِلَعًا مِنْ أَضْلَاعِهِ فَأَقَامَهَا، ثُمَّ رَحَلَ أَعْظَمَ بَعِيرٍ مَعَنَا، فَمَرَّ مِنْ تَحْتِهَا. وَتَزَوَّدْنَا مِنْ لَحْمِهِ وَشَائِقَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: ((هُوَ رِزْقٌ أَخْرَجَهُ اللَّهُ لَكُمْ، فَهَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ فَتُطْعِمُونَا)). قَالَ: فَأَرْسَلْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنْهُ فَأَكَلَهُ. [البخاري/ المغازي/ ٤١٠٢-٤١٠٤]

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردینی بۆ جەنگ و أبو عبیدەی کردە فەرماندەمان، بەدوای کاروانی قورەیشدا دەگەڕاین، توێشە بەرەیەك لە خورمای کردە توێشومان و هیچی تری لا نەبوو بۆمان جگە لەوە، (أبو عبیدە) دەنکە خورمای دەداینێ. منیش وتم: ئەی ئێوە چیتان لێدەکرد؟ وتی: دەمانمژی هەروەك چۆن منداڵ دەیمژێ، پاشان ئاومان دەخواردەوە بەسەریدا، ئەو ڕۆژە تا شەوەکەی بەشی کردین، بەدارەکانی دەستمان گەڵای دارمان دەوەراند، پاشان بەئاو تەڕمان دەکرد و دەمانخوارد، بەکەناری دەریاکەدا ڕۆیشتین، لەکەناری دەریاکە تارمایی یەکمان دی وەکو تەپۆڵکە وابوو کە گەیشتینە لای سەیردەکەین گیاندارێکە پێی دەوترا (عَنبَر) أبو عبیدە وتی: ئەوە مرداربوەیە، پاشان وتی:نەخێر بەڵکو ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ین و لە پێناوی خوادا هاتووین، بەڕاستی ناچاربووین بیخۆن، وتی: ئێمە کە سێسەد کەس بووین یەك مانگ لەسەری ماینەوە هەتا قەڵەو بووین، وتی: ئێمەت ببینیایە لە چاڵی چاویدا بە گۆزەی گەورە ڕۆنمان هەڵدەگۆزی، پارچە گۆشتمان لێدەبڕی ، یان بەقەدەر گایەك دەبوو، (أبو عبیدة) سیانزە پیاوی لێبردین و لە چاڵی چاویدا داینیشاندن، پەراسویەکی لێهەڵگرت و دایچەقاند، پاشان گەورەترین حوشترێ کە پێمان بوو بردی بەژێریدا ، لە گۆشتەکەی زۆرێکمان لێزەرد کرد و کردمانە توێشوی (ڕێ) کاتێ گەڕاینەوە مەدینە، هاتینە خزمەتی پێغەمبەری خواو (ﷺ) ئەو باسەمان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ((ئەوە ڕزقێکە خوا بۆ ئێوەی هێناوەتە دەرێ، ئایا شتێك لە گۆشتەکەیتان پێیە بیدەنە دەرخواردمان)). وتی: لە گۆشتەکەیمان نارد بۆ پێغەمبەری خواو (ﷺ) خواردی.

## ( ٢٤ ) خواردنی گۆشتی ئەسپ

١٢٦٩ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ، وَأَذِنَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ. [البخاري/ المغازي/ ٣٩٨٢]

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی (خیبر)دا ڕێگری کرد لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی، مۆڵەتی دا بە خواردنی گۆشتی ئەسپ.

١٢٧٠ـ عَنْ أَسْمَاءَ (ﷺ) قَالَتْ: نَحَرْنَا فَرَسًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَكَلْنَاهُ. [بخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٠٠]

(اسماء) (ﷺ) دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەسپێکمان سەربڕی و خواردمان.

## ( ٢٥ ) ڕێگریی لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی

١٢٧١ـ عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ (ﷺ) قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لُحُومَ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ. [بخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٠٦]

(أبو ثعلبة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەرام کردووە.

١٢٧٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَيْبَرَ، أَصَبْنَا حُمُرًا خَارِجًا مِنَ الْقَرْيَةِ فَطَبَخْنَا مِنْهَا، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): أَلَا إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْهَا، فَإِنَّهَا رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ. فَأُكْفِئَتِ الْقُدُورُ بِمَا فِيهَا وَإِنَّهَا لَتَفُورُ بِمَا فِيهَا. [بخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٠٨]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەیبەری ڕزگار کرد، لەدەرەوەی گوندەکە چەند گوێدرێژێك کەوتنە دەستمان و، هەندێکمان لێکولاند، بانگکەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کرد: ئاگاداربن ، ئەوە خواو پێغەمبەرەکەی ڕێگریتان دەکەن لەوە، ئەوە زۆر پیسە و لەکاری شەیتانە، مەنجەڵەکان سەرەونخون کرانەوە بەوەی کە تیایاندا بوو، لە کاتێکدا کە قوڵپەی کولانیان دەهات.

## ( ٢٦ ) ڕێگری لە خواردنی دڕندەی کەڵبەدار

١٢٧٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار خواردنی حەرامە)).

## ( ٢٧ ) ڕێگری لە خواردنی هەموو باڵندەیەکی چنگ تیژ

١٢٧٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَ[عَنْ] كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ.

(ابـن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕێگریـی کـردووە لـە (خواردنی گۆشتی) هـەموو دڕندەیـەکی کەڵبـەدار و هـەموو باڵندەیـەکی چنـگ تیژ.

## ( ٢٨ ) خواردنی سی چاك نییە

١٢٧٥ـ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَزَلَ عَلَيْهِ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي السُّفْلِ، وَأَبُو أَيُّوبَ فِي الْعِلْوِ، [قَالَ]: فَانْتَبَهَ أَبُو أَيُّوبَ لَيْلَةً فَقَالَ: نَمْشِي فَوْقَ رَأْسِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)؟ فَتَنَحَّوْا فَبَاتُوا فِي جَانِبٍ، ثُمَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَـالَ النَّبِـيُّ (ﷺ): ((السُّفْلُ أَرْفَقُ)). فَقَالَ: لَا أَعْلُو سَقِيفَةً أَنْتَ تَحْتَهَا، فَتَحَوَّلَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي الْعُلُوِّ وَأَبُو أَيُّوبَ فِي السُّفْلِ، فَكَانَ يَصْنَعُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) طَعَامًا، فَإِذَا جِيءَ بِهِ إِلَيْهِ سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِهِ، فَيَتَتَبَّعُ مَوْضِعَ أَصَابِعِهِ، فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا فِيهِ ثُومٌ، فَلَمَّا رُدَّ إِلَيْهِ سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقِيلَ لَهُ: لَمْ يَأْكُلْ، فَفَزِعَ، وَصَعِدَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَحَرَامٌ هُوَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((لَا، وَلَكِنِّي أَكْرَهُهُ)). قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَهُ مَا تَكْرَهُ، أَوْ: مَا كَرِهْتَ. قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُؤْتَى.

لە(ابو ایوب)ەوە (ﷺ): کە پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵی ئـەو دابـەزی، پێغەمبـەر (ﷺ) لەقاتی خوارەوە نیشتەجێبوو، (ابو ایوب) یـش لـەقاتی سەرەوە: شەوێك (ابو ایوب) بە ئاگاهات و وتی: ئێمە بەسەر سەری پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ)، هاتووچۆ بکەین؟ چوونە سوچێکەوە و لەوێ ئەو شەوەیان بردە سەر، پاشان بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: ((خـوارەوە ئاسـانترە)) وتـی: سەرناکەومە سەربانێك تۆ لەژێریدا بیت، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) گواستیەوە بۆ قـاتی سـەرەوە و (ابـو ایـوب) یـش هاتـە خـوارەوە، هـەموو جـارێ خواردنـی دروستدەکرد بۆ پێغەمبـەر (ﷺ)، هەر کە خواردنەکەی بهێنایە بۆی پرسیاری دەکرد لە شوێنی پەنجەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، دواتـر ئەویش لـە جێپەنجەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیخوارد، جارێکیان خواردنێکی بۆ دروست کرد کـە سیری تێدابوو، کاتێ بۆی گەڕایەوە پرسیاری کرد لـە جێگـە پەنجـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ)،پێی وتـرا، نـەیخوارد، (ابـو ایـوب) ترسـا و شـڵەژا و چـووە سـەرەوە بـۆ خزمەتی و عەرزی کرد: ئایا حەرامە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((نەخێر، بەڵکو من خۆشیم لێی‌نایە)). ئەویش وتی: منیش خۆشم نایە لـەوەی کە تۆ خۆشت

لێی نایە ، خۆشت لێی‌نەهات : لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەحی بۆهات (حەزیشی نەدەکرد کەلەوکاتەدا بۆنی دەمی ناخۆش بێت).

## ( ٢٩ ) عەیبدارنەکردنی خواردن

١٢٧٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَابَ طَعَامًا قَطُّ، كَانَ إِذَا اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ لَمْ يَشْتَهِهِ سَكَتَ. [البخاري/ المناقب/ ٣٣٧٠]

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەبینیوە کە خواردنێ عەیبدار بکات، ئەگەر حەزی لێبکردایە دەیخوارد، ئەگەر حەزیشی لێنەکردایە بێدەنگ دەبوو.

# (٤١) بەشی پۆشاك و رازاوەیی

## (١) ئەو پیاوەی لە دونیادا ئاوریشم دەپۆشێ لەو دونیادا بێبەشە

١٢٧٧ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: رَأَى عُمَرُ بن الخطاب (ﷺ) عُطَارِدًا التَّمِيمِيَّ يُقِيمُ بِالسُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، وَكَانَ رَجُلًا يَغْشَى الْمُلُوكَ وَيُصِيبُ مِنْهُمْ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَأَيْتُ عُطَارِدًا يُقِيمُ فِي السُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، فَلَوِ اشْتَرَيْتَهَا فَلَبِسْتَهَا لِوُفُودِ الْعَرَبِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، وَأَظُنُّهُ قَالَ: وَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ)). فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِحُلَلٍ سِيَرَاءَ، فَبَعَثَ إِلَى عُمَرَ بِحُلَّةٍ، وَبَعَثَ إِلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ بِحُلَّةٍ، وَأَعْطَى عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) حُلَّةً وَقَالَ: ((شَقِّقْهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ)). قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ بِحُلَّتِهِ يَحْمِلُهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَعَثْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ، وَقَدْ قُلْتَ بِالْأَمْسِ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ؟ فَقَالَ: ((إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ بِهَا إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنِّي بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُصِيبَ بِهَا)). وَأَمَّا أُسَامَةُ فَرَاحَ فِي حُلَّتِهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) نَظَرًا عَرَفَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ أَنْكَرَ مَا صَنَعَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَنْظُرُ إِلَيَّ، فَأَنْتَ بَعَثْتَ إِلَيَّ بِهَا؟ فَقَالَ: ((إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنِّي بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُشَقِّقَهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ)). [البخاري/ الهبة/ ٢٤٧٠]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: (عمر) كوڕی (خطاب) (ﷺ) (عطاردی تمیمي) لە بازاڕدا بیبینی، كە قاتێكی ئاوریشمی خەتـ خەتی خستبووە سەرسەودا، (عطارد) پیاوێ بوو سەردانی پادشایانی دەكرد و دەست كەوتی لێیان دەبوو، (عمر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (عطارد)م بینی لەبازاڕدا قاتێكی ئاوریشمی خەت خەتی خستبووە سەر سەودا، خۆزگایە لێت بكڕیایە و لەوكاتانەدا كە نوێنەری تیرەكانی عەرەب دەهاتنە خزمەتت لەبەرت بكردایە، وا بزانم وتی: رۆژی جومعەش لەبەرت بكردایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((كەسێ لە دونیادا ئاوریشم دەپۆشێ؛ كەلە رۆژی دواییدا بێبەش بێت لێی)) لە دوای ئەوەوە چەند قاتێكی لەو جۆرە هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) قاتێكی نارد بۆ (عمر)، قاتێكی تری نارد بۆ (اسامة)ی كوڕی (زید)، قاتێكیشی دابە (علي) كوڕی (ابو طالب) (ﷺ) و، فەرمووی: (( پارچە پارچەی

بکە بۆ سەرپۆش و دابەشی بکە لەنێوان هاوسەرەکانتا)). دەڵێ: (عمر) قاتەکەی خۆی هەڵگرتبوو و هات، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەمەت ناردووە بۆم، دوێنێ لەسەر قاتەکەی (عطارد)یش ئەوەت فەرموو کە فەرمووت؟ فەرمووی: ((من بۆ ئەوە بۆم نەناردویت کە لەبەری بکەیت، بەڵکو بۆ ئەوە بۆم ناردوویت کە سوودی لێببینیت)). بەڵام (أسامة) قاتەکەی لەبەرکردوو هات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەیرکردنێ سەیری (أسامة)ی کرد، زانی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردەوەکەی پێناخۆش بووە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی‌یە واسەیرم دەکەیت، تۆ خۆت ناردوتە بۆم؟ فەرمووی: ((من بۆ ئەوە بۆم نەناردویت کەلەبەری بکەیت، بەڵکو بۆم ناردوویت تا پارچە پارچەی بکەی بۆسەرپۆش و دابەشی بکەیت لە نێوان ژنەکانتا)).

## ( ٢ ) هەر کەس لە دونیادا ئاوریشم لەبەربکات لە رۆژی دواییدا لەبەری ناکات

١٢٧٨ـ عَنْ خَلِيفَةَ بْنِ كَعْبٍ [أَبِي ذِبْيَانَ] قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ يَخْطُبُ يَقُولُ: أَلَا لَا تُلْبِسُوا نِسَاءَكُمُ الْحَرِيرَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ مَنْ لَبِسَهُ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الْآخِرَةِ)). [البخاري/ اللباس/ ٥٤٩٢]

(خلیفە) کوڕی (كعب) (أبو ذبیان) دەڵێ: گوێم لێبوو (عبدالله)ی کوڕی (زبیر) وتاری دەدا و دەیوت: وریا بن نەکەن ئاوریشم بکەنە بەر ژنەکانتان، من لە (عمر) کوڕی (الخطاب)م بیستوە دەیوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئاوریشم لەبەرمەکەن، هەر کەس لە دونیادا لەبەری بکات لە رۆژی دوایدا لەبەری ناکات))[1].

## ( ٣ ) بۆ لە خواترسان شیاونی‌یە ئاوریشمی درزدار لەبەر بکەن

١٢٧٩ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَرُّوجُ حَرِيرٍ، فَلَبِسَهُ ثُمَّ صَلَّى فِيهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا كَالْكَارِهِ لَهُ، ثُمَّ قَالَ: ((لَا يَنْبَغِي هَذَا لِلْمُتَّقِينَ)). [البخاري/ الصلاة في الثياب/ ٣٦٨]

---

[1] پێشەوا نەوەوی: ئەوە مەزهەبی (ابن الزبیر)ە ، زانایان هاودەنگن کە ئاوریشم حەڵاڵە بۆ ئافرەت، فەرموودەی پێشووتر بەڵگەیە لەسەرئەوە.

(عقبة) کوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: پۆشاکێکی ئاوریشمی لەدواوە درزدار کرایە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەبەری کرد و پاشتر نوێژیشی پێوە کرد، کە لە نوێژەکەی بویەوە زۆر بە توندی و بەپەلە لەبەری خۆی دایماڵی وەك یەکێ کە حەزی پێنەکات، پاشان فەرمووی: ((ئەمە بۆ لەخواترسان شیاونیە)).

## ( ٤ ) ڕێگری لە پۆشینی ئاوریشم بە ئەندازەی دوو پەنجە نەبێ

١٢٨٠ـ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ (ﷺ) وَنَحْنُ بِأَذْرَبِيجَانَ: يَا عُتْبَةَ بْنَ فَرْقَدٍ، إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ كَدِّكَ وَلَا مِنْ كَدِّ أَبِيكَ وَلَا مِنْ كَدِّ أُمِّكَ، فَأَشْبِعِ الْمُسْلِمِينَ فِي رِحَالِهِمْ مِمَّا تَشْبَعُ مِنْهُ فِي رَحْلِكَ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَعُّمَ وَزِيَّ أَهْلِ الشِّرْكِ وَلَبُوسَ الْحَرِيرِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ لَبُوسِ الْحَرِيرِ قَالَ: إِلَّا هَكَذَا، وَرَفَعَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِصْبَعَيْهِ الْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةَ وَضَمَّهُمَا. قَالَ زُهَيْرٌ: قَالَ عَاصِمٌ: هَذَا فِي الْكِتَابِ، قَالَ: وَرَفَعَ زُهَيْرٌ إِصْبَعَيْهِ. [البخاري/ اللباس/ ٥٤٩٢]

(أبو عثمان) دەڵێ: ئێمە لە ئازربایجان بووین (عمر) (ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسین کە: ئەی (عُتبة) کوڕی (فرقد) ئەوە نەبەرهەمی ڕەنجی خۆتە و نەڕەنجی باوکتە و نەڕەنجی دایکتە، موسڵمانان تێربکە لە نێوماڵەکانیاندا هەرلەوە کە خۆتی لێتێر دەکەیت لە ماڵەکەتدا، وریابن نەکەن بەژیانی ناسکی بژین و، پۆشاکی خەڵکانی بێباوەڕ و ئاوریشم، لەبەر بکەن، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردوە لە پۆشینی ئاوریشم، وتی: مەگەر بەم شێوەیە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو پەنجەی شەهادەت و ناوەڕاستی بەرز کردەوە و خستنیە پاڵ یەك، (زهیر) دەڵێ: (عاصم) وتی: ئەمە لەنامەکە دابوو، زهیریش هەردوو پەنجەی بەرز کردەوە.

١٢٨١ـ عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) خَطَبَ بِالْجَابِيَةِ فَقَالَ: نَهَى نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، إِلَّا مَوْضِعَ إِصْبَعَيْنِ أَوْ ثَلَاثٍ أَوْ أَرْبَعٍ.

(سوید) کوڕی (غفلة) دەڵێ: (عمر) کوڕی (خطاب) (ﷺ) لە (جابیة)[1] وتاری داو وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لە پۆشینی ئاوریشم، مەگەر بە ئەندازەی دووپەنجە یان سێپەنجە یان چوار پەنجە.

---

[1] الجابیة: شوێنێکە لەوڵاتی شام لە سوریە

## (٥) ڕێگری كردن لەلەبەركردنی كەوای ئاوریشم (دیباج)

١٢٨٢ـ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: لَبِسَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَوْمًا قَبَاءً مِنْ دِيبَاجٍ أُهْدِيَ لَهُ، ثُمَّ أَوْشَكَ أَنْ نَزَعَهُ، فَأَرْسَلَ بِهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه)، فَقِيلَ لَهُ: قَدْ أَوْشَكَ مَا نَزَعْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: ((نَهَانِي عَنْهُ جِبْرِيلُ (عليه السلام))). فَجَاءَهُ عُمَرُ [(رضي الله عنه)] يَبْكِي، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَرِهْتَ أَمْرًا وَأَعْطَيْتَنِيهِ، فَمَا لِي؟ قَالَ: ((إِنِّي لَمْ أُعْطِكَهُ لِتَلْبَسَهُ، إِنَّمَا أَعْطَيْتُكَهُ تَبِيعُهُ)). فَبَاعَهُ بِأَلْفَيْ دِرْهَمٍ.

(جابر) كوڕی (عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێ كەوایەكی ئاوریشمی لەبەر كرد كە بە دیاری بۆی هاتبوو، پاشان زۆری پێنەچوو دایكەند لەبەری و، ناردی بۆ (عمر) كوڕی (خطاب) (رضي الله عنه)، عەرزی پێغەمبەر كرا: بەڕاستی زوو داتكەند ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((جبریل (عليه السلام) ڕێگری لێكردم لەبەری بكەم)). عمر (رضي الله عنه) هاتە خزمەتی و دەگریا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێكت بەلاوە خراپ بووە و داوتە بەمن، ئەوە من چیمە؟ فەرمووی: ((من بۆ ئەوە پێم نەداویت لەبەری بكەیت، بۆئەوە پێم داویت كە بیفرۆشیت)). فرۆشتی بە دوو هەزار درهەم.

## (٦) مۆڵەت دان بە پۆشینی ئاوریشم بۆ نەخۆشی

١٢٨٣ـ عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، فِي الْقُمُصِ الْحَرِيرِ فِي السَّفَرِ، مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا أَوْ وَجَعٍ كَانَ بِهِمَا. وفي رواية: شكوا الى رسول الله القمل. [البخاري/ الجهاد/ ٢٧٦٢]

(انس) كوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی دا بە (عبدالرحمن) كوڕی (عوف) و، (زبیر) كوڕی (عوام)، بە پۆشینی كراسی ئاوریشم لەسەفەردا، لەبەر خوراندنێ یان ئازارێ كە پێیانەوە بوو لە ڕیوایەتێكدا: لەتاو ئەسپێ سكالایان گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

## (٧) مۆڵەتدان بە پۆشینی یەخەی ئاوریشمی دیباجی

١٢٨٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ،وَكَانَ خَالَ وَلَدِ عَطَاءٍ قَالَ: أَرْسَلَتْنِي أَسْمَاءُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه)، فَقَالَتْ: بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَرِّمُ أَشْيَاءَ ثَلَاثَةً: الْعَلَمَ فِي الثَّوْبِ، وَمِيثَرَةَ الْأُرْجُوَانِ، وَصَوْمَ رَجَبٍ كُلِّهِ؟ فَقَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ: أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ رَجَبٍ فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ الْأَبَدَ؟ وَأَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنَ الْعَلَمِ فِي الثَّوْبِ: فَإِنِّي سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ:

((إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ)). فَخِفْتُ أَنْ يَكُونَ الْعَلَمُ مِنْهُ. وَأَمَّا مِيثَرَةُ الْأُرْجُوَانِ: فَهَذِهِ مِيثَرَةُ عَبْدِ اللَّهِ فَإِذَا هِيَ أُرْجُوَانٌ. فَرَجَعْتُ إِلَى أَسْمَاءَ فَخَبَّرْتُهَا، فَقَالَتْ: هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَخْرَجَتْ إِلَيَّ جُبَّةَ طَيَالِسَةٍ كِسْرَوَانِيَّةٍ، لَهَا لِبْنَةُ دِيبَاجٍ، وَفَرْجَيْهَا مَكْفُوفَيْنِ بِالدِّيبَاجِ، فَقَالَتْ: هَذِهِ كَانَتْ عِنْدَ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) حَتَّى قُبِضَتْ، فَلَمَّا قُبِضَتْ قَبَضْتُهَا، وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَلْبَسُهَا، فَنَحْنُ نَغْسِلُهَا لِلْمَرْضَى يُسْتَشْفَى بِهَا.

(عبدالله)ی كارگوزاری (أسماء)ی كچی (أبو بكر)، كە خاڵۆی منداڵەكانی (عطاء) بوو دەڵێ: (أسماء) ناردمی بۆ لای (عبدالله) كوڕی (عمر) (رضي الله عنه) پێی بڵێم كە اسماء دەڵێت: پێم گەیشتوە كە تۆ سێ شت بە حەرام دەزانی: هێڵی ئاوریشم لە پۆشاكدا، هەروەها نەرمەزینی ئەرخەوانی، ڕۆژوو گرتنی هەموو مانگی ڕەجەب؟ (عبدالله) پێی وتم: ئەوەی باست كرد لە ڕۆژووگرتنی هەموو ڕەجەب ، ئەی چی دەكەیت لەوە كە هەموو تەمەنی بەڕۆژوو دەبێت؟ ئەوەش باست كرد لە هێڵی ئاوریشم لە پۆشاكدا: من لە (عمر) كوڕی (خطاب)م (رضي الله عنه) بیستوە كە دەیوت: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستوە دەیفەرموو: ((كەسێ ئاوریشم لەبەر دەكات كە (لەڕۆژی دواییدا) بەشی نەبێ)) ترسام هێڵی ئاوریشمی هەر لەو بێت، بەڵام نەرمەزینی ئەرخەوانی: ئەوە نەرمەزینەكەی عبدالله یە، كە بینیم ئەرخەوانی بوو، گەڕامەوە بۆلای (أسماء) وهەواڵەكەم پێدا، ئەویش وتی: ئەوە جبەكەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) جبەیەكی كڵاوداری كیسروانی بۆ دەرهێنام، یەخەكەی دیباجی هەبوو، هەردوو لای بەرۆكەكانی گیرابۆوە بە ئاوریشم، أسماء وتی: ئائەمە لەلای (عائشة) بوو هەتا كۆچی دوایی كرد، كە ئەو كۆچی دوایی كرد هێنامە لای خۆم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەری دەكرد، ئێستە ئێمەش دەیشۆین بۆ نەخۆشەكان تا شیفایان بۆ بێت.

### ( ٨ ) پارچە پارچە كردنی ئاوریشم بۆ سەرپۆش

١٢٨٥ـ عَنْ عَلِيٍّ [بن ابي طالب] (رضي الله عنه): أَنَّ أُكَيْدِرَ دُومَةَ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) ثَوْبَ حَرِيرٍ، فَأَعْطَاهُ عَلِيًّا [كرم الله وجهه]، فَقَالَ: ((شَقِّقْهُ خُمُرًا بَيْنَ الْفَوَاطِمِ)).
[البخاري/ الهبة/ ٢٤٧٢]

(علي) كورِی (أبو طالب) (ﷺ) دەڵـێ: فـەرمانڕەوای (دومـة)[٢] پۆشـاكێكی ئاوریشـمی بەدیاری ناردبوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبـەری خوا (ﷺ) دای بـە علي {كرم الله وجهه} فەرمووی: ((پارچە پارچەی بكە بۆ سـەرپۆش و دابەشـی بكـە لـەنێوان (فاطمـة)كـاندا))[(فاطمـەی خـێزانیو فاطمەی دایكـیو فاطمـەی براژنی))].

## (٩) ڕێگریی لە پۆشینی كەتـانی ئـاوریشمی دارو زەرد كراوو ئەنگوستیلەی ئـاڵتون

١٢٨٦ـ عَنْ عَلِيِّ ابْنِ أَبِي طَـالِبٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَـهَى عَـنْ لُبْـسِ الْقَسِّيِّ، وَالْمُعَصْفَرِ، وَعَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الرُّكُوعِ.

(علي) كورِی (أبو طالب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگریی كردووە لـە پۆشـینی كـەتانی ئاوریشـمدار و زەرد كـراو، هـەروەها لەپەنجـە كردنـی ئەنگوستیلەی ئاڵتون، هەروەها خوێندنی قورئان لە ركوع دا.

١٢٨٧ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَيَّ ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ، فَقَالَ لِي: ((إِنَّ هَذِهِ مِنْ ثِيَابِ الْكُفَّارِ، فَلَا تَلْبَسْهَا)).

(عبدالله) كورِی (عمرو)ی كورِی (عاص) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دووپۆشاكی زەرد كراو بە ڕووەكی (عَصفر)ی لەبەرمدا بینـی، فەرمووی پێم: ((ئەمانە لە پۆشاكی بێباوەڕانن، لەبەریان مەكە)).

## (١٠) ڕێگریی كردن لە ڕەنگ كردنی پۆشاك بە زەعفەران

١٢٨٨ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ.

(انـس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕێگـری كـردوە لـە پیـاو كـە پۆشاكەكەی بە زەعفەران ڕەنگ بكات.

## (١١) ڕەنگ كردنی قژو گۆڕینی مووی سپی

١٢٨٩ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ (ﷺ) يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ، وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((غَيِّرُوا هَـذَا بِشَـيْءٍ، وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ)).

[٢] دومة: شارۆچكەیەكە لە نێوان شام و مەدینەدا.

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە، (أبو قحافة) هێنرا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، سەروورپیشی وەك درەختی (ثغامة)سپی بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمە بگۆڕن بە ڕەنگێکی تر و، دووریش بکەونەوە لە ڕەنگی ڕەش)).

## (١٢) پێچەوانەی جوولەکە و گاوران بن لە ڕەنگ کردندا

١٢٩٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ، فَخَالِفُوهُمْ)). [البخاري/ الانبياء/ ٣٢٧٥]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((جوولەکە و گاوران بۆیاخ ناکەن ئێوە پێچەوانەیئەوان بکەن)).

## (١٣) پۆشاکی سەوزی ڕازاوە

١٢٩١ـ عَنْ قَتَادَةُ قَالَ: قُلْنَا لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَيُّ اللِّبَاسِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ أَوْ: أَعْجَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: الْحِبَرَةُ. [البخاري/ اللباس/ ٥٤٧٥]

(قتادة) دەڵێ: بە (انس) کوڕی (مالك)مان (ﷺ) وت: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەزی لە چ پۆشاکێك بوو؟ یان: لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کام جۆری جلوبەرگ باشتر بوو؟ وتی: پۆشاکی سەوزی نەخشدار.

## (١٤) پۆشاکی مەرەزی نەخشدار

١٢٩٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) ذَاتَ غَدَاةٍ، وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ مِنْ شَعَرٍ أَسْوَدَ.

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەیانییەکیان چووە دەرەوە و، پۆشاکێکی مەرەزی نەخشداری لە مووی ڕەش دروستکراوی پۆشی بوو.

## (١٥) لەبەرکردنی کراسی ئەستور و پۆشاکی پارچە لێدراو

١٢٩٣ـ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ)، فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ، وَكِسَاءً مِنَ الَّتِي يُسَمُّونَهَا الْمُلَبَّدَةَ، قَالَ: فَأَقْسَمَتْ بِاللَّهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قُبِضَ فِي هَذَيْنِ الثَّوْبَيْنِ.

(ابو بُردة) دەڵێ: چوومە لای عائشە (ﷺ) کراسێکی ئەستوری بۆدەرهێناین لەوەی کە لەیەمەن دروست دەکرێ، هەروەها پۆشاکێکیتر کە پێیان دەوت

(المُلَبدة) {پارچە لێدراو}، وتی: عائشە سوێندی خوارد بە خوای گەورە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو دوو پۆشاکەدا گیانی کێشرا.

## (١٦) ڕاخەری نەرم و نۆڵ

١٢٩٤ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجْتُ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَتَّخَذْتَ أَنْمَاطًا)). قُلْتُ: وَأَنَّى لَنَا أَنْمَاطٌ؟ قَالَ: ((أَمَا إِنَّهَا سَتَكُونُ)). قَالَ جَابِرٌ: وَعِنْدَ امْرَأَتِي نَمَطٌ، فَأَنَا أَقُولُ: نَحِّيهِ عَنِّي، وَتَقُولُ: قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّهَا سَتَكُونُ)). [البخاري/ المناقب/ ٣٤٣٢]

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ کە ژنم هێنا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی‌پێم: ((ئایا ڕاخەری نەرم و نۆڵت ئامادە کردووە)). وتم: ڕاخەری نەرممان لە کوێ بوو؟ فەرمووی: ((بەڵام لەمەولا پەیدا دەبێت)). جابر وتی: خێزانەکەم ڕاخەرێکی نەرمی لابوو، من دەمووت: دووری خەرەوە لێم، ئەویش دەیووت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((پەیدا دەبێت)).

## (١٧) ڕاخەر بە ئەندازەی پێویست

١٢٩٥ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لَهُ: ((فِرَاشٌ لِلرَّجُلِ، وَفِرَاشٌ لِامْرَأَتِهِ، وَالثَّالِثُ لِلضَّيْفِ، وَالرَّابِعُ لِلشَّيْطَانِ.

لە (جابر) کوڕی (عبدالله)وە (ﷺ): کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووە: ((ڕاخەرێ بۆ پیاوەکە و، ڕاخەرێ بۆ خێزانەکەی و، سێیەم بۆ میوان، چوارەمیش بۆ شەیتانە)).

## (١٨) ڕاخەری پێستە کە ناواخنەکەی ڕیشاڵی دارخورما بێ

١٢٩٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) الَّذِي نَامَ عَلَيْهِ أَدَمًا حَشْوُهُ لِيفٌ.

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: ئەو ڕاخەرەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری دەخەوت پێستەی خۆشەکراو بوو کەناواخنەکەی ڕیشاڵی دارخورما بوو.

## (١٩) پۆشتەکردنی لایەکی جەستەو دەستەو ئەژنۆو دانیشتن و خۆپێچانەوە لەیەك پۆشاکدا

١٢٩٧ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى أَنْ يَأْكُلَ الرَّجُلُ بِشِمَالِهِ، أَوْ يَمْشِيَ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، وَأَنْ يَشْتَمِلَ الصَّمَّاءَ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ كَاشِفًا عَنْ فَرْجِهِ.

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری كردووە كە پیاو بەدەستی چەپی خواردن بخوات، یان بە تاكە نەعلێكەوە بڕوات بەڕێوە، یان یەك لای جەستەی پۆشتەبكاتەوە، هەروەها دەستەوئەژنۆ دابنیشێ لەیەك پارچە پۆشاكدا و عەورەتی دەرخات.

## (٢٠) ڕێگری كردن لە ڕاكشان لەسەر پشت و دانانی قاچێ لەسەر قاچێ

١٢٩٨ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَسْتَلْقِيَنَّ أَحَدُكُمْ، ثُمَّ يَضَعُ إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى)).

(جابر) كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((باكەستان لەسەر پشت ڕانەكشێ و، لنگێكی لەسەر لنگێكی تری دابنێ)) [ئەمە لەكاتێكدا مرۆڤ شەرواڵی لەپێدانەبێ، چونكە لەش دەردەكەوێ].

## (٢١) لەسەر پشت ڕاكشان و دانانی قاچێ لەسەر قاچێكی تر دروستە

١٢٩٩ـ عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ (ﷺ)، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ، وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى. [البخاري/ المساجد/ ٤٦٣]

(عَبَّاد) كوڕی (تميم) لەمامەیەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینیوە كەلەناو مزگەوتدا لەسەر پشت ڕاكشابوو، قاچێكی لەسەر قاچێكی تری دانابوو.(ئەمەش بۆ كاتێكە مرۆڤ شەروالی لەپێدا بێت).

## (٢٢) بەرزكردنەوەی پەشتەماڵ[1] تا سەروی قولاپە واتە تا ناوەڕاستی هەردوو قاچ

١٣٠٠ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَفِي إِزَارِي اسْتِرْخَاءٌ، فَقَالَ: ((يَا عَبْدَ اللَّهِ، ارْفَعْ إِزَارَكَ)). فَرَفَعْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: ((زِدْ)). فَزِدْتُ، فَمَا زِلْتُ أَتَحَرَّاهَا بَعْدُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: [إِلَى] أَيْنَ؟ فَقَالَ: أَنْصَافِ السَّاقَيْنِ.

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: تێپەڕیم بەلای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پەشتەماڵەكەم شۆڕبوو، فەرمووی: ((ئەی عبدالله، پەشتەماڵەكەت بەرز كەرەوە)) منیش زیاتر بەرزم كردەوە، پاشان فەرمووی: ((زیاتر)) منیش زیاترم بەرزكردەوە، بەردەوام لەبیری بەرزكردنەوەیدا بووم، هەندێ لەوخەڵكانە وتیان: {تا} كوێ؟ وتی: تا نیوەی لوولاق.

---

[1] شەرواڵ و بیجامەش دەگرێتەوە كە تەنها بۆ پیاوە

## (٢٣) خوا سەیری كەسێ ناكات كە بۆ فیز پەشتەماڵەكەی بخشێنێ لە زەوی

١٣٠١ـ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (ﷺ) –وَرَأَى رَجُلًا يَجُرُّ إِزَارَهُ، فَجَعَلَ يَضْرِبُ الْأَرْضَ بِرِجْلِهِ، وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْبَحْرَيْنِ– وَهُوَ يَقُولُ: جَاءَ الْأَمِيرُ جَاءَ الْأَمِيرُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى مَنْ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَرًا)). [البخاري/ اللباس/ ٥٤٥١]

(محمد) كوڕی (زیاد) دەڵێ: بیستومە لە (ابوهریرە) (ﷺ) –لەكاتێكدا كە پیاوێكی بینی پەشتەماڵەكەی بەدوای خۆیدا بە زەویدا ڕادەكێشا بەقاچی پێی دەكوتا بە زەویدا، ئەو كەسە فەرمانڕەوای (بەحرەین) بوو– كە دەیوت: فەرمانڕەواكە هات، فەرمانڕەواكە هات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((خوا سەیری كەسێك ناكات كە بۆفیز پەشتەماڵەكەی بەزەویدا ڕابكێشێ)).

## (٢٤) سێكەس هەن خوای گەورە نایان دوێنێ و سەیریشیان ناكات

١٣٠٢ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)). قَالَ: فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثَلَاثَ مِرَارًا، قَالَ أَبُو ذَرٍّ: خَابُوا وَخَسِرُوا، مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ)).

(أبو ذر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سێ كەس هەن خوا لە ڕۆژی قیامەتدا نایان دوێنێ و سەیریان ناكات و پاكیان ناكاتەوە و سزای سەختیان هەیە)). دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێجار ئەمەی خوێندەوە، (أبو ذر) وتی: ڕەنجەڕۆ و خەسارۆمەند بن، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كێن ئەوانە؟ فەرمووی: ((ئەو كەسەی پۆشاكەكەی درێژدەكات بۆ دامێنی پێی بەمەبەستی فیزكردن، ئەو كەسەی منەت بەسەر خەڵكدا دەكات، ئەو كەسەی بەسوێندی درۆ ڕەواج بە شمەكەكەی دەدات)).

## (٢٥) ئەو كەسەی بە فیزەوە پۆشاكەكەی دەخشێنێ بە زەویدا

١٣٠٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثِيَابَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). [البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٦٥]

(عبدالله) كوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو كەسەی بەفیزەوە پۆشاكەكەی ڕادەكێشێ بە زەوی دا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا سەیری ناكات)).

## (٢٦) سزای هەموو وێنە كێشێ لە ڕۆژی قیامەتدا

١٣٠٤ـ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي رَجُلٌ أُصَوِّرُ هَذِهِ الصُّوَرَ فَأَفْتِنِي فِيهَا، فَقَالَ لَهُ: ادْنُ مِنِّي، فَدَنَا مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: ادْنُ مِنِّي، فَدَنَا حَتَّى وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ، قَالَ: أُنَبِّئُكَ بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((كُلُّ مُصَوِّرٍ فِي النَّارِ، يَجْعَلُ لَهُ بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْسًا، فَتُعَذِّبُهُ فِي جَهَنَّمَ)). و قَالَ: إِنْ كُنْتَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَاصْنَعِ الشَّجَرَ وَمَا لَا نَفْسَ لَهُ. [البخاري/ البيوع/ ٢١١٢]

(سعيد) كوڕی (ابو الحسن) دەڵێ: پیاوێك هات بۆلای (ابن عباس) و وتی: من كەسێكم ئەم وێنانە دەكێشم، لەبارەیانەوە فتوایەكم بۆ بدە، (ابن عباس) پێی وت: نزیك بەرەوە لێم، نزیك بوویەوە لێی دیسان وتی: لێم نزیك بەرەوە نزیك بوویەوە تا (ابن عباس) دەستی خستە سەر سەری، ئینجا وتی: ئاگادارت بكەم بەوەی كە لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە؟ لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((هەموو وێنە كێشێ لە ئاگردایە، هەموو وێنەیەك كە دەیكێشێ لێی دەكرێتە نەفسێكی زیندوو، ئەو نەفسە سزای دەدات، لە دۆزەخدا)). ئینجا (ابن عباس) وتی: ئەگەر تۆ چارت نیە و هەر دەبێ وێنە بكێشیت ئەوا وێنەی درەخت و هەر شتێكی تر كە بێگیانە دروست بكە. [(مەبەست ئەو وێنانەیە بۆ تەقدیس و پەرستن دەكێشرێن)].

## (٢٧) ڕێگری كردن لە ئەنگوستیلەی ئاڵتون و خواردنەوە لە دەفری زیو و پۆشینی ئاوریشم

١٣٠٥ـ عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (ﷺ) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَازَةِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ أَوِ الْمُقْسِمِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَإِفْشَاءِ السَّلَامِ. وَنَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمَ -أَوْ: عَنْ تَخَتُّمٍ- بِالذَّهَبِ، وَعَنْ شُرْبٍ بِالْفِضَّةِ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالْإِسْتَبْرَقِ، وَالدِّيبَاجِ. [البخاري/ الأشربة/ ٥٣٢١]

(براء) کوڕی (عازب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردووین کە حەوت شت بکەین و، ڕێگری لێکردووین لە حەوت شت: فەرمانی پێکردووین بە سەردانی نەخۆش، شوێنکەوتنی جەنازە، دۆعای خێر بۆ پژمیو، پشتگیری لە سوێند خۆر تا سوێندی نەکەوێ، یارمەتیدانی ستەملێکراو، چوون بەدەم دەعوەتەوە، بڵاوکردنەوەی سەلام، ڕێگریشی لێکردووین لە ئەنگوستیلەکان -یان ئەنگوستیلەی ئاڵتون کردنە پەنجە[1]، خواردنەوە لە دەفری زیودا و، لەزینی ئاوریشم بۆ وڵاغی سواری و، لە پۆشاکی کەتان کە تێکەڵ بێت بە ئاوریشم و، لە پۆشینی ئاوریشم، لە (استبرق) و (دیباج) کە دوو جۆرن لە پۆشاکی ئاوریشمی بەنرخ.

## ( ٢٨ ) فڕێدانی ئەنگوستیلەی ئاڵتونی

١٣٠٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَأَى خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فِي يَدِ رَجُلٍ فَنَزَعَهُ فَطَرَحَهُ، وَقَالَ: ((يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى جَمْرَةٍ مِنْ نَارٍ فَيَجْعَلُهَا فِي يَدِهِ)). فَقِيلَ لِلرَّجُلِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): خُذْ خَاتِمَكَ انْتَفِعْ بِهِ، قَالَ: لَا وَاللَّهِ لَا آخُذُهُ أَبَدًا وَقَدْ طَرَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ).

(عبدالله) کوڕی (عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتونی لە دەستی پیاوێکدا بینی دایکەندو فڕێیداو فەرمووی: ((هەر بە ئەنقەست یەکێکتان دەچێت بۆ لای سکڵێکی ئاگر و دەیکاتە دەستی)). لە پاش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت، وترا بەپیاوەکە: ئەنگوستیلەکەت هەڵگرەوە و سوودی لێببینە، وتی: نەبەخوا، هەرگیز هەڵی ناگرمەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فڕێی داوە.

١٣٠٧ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، فَكَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ إِذَا لَبِسَهُ، فَصَنَعَ النَّاسُ، ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَنَزَعَهُ فَقَالَ: ((إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتَمَ، وَأَجْعَلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ)). فَرَمَى بِهِ، ثُمَّ قَالَ: ((وَاللَّهِ لَا أَلْبَسُهُ أَبَدًا)). فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ.
[البخاري/ اللباس/ ٥٥٢٨- ٥٥٢٩]

---

[1] مەبەست پەنجەی پیاوە

(عبدالله) كوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگوستیلەیەكی ئاڵتونی كردە پەنجەی، هەركاتێ بیكردایەتە پەنجەی یاقوتەكەی دەخستە دیوی لەپی دەستیەوە، خەڵكیش ئەوەیان كرد، دواتر چووە سەر دوانگەكە و دایكەند و فەرمووی: ((من پێشتر ئەم ئەنگوستیلەیەم دەكردە پەنجەم و یاقوتەكەیم دەخستە دیوی لەپی دەستمەوە)). ئینجا فڕێی داو، فەرمووی: ((بەخوا ئیتر هەرگیز نایكەمە پەنجەم)). خەڵكیش هەموو ئەنگوستیلەكانیان لابرد لەپەنجەیاندا.

## (٢٩) ئەنگوستیلە زیوینەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كە محمد رسول الله ی لەسەر هەڵكۆڵرابوو، جێنشینەكانیش دوای خۆی دەیانكردە پەنجەیان

١٣٠٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، فَكَانَ فِي يَدِهِ، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ)، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُمَرَ (ﷺ)، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُثْمَانَ (ﷺ)، حَتَّى وَقَعَ مِنْهُ فِي بِئْرِ أَرِيسٍ، نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. [البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٥]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگویستیلەیەكی زیوینی هەبوو دەیكردە دەستی پاشان لە دەستی ابو بكردا بوو (ﷺ)، پاشتر لە دەستی عمردا بوو (ﷺ)، دوای ئەویش لە دەستی عثمان دابوو (ﷺ)، تا دواجار كەوتە ناو بیری (اویس)، نوسینی (محمد رسول الله) ی لەسەر هەڵكۆڵرابوو.

١٣٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، وَقَالَ لِلنَّاسِ: ((إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَنَقَشْتُ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، فَلَا يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ)). [البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٧]

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەنگوستیلەیەكی زیوینی دروستكرد، نەقشی (محمد رسول الله)ی لەسەر هەڵكۆڵرابوو، بە خەڵكی وت: ((من ئەنگوستیلەیەكی زیوینم كردووە و، نەقشی (محمد رسول الله) تێدا هەڵكۆلیوە، با هیچ كەسێ نەقشی لە شێوەی ئەو نەقشە دروست نەكات)).

١٣١٠- عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى كِسْرَى وَقَيْصَرَ وَالنَّجَاشِيِّ، فَقِيلَ: إِنَّهُمْ لَا يَقْبَلُونَ كِتَابًا إِلَّا بِخَاتَمٍ، فَصَاغَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَاتَمًا حَلْقَتُهُ فِضَّةٌ، وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. [البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٩]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ویستی نامە بنێرێ بۆ (كیسری) و (قیصر)و (نجاشی)، وترا: ئەوان نامەی مۆرنەكراو وەرناگرن، پێغەمبەری خوا (ﷺ)مۆرێكی دروست كرد كە ئەڵقەكەی زیو بوو، نەقشی (محمد رسول الله)یشی تێدا هەڵكۆڵی.

## ( ٣٠ ) ئەنگوستیلەی زیوین

١٣١١ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ، فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، كَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ. [البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٤]

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگوستیلەیەكی زیوینی كردە پەنجەی دەستی ڕاستی كە یاقوتەكەی حەبەشی هەبوو، یاقوتەكەی دەخستە دیوی ناو لەپی دەستیەوە.

## ( ٣١ ) ئەنگوستیلەكردنە پەنجە تووتەی دەستی چەپ

١٣١٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي هَذِهِ. وَأَشَارَ إِلَى الْخِنْصِرِ مِنْ يَدِهِ الْيُسْرَى.

(انس) (ﷺ) دەڵێ: ئەنگوستیلەكەی پێغەمبەر (ﷺ) ئالەمەدا بوو، ئاماژەی كرد بۆ پەنجە تووتەی دەستی چەپی.

## ( ٣٢ ) ڕێگری كردن لە ئەنگوستیلە كردنە پەنجەی ناوڕاست و ئەوی دوای ئەو

١٣١٣ـ عَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ أَتَخَتَّمَ فِي إِصْبَعِي هَذِهِ أَوْ هَذِهِ، قَالَ: فَأَوْمَأَ إِلَى الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِيهَا.

(علي) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لێكردووم كە ئەنگوستیلەبكەمە ئەم پەنجەیەم یان ئەم پەنجەیەم، وتی: ئامارەی كرد بۆ پەنجەی ناوەڕاستی و پەنجەی برای پەنجە تووتە.

## ( ٣٣ ) زۆر لە پێكردنی پێڵاو

١٣١٤ـ عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) [يَقُولُ] فِي غَزْوَةٍ غَزَوْنَاهَا: ((اسْتَكْثِرُوا مِنَ النِّعَالِ، فَإِنَّ الرَّجُلَ لَا يَزَالُ رَاكِبًا مَا انْتَعَلَ)).

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست لەجەنگێکدا {دەیفەرموو}: ((بەزۆری پێڵاو لەپێ بکەن، چونکە پیاو تا پێڵاوی لەپێدابێ وەك ئەوەوایە بەردەوام سواربێ)).

## (٣٤) لە پێی ڕاستەوە پێڵاو لە پێ دەکرێ، کە داکەنرا با لە پێی چەپەوە بێت

١٣١٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى، وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، وَلْيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا)). [البخاري/ اللباس/ ٥٥١٧– ٥٥١٨]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر یەکێکتان پێڵاوی لەپێکرد با لەپێی ڕاستیەوە دەست پێبکات، ئەگەر دایکەند با لەچەپ دەست پێبکات، وە باهەردووکیان لەپێبکات وەیان هەردووکیان داکەنێت)).

## (٣٥) ڕێگرکردن لەرێ رۆیشتن بەتاکە پێڵاوێکەوە

١٣١٦[مكرر]ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَمْشِ أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((باکەستان بەتاکەپێڵاوێکەوە نەڕوات بەڕێوە با هەردووکیان لەپێ بکات یان هەردووکیان دابکەنێت)).

## (٣٦) ڕێگری کردن لە گۆدلە

١٣١٧ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ الْقَزَعِ. قَالَ: قُلْتُ لِنَافِعٍ، وَمَا الْقَزَعُ؟ قَالَ: يُحْلَقُ بَعْضُ رَأْسِ الصَّبِيِّ وَيُتْرَكُ بَعْضٌ. [البخاري/ اللباس/ ٥٥٧٦]

((ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لە گۆدلە؛ وتم بە (نافع) : گودلە چییە؟ وتی: بەشێ لەسەری منداڵ دەتاشرێ و بەشەکەی تری دەهێڵرێتەوە.

## (٣٧) ڕێگری کردن لە لکاندنی قژی ژنێك بە قژی ژنێکی ترەوە

١٣١٨ـ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي ابْنَةً عُرَيِّسًا، أَصَابَتْهَا حَصْبَةٌ فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا، أَفَأَصِلُهُ؟ فَقَالَ: ((لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ)). [البخاري/ اللباس/ ٥٥٩٧]

(أسماء)كچی (ابو بكر) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، كچێكم هەیە بووكە، توشی سورێژە بوو و قژەكەی كەوت، ئایا قژی تری پێوە ببەستم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((نەفرینی خوا لەو ئافرەتە كە قژ دەلكێنێ و ئەو ئافرەتەش كە قژەكەی بۆ دەلكێنن)).

## ( ٣٨ ) هەڕەشە كردن لەو ئافرەتە كەشتێ دەلكێنێ بە قژیەوە

١٣١٩ـ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: زَجَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ تَصِلَ الْمَرْأَةُ بِرَأْسِهَا شَيْئًا.

(جابر) كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەڕەشەی كردووە كە ئافرەت شتێ بلكێنێ بە قژی سەریەوە،

١٣٢٠ـ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ (ﷺ) عَامَ حَجَّ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ –وَتَنَاوَلَ قُصَّةً مِنْ شَعَرٍ كَانَتْ فِي يَدِ حَرَسِيٍّ– يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ، وَيَقُولُ: ((إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ)). [البخاري/ اللباس/ ٥٥٨٨]

لە(حمید) كوڕی (عبدالرحمن) كوڕی (عوف)ەوە: كە گوێی لە (معاویە) كوڕی (ابوسفیان) بووە (ﷺ) ئەو ساڵەی حەجی كرد لەسەر دوانگەكە وەستابوو –لەوكاتەدا پارچەیەك قژی پێشەوەی سەری لەدەست پاسەوانەكەیی وەرگرت– و دەیوت: ئەی خەڵكی مەدینە زاناكانتان كوان؟ لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستوە كە ڕێگری دەكرد لەم جۆرە شتەو، دەیفەرموو: ((بنو إسرائیل كاتێ فەوتان كە ژنەكانیان ئەم جۆرە كارەیان دەكرد)).

## ( ٣٩ ) نەفرین كردن لە ئافرەتی خاڵ كوت و ئەو ئافرەتەی ددانی باریك دەكات

١٣٢١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مسعود (ﷺ) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، [وَالنَّامِصَاتِ] وَالْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ. قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ، وَكَانَتْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَأَتَتْهُ فَقَالَتْ: مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ، أَنَّكَ لَعَنْتَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَمَا لِي لَا

اَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ (ﷻ)؟ فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ لَوْحَيِ الْمُصْحَفِ فَمَا وَجَدْتُهُ، فَقَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ [الحشر: ٧]. فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: فَإِنِّي أَرَى شَيْئًا مِنْ هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ الْآنَ؟ قَالَ: اذْهَبِي فَانْظُرِي، قَالَ: فَدَخَلَتْ عَلَى امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمْ تَرَ شَيْئًا، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا، فَقَالَ: أَمَا لَوْ كَانَ ذَلِكَ لَمْ نُجَامِعْهَا. [البخاري/ التفسير/ ٤٦٠٤]

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: خوانەفرینی کردووە لە ئافرەتی خاڵ کوت و ئەو ئافرەتەی خاڵی بۆدەکوتیێو، (مووهەڵگر) موو بۆ هەڵگیراو، هەروەها ئەو ئافرەتەی ددانی شاش دەکات بەمەبەستی جوانکردن، کە دروستکراوی خوا دەگۆڕن، وتی: ئەم هەواڵە گەیشتە ئافرەتێکی (بني أسد) پێیدەوترا دایکی (یعقوب)، ئافرەتێکی قورئان خوێن، هاتە لای (ابن مسعود)و وتی: ئەو قسەیە چییە کە لەتۆوە پێم گەیشتوە، کە تۆ نەفرینت کردوە لەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ و ئەو ئافرەتەی ددانی خۆی شاش دەکات بۆجوانی، ئەوانەی کەبەنیازی گۆڕینی دروستکراوی خوا ئەوکارانە دەکەن؟ (عبدالله) وتی: چۆن نەفرین ناکەم لەیەکێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی لێکردوە(دیارە لەقورئانیشدا فەرمانکراوە بەگوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)؟ ئافرەتەکە وتی: هەموو ئەوەم خوێندوەتەوە کە لە نێوان هەردوو بەرگی قورئانەکەدایە ئەوەم نەبینیوە، (ابن مسعود) وتی: ئەگەر بت خوێندایەتەوە بە یەقین دەت دۆزییەوە، خوای (ﷻ) لەو ئایەتەدا دەفەرمووێ کە ئەمە ماناکەیەتی: ﴿ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی هێناون و فەرمانی پێکردوون وەری بگرن و ئەوەش کە قەدەغەی لێکردوون وازی لێبهێنن)). ئینجا ئافرەتەکە وتی: من هەر ئا ئێستە شتێ لەوە دەبینم بە ژنەکەتەوە؟ وتی: برۆ سەیر بکە، وتی: چووە لای ژنەکەی (عبدالله)و هیچی نەبینی، {ژنەکە} هاتەوە بۆلای و وتی: هیچم نەبینی، ئینجا (ابن مسعود) وتی: جا ئەگەر وابوایە ئەوا لەگەڵیداتێکەڵیم نەدەکرد.

## (٤٠) خۆ هەڵکێشانی کەسێ بە شتێکەوە کە نەیدرابێتێ

١٣٢٢ـ عَنْ أَسْمَاءَ (ﷺ) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنَّ لِي ضَرَّةً، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ أَتَشَبَّعَ مِنْ مَالِ زَوْجِي بِمَا لَمْ يُعْطِنِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ)). [البخاري/ النكاح/ ٤٩٢١]

(اسماء) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەرو (ﷺ) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) من هەوێیەکم هەیە، ئایا گوناهبار دەبم کە بڵێم مێردەکەم لەسامانی خۆی فلان شت و فلان شتی دامێ لەکاتێدا کە نەشیدابێ پێم؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەو کەسەی خۆی هەڵبکێشێ بە ماڵێکەوە کە نەیدرابێتێ وەك ئەو کەسە وایە کە قاتێکی درۆینەی پۆشیبێ)).

## ( ٤١ ) ئافرەتانی پۆشتەی رووت

١٣٢٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ، يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ. وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((دوو جۆر لە خەڵکی هەن دەچنە دۆزەخ کە نەمدیون: خەڵکانێ کە قامچیان پێیە هەر وەك کلکی مانگاو لە خەڵکی دەدەن و، ئافرەتانێ کە پۆشتەن ، بەلام وەك رووت [جلەکانیان یا تەنگە یا تەنە یا کورتە]و رووتن لادەرن لە راستی و هاندەری ئافرەتانی تریشن و بە فیز و لار و لەنجەوە دەرۆن بەرێوە، قژیان وەك کۆپارەی حوشتر بەرزکردۆتەوە کە کۆپارەکە ئەوەندە قەبەیە لەقەڵەویدا لاردەبێتەوە، ئەوانە نە دەچنە بەهەشت و نەبۆنیشی دەکەن لە کاتێکدا کە بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندە و ئەوەندەوە دێت)).

## ( ٤٢ ) پچڕاندنی ملوانکەی ملی ئاژەڵ

١٣٢٤ـ عَنْ أَبِي بَشِيرٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (*)فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، قَالَ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَسُولًا -قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ- وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ: ((لَا يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلَادَةٌ مِنْ وَتَرٍ -أَوْ قِلَادَةٌ- إِلَّا قُطِعَتْ)). قَالَ مَالِكٌ: أُرَى ذَلِكَ مِنَ الْعَيْنِ. [البخاري/ الجهاد/ ٢٨٤٣]

لە (أبو بشير الأنصاري)یەوە (ﷺ)؛ لە سەفەرێکیدا کەلە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نێردراوێکی نارد بۆلای خەڵکەکە، (عبدالله)ی کوڕی (ابوبکر) وتی: گومان وادەبەم کە (ابو بشير) لەشوێنی جێمانەوەی شەویاندا بوون، پێی ڕاگەیاندن کە فەرموویەتی: ((با هیچ ملوانکەیەکی دەزوویان ملوانکە- لەملی حوشترەکاندا نەمێنێ هەموویان

بپچڕێنن)). مالك دەڵێ: وادەبینم مەبەستی ئەوانە بوو کەوەك چاوەزار کردبوویانە ملیان.

## ( ٤٣ ) فریشتەکان هاوڕێیەتی کاروانێ ناکەن کە سەگ و زەنگی تێدا بێت

١٣٢٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَصْحَبُ الْمَلَائِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ وَلَا جَرَسٌ)).

(ابو هریرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((فریشتەکان هاوڕێیەتی کاروانێ ناکەن کە سەگ و زەنگی تێدا بێت)).

١٣٢٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الْجَرَسُ مَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ)).

(ابو هریرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((زەنگ جووزەلەی شەیتانە)).

## ( ٤٤ ) ڕێگری لە نیشانە کردنی بێزمانان بە داخکردن

١٣٢٧ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الضَّرْبِ فِي الْوَجْهِ، وَعَنِ الْوَسْمِ فِي الْوَجْهِ.

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردوە لە لێدان لە دەم و چاو، هەروەها نیشانە دروست کردن لەدەم و چاودا بە داخکردن.

١٣٢٨ـ عَنْ نَاعِمٍ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ: حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) يَقُولُ: وَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِمَارًا مَوْسُومَ الْوَجْهِ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ. قَالَ: فَوَاللَّهِ لَا أَسِمُهُ إِلَّا [فِي] أَقْصَى شَيْءٍ مِنَ الْوَجْهِ. فَأَمَرَ بِحِمَارٍ لَهُ فَكُوِيَ فِي جَاعِرَتَيْهِ. فَهُوَ أَوَّلُ مَنْ كَوَى الْجَاعِرَتَيْنِ.

لە (ناعم) کوڕی (ابو عبدالله) حزمەتکوزاری (ام سلمة)وە: کە لە(ابن عباس)ی (ﷺ) بیستوە دەیووت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێدرێژێکی بینی کە ڕوخساری بەداخکردن نیشانە کرابوو، ئەو شتەی پێ ناخۆش بوو، وتی: بەخوا من نیشانەی ناکەم {لە} دوورترین شوێن لە دەمووچاویەوە نەبێ، (ابن عباس) فەرمانیدا کە گوێدرێژەکەی لەهەردوو لاتە سمتیەوە داخکرا، یەکەم کەسێ بوو کە کەفەڵی گوێدرێژ داخ بکات.

## ( ٤٥ ) نیشانە كردنی مەڕ بە داخكردنی گوێكانی

١٣٢٩ـ عَنْ أَنَس (ﷺ) قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِرْبَدًا وَهُوَ يَسِمُ غَنَمًا –قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ– فِي آذَانِهَا. [البخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٢٢]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: چووینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پەچەیەكدابوو مەڕێكی نیشانە دەكرد –وابزانم وتی– لە گوێیدا.

## ( ٤٦ ) نیشانە كردنی پشت بەداخكردنی

١٣٣٠ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا وَلَدَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ قَالَتْ لِي: يَا أَنَسُ، انْظُرْ هَذَا الْغُلَامَ فَلَا يُصِيبَنَّ شَيْئًا حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) يُحَنِّكُهُ، قَالَ: فَغَدَوْتُ فَإِذَا هُوَ فِي الْحَائِطِ، وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ حُرَيْثِيَّةٌ، وَهُوَ يَسِمُ الظَّهْرَ الَّذِي قَدِمَ عَلَيْهِ فِي الْفَتْحِ. [البخاري/ اللباس/ ٥٤٨٦]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: كاتێ كە (ام سليم) منداڵی بوو پێی وتم: وریای ئەو منداڵە بە با هیچ نەخوات هەتا دەیبەیتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) تا دەمی شیرین بكات. بردم و (پێغەمبەر (ﷺ)) لەناو باخەكەدا بوو، پۆشاكێكی خەتداری (بني حُريثي) لەبەردابوو، خەریكی نیشانەكردنی پشتی ئەو حوشترەیبوو كە لە ڕزگاركردنی (مەككە) دا بەدیاری بۆی هاتبوو.

# (٤٢) بەشی ئادابەکان

## (١) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ):

## ((بەناوی منەوە ناو بنێن بەڵام نازناوم مەگرنەوە))

١٣٣١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: نَادَى رَجُلٌ رَجُلًا بِالْبَقِيعِ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، إِنَّمَا دَعَوْتُ فُلَانًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي)). [البخاري/ البيوع/ ٢٠١٥]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: لە بقیع پیاوێك پیاوێکی تری بانگ کرد: هۆ (أبو قاسم)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوڕی لێدایەوە، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستم تۆ نەبوو، بەڵکو بانگی فلانەکەسم کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بەناوی منەوە ناوبنێن، بەڵام بەنازناومەوە نازناو مەنێن)).

## (٢) ناونان بەناوی محمد (ﷺ)

١٣٣٢ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلَامٌ فَسَمَّاهُ مُحَمَّدًا، فَقَالَ لَهُ قَوْمُهُ: لَا نَدَعُكَ تُسَمِّي بِاسْمِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَانْطَلَقَ بِابْنِهِ حَامِلَهُ عَلَى ظَهْرِهِ، فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وُلِدَ لِي غُلَامٌ فَسَمَّيْتُهُ مُحَمَّدًا، فَقَالَ لِي قَوْمِي: لَا نَدَعُكَ تُسَمِّي بِاسْمِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي، فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ)).

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە منداڵێکیان بوو ناوی نا (محمد)، خزمەکانی پێیان وت: لێت ناگەڕێین ناوبنێیت بە ناوی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، پیاوەکە کوڕەکەی خستە سەرپشتی و بەپرتاو هێنای بۆلای پێغەمبەرو (ﷺ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، کوڕێکمان بووە و ناوم ناوە (محمد)، خزمەکانم پێیان وتم: ناهێڵین بەناوی پێغەمبەری خواوە ناوی بنێیت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بەناوی منەوە ناوبنێن بەڵام بە نازناوی منەوە نازناو مەنێن، چونکە من دابەشکارم لە نێوانتاندا بەش دەکەم)).

## (٣) خۆشەویسترین ناو لای خوای گەورە (عبدالله) و (عبدالرحمن) ە

١٣٣٣ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللَّهِ: عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ)).

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((خۆشەویسـترین ناوتان لای خوا (عبدالله) و (عبدالرحمن) ە)).

## (٤) ناونانی منداڵ بە: عبدالرحمن

١٣٣٤- عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلَامٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقُلْنَا: لَا نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلَا نُنْعِمُكَ عَيْنًا، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: ((أَسْمِ ابْنَكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ)). [البخاري/ الأدب/ ٥٨٣٢]

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە کوڕێکیان بوو ناوی نا (قاسم) وتمان: ئێمە بە نازناوی (أبو القاسم) بانگت ناکەین و، ناهێڵین دڵت خۆش بێ بەو نازناوە، پیاوەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوەی بۆ باس کرد، فەرمووی: ((کوڕەکەت ناو دەنێم عبدالرحمن)).

## (٥) ناونانی منداڵ بە (عبدالله) و دەست هێنان بەسەریداو دۆعاکردن بۆی

١٣٣٥- عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَفَاطِمَةُ بِنْتُ الْمُنْذِرِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّهُمَا قَالَا: خَرَجَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ حِينَ هَاجَرَتْ وَهِيَ حُبْلَى بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (ﷺ)، فَقَدِمَتْ قُبَاءً فَنُفِسَتْ بِعَبْدِ اللَّهِ بِقُبَاءٍ، ثُمَّ خَرَجَتْ حِينَ نُفِسَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لِيُحَنِّكَهُ، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْهَا فَوَضَعَهُ فِي حَجْرِهِ، ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ، [قَالَ]: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَكَثْنَا سَاعَةً نَلْتَمِسُهَا قَبْلَ أَنْ نَجِدَهَا، فَمَضَغَهَا ثُمَّ بَصَقَهَا فِي فِيهِ فَإِنَّ أَوَّلَ شَيْءٍ دَخَلَ بَطْنَهُ لَرِيقُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ثُمَّ قَالَتْ أَسْمَاءُ: ثُمَّ مَسَحَهُ وَصَلَّى عَلَيْهِ وَسَمَّاهُ عَبْدَ اللَّهِ، ثُمَّ جَاءَ وَهُوَ ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ أَوْ ثَمَانٍ لِيُبَايِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، وَأَمَرَهُ بِذَلِكَ الزُّبَيْرُ (ﷺ)، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ رَآهُ مُقْبِلًا إِلَيْهِ ثُمَّ بَايَعَهُ. [البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٩٧]

(عروة)ی کوڕی (زبیر) و(فاطمة)ی کچی (منذر)ی کوڕی (زبیر) دەڵێن: کاتێ أسماء کچی ابو بکر کۆچی بۆ (مەدینە)کرد سکی پڕبوو بە (عبدالله) کوڕی (زبیرە)وە (ﷺ) گەیشتە (قُباء)و لە (قُباء) زەیسان کەوت بە (عبدالله) وە، پاش ئەوە کە عبدالله لەدایك بوو چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمی شیرین بکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) عبدالله ی لێگرت و خستیە کۆشیەوە، پاشان داوای خورمایەکی کرد، عائشة وتی: ماوەیەك گەڕاین بە دوای دەنکە خورمایەکدا تا دۆزیمانەوە، لەناودەمیدا جووی و پاشان خستیە ناودەمی

(عبـدالله)وه،یەكـەمین شتی كه چووه نـاو سـكیەوه، ئـەو خورمایـەی نـاودەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بوو، لەپاشاندا (أسماء) وتی: دوای ئەوه پێغەمبـەری خـوا دەستی پیاهێنا و دۆعای خێری بۆكرد و ناوی نا (عبـدالله)، پاشان كەتەمـەنی گەیشته حەوت یان هەشت ساڵ هاته خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا پەیمانی پێ بدات ، (زبیر)ی باوكی ئەو فەرمانەی پێدابوو (ﷺ) كاتی كه پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینـی وا بـەرەو ڕووی هـات زەردەخەنـە گرتـی و پاشـان پـەیمانی لێـی وەرگرت.

١٣٣٦ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): قَالَ كَانَ ابْنٌ لِأَبِي طَلْحَةَ يَشْتَكِي، فَخَرَجَ أَبُو طَلْحَةَ فَقُبِضَ الصَّبِيُّ، فَلَمَّا رَجَعَ أَبُو طَلْحَةَ قَالَ: مَا فَعَلَ ابْنِي؟ قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: هُوَ أَسْكَنُ مِمَّا كَانَ فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ الْعَشَاءَ فَتَعَشَّى، ثُمَّ أَصَابَ مِنْهَا، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَتْ: وَارُوا الصَّبِيَّ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَبُو طَلْحَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: ((أَعْرَسْتُمُ اللَّيْلَةَ)). قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ((اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمَا)). فَوَلَدَتْ غُلَامًا، فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: احْمِلْهُ حَتَّى تَأْتِيَ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) وَبَعَثَتْ مَعَهُ بِتَمَرَاتٍ فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: ((أَمَعَهُ شَيْءٌ)). قَالُوا: نَعَمْ تَمَرَاتٌ، فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَمَضَغَهَا، ثُمَّ أَخَذَهَا مِنْ فِيهِ فَجَعَلَهَا فِي فِي الصَّبِيِّ، ثُمَّ حَنَّكَهُ وَسَمَّاهُ: عَبْدَ اللَّهِ. [البخاري/ العقيقة/ ٥١٥٣]

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: كوڕێكی (ابو طلحة) نـەخۆش بـوو، (ابو طلحة) دەرچـوو لـەماڵ و كوڕەكـەی مـرد، كاتـێ (ابـو طلحـة) گەڕایـەوه وتـی: كوڕەكەم چۆنه؟ (اُم سَليم) وتی: لەجاران ئارامترە، نانی ئێوارەی بۆدانا و نانی خـوارد، پاشـان نزیكـی (اُم سَـليم) كـەوت. كاتـێ لێبوویـەوه ژنەكـەی وتـی: كوڕەكـەت داپۆشـه، كاتێ ڕۆژ بوویـەوه (ابو طلحة) هاتـه خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و هەواڵەكـەی پێـدا، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ﴿ئەمشـەو تێكەڵیتانكرد؟)). وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((خوایه فەڕدارو پیرۆزی بكه بۆیـان)) پاشتر خێزانەكەی كوڕێكی بوو، (ابو طلحة) پێی وتم: هەڵیبگره هەتا ئەیهێنیته لای پێغەمبەر (ﷺ)، هێنایه لای پێغەمبەرو (ﷺ) چەند دنكه خورمایـەكی لەگـەڵ نارد، پێغەمبەر (ﷺ) هەڵی گرت و فەرمووی: ﴿شتێكی لەگەڵه؟)). وتیان: بەڵێ چەند دەنكه خورمایـەكی لەگەڵه، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خورماكـەی هـەڵگرت و

لـەدەمی خۆیـدا جـووی و پاشــان لـەدەمی خـۆی دەریـهێناو خســتیە دەمـی منداڵەكەوە، پاشان هێنای بەدەم و مەلاشۆی داو، ناوی نا: (عبدالله).

## (٦) نـاونـان بەنـاوی پێغەمبەران و پیاوچاكانەوە

١٣٣٧ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا قَدِمْتُ نَجْرَانَ سَأَلُونِي فَقَالُوا: إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ ﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ﴾ [مريم: ٢٨] وَمُوسَى قَبْلَ عِيسَى بِكَذَا وَكَذَا، فَلَمَّا قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: ((إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَمُّونَ بِأَنْبِيَائِهِمْ وَالصَّالِحِينَ قَبْلَهُمْ)).

(مغيرة) كـوڕی (شـعبة) (ﷺ) دەڵـێ: كاتـێ هـاتم بـۆ (نجـران)، پرسـیاریان لێكردم و، وتیان: ئێوە دەخوێننەوە ﴿یا اخت هارون)) (مریم: ٢٨) موسایش لە پێش عیساوەیە بە ئەوەندە و ئەوەندە ساڵ ئیتر چۆن ئـەبێت مەریەم خوشـكی هــاورن بێــت كەزەمــەنێكی زۆریــان لەبەینداـیـە؟)، كاتــێ هاتمــەوە خزمــەتی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) پرسـیاری ئـەوەم لێكـرد، فـەرمووی: ﴿ئـەوان بـەناوی پێغەمبەران و پیاوچاكانی پێش خۆیانەوە ناویان دەنا)).

## (٧) نـاونـانی منداڵ بەئیبراهیم

١٣٣٨ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: وُلِدَ لِي غُلَامٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَسَمَّاهُ: إِبْرَاهِيمَ، وَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ. [البخاري/ العقيقة/ ٥١٥٠]

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: كوڕێكمان بوو، هێنـام بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەویش ناوی نا: ابراهیم و بەخورمایەك دەمی شیرین كرد.

## (٨) نـاونـانی منداڵ بە(منذر)

١٣٣٩ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: أُتِيَ بِالْمُنْذِرِ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ وُلِدَ، فَوَضَعَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى فَخِذِهِ، وَأَبُو أُسَيْدٍ جَالِسٌ، فَلَهِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِشَيْءٍ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَأَمَرَ أَبُو أُسَيْدٍ بِابْنِهِ، فَاحْتُمِلَ مِنْ عَلَى فَخِذِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَقْلَبُوهُ، فَاسْتَفَاقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((أَيْنَ الصَّبِيُّ)). فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أَقْلَبْنَاهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: ((مَا اسْمُهُ)). قَالَ: فُلَانٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ((لَا، وَلَكِنِ اسْمُهُ الْمُنْذِرُ)). فَسَمَّاهُ يَوْمَئِذٍ: الْمُنْذِرَ. [البخاري/ الأدب/ ٥٨٣٨]

(سهل) كوڕی (سعد) دەڵێ: كە(منـذر)ی كـوڕی (ابـو أسـيد) لـەدایكبوو (ﷺ) هێنرا بۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، پێغەمبـەر (ﷺ) خسـتیە سـەر ڕانـی، بـاوكی أســیدیش دانیشــتبوو، پێغەمبــەر (ﷺ) ســەرقاڵی شــتێك بــوو كــە

لەبەردەستیدا بوو، فەرمانی دابە (أبو أسَید) كە كوڕەكەی ببات. ئەویش لەسەر ڕانــی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) هــەڵیگرت و بردیانــەوە بــۆ ماڵــەوە، كاتــێ كــە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەئاگاهاتـەوە، فەرمووی: ﴿كـوا منداڵەكە)). (أبو أسـید) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بردمانـەوە بۆ ماڵـەوە، فەرمووی: ﴿نـاوی چییە؟)). وتی: فلان ئەی پێغەمبەری خـوا، فـەرمووی: ﴿نـا، بەڵكو نـاوی (منـذر)ە)). هەر ئەو ڕۆژە ناوی نا (المنذر).

## (٩) گۆڕینی ناو بەچاكتر

١٣٤٠ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ ابْنَةً لِعُمَرَ (ﷺ) كَانَتْ يُقَالُ لَهَا عَاصِيَةُ، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) جَمِيلَةَ.

(ابن عمر) ﷺ) دەڵـێ: عمـر (ﷺ) كچێكـی هـەبوو پێـی دەوتـرا (عاصیـة)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی نا (جمیلة) (واتە: جوانە).

## (١٠) نـاوی (بَرَّة) گۆڕدرا بۆ (جویریة)

١٣٤١ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَتْ جُوَيْرِيَةُ اسْمُهَا بَرَّةُ، فَحَوَّلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) اسْمَهَا جُوَيْرِيَةَ، وَكَانَ يَكْرَهُ أَنْ يُقَالَ: خَرَجَ مِنْ عِنْدَ بَرَّةَ.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: (جویریـه) نـاوی (بَرَّة) بـوو، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ناوەكـەی گـۆڕی بـۆ (جویریــە)، پێیناخۆش بــوو كــە بوتــرێ: لای چاكــەی بەجێهێشت (بَرَّة: واتە چاكە).

## (١١) نـاوی (بَرَّة) گۆڕدرا بەنـاوی (زینب)

١٣٤٢ـ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ قَالَ: سَمَّيْتُ ابْنَتِي بَرَّةَ، فَقَالَتْ لِي زَيْنَبُ بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ هَذَا الاسْمِ، وَسُمِّيتُ بَرَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمُ، اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ)). فَقَالُوا: بِمَ نُسَمِّيهَا؟ قَالَ: ((سَمُّوهَا زَيْنَبَ)).

(محمد) كوڕی (عمرو) كوڕی (عطـاء) دەڵـێ: كچەكـەمم ناونـا (بَـرَّة)،(زینـب) كچـی (ابو سلمە) پێـی وتم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگـری كـردووە لـەو نـاوە، منیش كاتی خۆی ناونرابووم (بَرَّة)، پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((خۆتـان بە پاك مەزانن، خـوا خـۆی دەزانـێ كێتـان چاكە چونكە (بَـرَّة)واتـە: چاكـە؟)) وتیان: ئەی ناوی بنێین چی؟ فەرمووی: ﴿ناوی بنێن زینب)).

## (١٢)ترێ ناو بردن بە بەخشندە (كَرْم)

١٣٤٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ لِلْعِنَبِ الْكَرْمَ، فَإِنَّ الْكَرْمَ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ)). [البخاري/ الأدب/ ٥٨٢٩]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((باكەسێكتان بە تری نەڵێ (كَرْم) واتە {بەخشندە}، بەڵكو بە خشندە پیاوی موسڵمانە)).

١٣٤٤ـ عَنْ وَائِلِ بن حجر(ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَقُولُوا الْكَرْمُ، وَلَكِنْ قُولُوا الْعِنَبُ وَالْحَبْلَةُ)).

(وائل) كوڕی (حِجر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((بە(ترێ) مەڵێن (كَرْم) {بەخشندە} بەڵكو بڵێن ترێ و دارمێو)).

## (١٣) مۆڵەت لەناوناندا

١٣٤٥ـ عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يَنْهَى [عَنْ] أَنْ يُسَمَّى بِمُقْبِلٍ وَبِبَرَكَةَ وَبِأَفْلَحَ وَبِيَسَارٍ وَبِنَافِعٍ، وَبِنَحْوِ ذَلِكَ، ثُمَّ رَأَيْتُهُ سَكَتَ بَعْدُ عَنْهَا فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا، ثُمَّ قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَلَمْ يَنْهَ عَنْ ذَلِكَ، ثُمَّ أَرَادَ عُمَرُ (ﷺ) أَنْ يَنْهَى عَنْ ذَلِكَ ثُمَّ تَرَكَهُ.

(جابر) كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی ڕێگری بكات لە ناوی (مُقْبِل، بَرَكَة، أفلح، يسار، نافع) هاوشێوەی ئەوانە، لەپاشان بینیم كە بێدەنگ بوو لێیان،و، هیچی نەوت تا كۆچی دوایی كرد ڕێگری نەكرد. پاشتر عمر (ﷺ) ویستی ڕێگری بكات لەو ناوانە بەڵام وازی لێهێنا.

## (١٤) نازناودان بە منداڵ

١٣٤٦ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقًا، وَكَانَ لِي أَخٌ يُقَالُ لَهُ: أَبُو عُمَيْرٍ -قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ- [كَانَ] فَطِيمًا، قَالَ: فَكَانَ إِذَا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَرَآهُ قَالَ: ((أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ)). قَالَ: فَكَانَ يَلْعَبُ بِهِ. [البخاري/ الأدب/ ٥٨٥٠]

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاكترین كەس بوو لە ڕەوشتدا، منیش برایەكم هەبوو پێی دەوترا: (ابو عُمير) وابزانم وتی كە لەشیر بڕابوویەوە، وتی: هەر كاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بهاتایە و چاوی پێبكەوتایە یاریو سوعبەتی لەگەڵ ئەكرد، دەیفەرموو: ((ابا عُمير چۆلەكەكە چی لێهات؟))، دەڵێ: چۆلەكەیەك هەبوو یاری پێدەكرد.

### (١٥) پیاو بە پیاو بلێ کوڕەکەم

١٣٤٧ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) قَالَ: مَا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَحَدٌ عَنِ الدَّجَّالِ أَكْثَرَ مِمَّا سَأَلْتُهُ عَنْهُ، فَقَالَ لِي: ((أَيْ بُنَيَّ، وَمَا يُنْصِبُكَ مِنْهُ؟ إِنَّهُ لَنْ يَضُرَّكَ)). قَالَ: قُلْتُ: إِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ مَعَهُ أَنْهَارَ الْمَاءِ وَجِبَالَ الْخُبْزِ؟ قَالَ: ((هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ)).

(مغيرة) كوڕى (شعبة) (ﷺ) دەڵێ: کەسێك نەبووە لەمن زیاتر پرسیاری کردبێ لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی دەجاڵەوە، فەرمووی پێم: ((ئەی کوڕەکەم، چ شتێکی ئەو ناڕەحەتت دەکات؟ ئەو ناتوانێ زیانت پێبگەیەنێ)). دەڵێ: وتم: خەڵك گومان وادەبەن کە بەئەندازەی ڕووبار ئاوو بەڕادەی کێو نانی پێیە؟ فەرمووی: ((ئەو لای خوا کەمتر و زەلیلترە لەوە کە ئەوەی بداتێ)).

### (١٦) نزمترین ناو لای خوا ناوی کەسێکە پێی بوترێ شاهنشاه

١٣٤٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ أَخْنَعَ اسْمٍ عِنْدَ اللَّهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الْأَمْلَاكِ)). وَفِي رِوَايَةٍ: ((لَا مَالِكَ إِلَّا اللَّهُ)). قَالَ سُفْيَانُ –يعني ابن عيينة– مِثْلُ شَاهَانْ شَاهْ. و قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: سَأَلْتُ أَبَا عَمْرٍو عَنْ ((أَخْنَعَ)) فَقَالَ: أَوْضَعَ. [البخاري/ الأدب/ ٥٨٥٣]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((نزمترین ناوێ لای خوا ناوی پیاوێکە کە ناو ببرێ بە شای شاهان)). لە ڕیوایەتێکدا: ((کەس خاوەن موڵك (پادشا) نیە جگە لەخوا)). (سفيان واتە: ابن عيَيْنَة) دەڵێ: وەکو –شاهنشاه– (احمد)ی کوڕی (حنبل) دەڵێ: پرسیار لە (ابوعمرو) کرد کە(انفع) مانای چییە؟ وتی: واتە: (نزمترین).

### (١٧) مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان پێنج شتن

١٣٤٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((خَمْسٌ تَجِبُ لِلْمُسْلِمِ عَلَى أَخِيهِ: رَدُّ السَّلَامِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ)). [البخاري/ الجنائز/ ١١٨٣]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((موسڵمان پێنج ئەرکی براکەی لەسەرە: وەڵام دانەوەی سەلام، دۆعای خێر بۆ پژمیو، چوون بەدەم دەعوەتەوە، سەردانی نەخۆش، شوێن کەوتنی جەنازە)).

١٣٥٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ)). قِيلَ: مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَسَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ)).

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((موسڵمان شەش مافی لەسەر موسڵمان هەیە)). وترا: ئەوانە کامانەن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ﴿کە گەیشتی پێی سەلامی لێبکە، کە دەعوەتی کردیت بچۆ بەدەمیەوە، کە داوای ئامۆژگاری لێکردیت ئامۆژگاری بکە، کە پژمی و سوپاسی خوای کرد، بڵێ: خوا ڕەحمت پێبکات، ئەگەر نەخۆش کەوت سەری لێبدە، کە مرد شوێن جەنازەکەی بکەوە)).

## (١٨) ڕێگری لە دانیشتنی سەر ڕێگا

١٣٥١ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ بِالطُّرُقَاتِ)). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لَنَا بُدٌّ مِنْ مَجَالِسِنَا، نَتَحَدَّثُ فِيهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا أَبَيْتُمْ إِلَّا الْمَجْلِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ)). قَالُوا: وَمَا حَقُّهُ؟ قَالَ: ((غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الْأَذَى، وَرَدُّ السَّلَامِ، وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ)). [البخاري/ المظالم/ ٢٣٣٣]

(أبو سعيد الخدري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((نەکەن لەسەر ڕێگاکان دابنیشن)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چارەمان نیە و شوێنی دانیشتنمانە و وتو وێژی تێدا دەکەین؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر هەر دەتانەوێ دانیشن ئەوا مافی ڕێگا بدەن)). وتیان: ئەی مافی چییە؟ فەرمووی: ((چاوداخستن، ئازارنەدان، وەڵام دانەوەی سەلام، فەرمان کردن بە چاکەو کاری پەسەند، ڕێگری کردن لە خراپەو کاری بێزراو ناشایستە)).

## (١٩) دەستوری سەلام کردن

١٣٥٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ)). [البخاري/ الاستئذان/ ٥٨٧٨]

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((سـواره سـەلام بكات لە پیادە، پیادەش لە دانیشتوو، کەمیش لە زۆر)).

## (٢٠) مۆڵەت خواستن و سەلام کردن

١٣٥٣ـ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ)، قَالَ: جَاءَ أَبُو مُوسَى إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ) فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، هَذَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ قَيْسٍ. فَلَمْ يَأْذَنْ لَهُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، هَذَا أَبُو مُوسَى، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، هَذَا الْأَشْعَرِيُّ. ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ: رُدُّوا عَلَيَّ، رُدُّوا عَلَيَّ، فَجَاءَ، فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى مَا رَدَّكَ، كُنَّا فِي شُغْلٍ؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((الاسْتِئْذَانُ ثَلَاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَإِلَّا فَارْجِعْ)). قَالَ: لَتَأْتِيَنِّي عَلَى هَذَا بِبَيِّنَةٍ، وَإِلَّا فَعَلْتُ وَفَعَلْتُ، فَذَهَبَ أَبُو مُوسَى، قَالَ عُمَرُ (ﷺ): إِنْ وَجَدَ بَيِّنَةً تَجِدُوهُ عِنْدَ الْمِنْبَرِ عَشِيَّةً، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ بَيِّنَةً فَلَمْ تَجِدُوهُ. فَلَمَّا أَنْ جَاءَ بِالْعَشِيِّ وَجَدُوهُ، قَالَ: يَا أَبَا مُوسَى مَا تَقُولُ، أَقَدْ وَجَدْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ، أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، قَالَ: عَدْلٌ، قَالَ: يَا أَبَا الطُّفَيْلِ مَا يَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ ذَلِكَ، يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، فَلَا تَكُونَنَّ عَذَابًا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّمَا سَمِعْتُ شَيْئًا فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَثَبَّتَ.

(ابو بُردة) لە (أبو موسى الأشعري)وە (ﷺ) دەڵێ: (ابو موسى) هات بۆلای (عمر) کوڕی (خطاب) (ﷺ) وتی: سەلامتان لێبێت، ئەوە (عبدالله) کوڕی (قیس)ە، مۆڵەتی پێنەدا بچێتە لای، ووتی: سەلامتان لێبێت، ئەوە (ابو موسى)یە)، سەلامتان لێبێ، ئەوە (أشعری)یە) پاشان ڕۆیشت، (عمر) وتی: بگەڕێنەوە بۆ لام، بگەڕێنەوە بۆ لام، (ابوموسى) هاتەوە، (عمر) وتی: ئەی (أبو موسى) بۆ گەڕایتەوە، بۆ چاوەڕێت نەکرد ئێمە سەرقاڵ بووین؟ وتی: بیستومە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ﴿مۆڵەت خواستن سێ جارە، ئەگەر مۆڵەتت درا، ئەوا باشە، ئەگەر نا بگەڕێرەوە)). وتی: دەبێ شایەتێکم بۆ بهێنی لەسەر ئەمە، ئەگەرنا ئاوا و ئاوا دەکەم (ابو موسى) ڕۆیشت، (عمر) (ﷺ) وتی: ئەگەر شایەتی هەبێ ئەوا ئێوارە لای مینبەرەکەدا دەیبیننەوە، ئەگەر شایەتی دەست نەکەوت، ئەوا نایبیننەوە، کە ئێوارە هات بینیانەوە، (عمر) وتی: ئەی (أبو موسى) دەڵێی چی ئایا شایەتت دۆزیەوە؟ وتی: بەڵێ، (أُبَيٍّ) کوڕی (کعب) وتی: کەسێکی دات پەروەرە، وتی: ئەی (أبو طفيل)(واته :ابی) ئەم پیاوە دەڵێ چی؟ وتی: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستوە کە ئەوەی دەفەرموو: (ئەی کوڕی

[خطاب] مەبە مایەی چەرمەسەری بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، (عمر) وتی: (سبحان الله) تەنها ئەوەیە شتێکم بیستبوو، ویستم دڵنیا ببم لێی.

## (٢١) لادانی پەردەی ماڵ نیشانەی مۆڵەت دانە

١٣٥٤ـ عَنْ ابْنَ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذْنُكَ عَلَيَّ أَنْ يُرْفَعَ الْحِجَابُ، وَأَنْ تَسْتَمِعَ سِوَادِي، حَتَّى أَنْهَاكَ)).

(ابن مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێم: ((مۆڵەتی هاتنت بۆ لام ئەوەیە کە پەردەکە بەرز بکرێتەوەو، دەنگم ببیستی، مەگەر ڕێگریت لێبکەم)).

## (٢٢) کە لەدەرگاتدا باش نییە بڵێی منم

١٣٥٥ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: ((مَنْ هَذَا)). فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَنَا أَنَا)). وفي رواية: كَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ. [البخاري/ الاستئذان/ ٥٨٩٦]

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: داوای مۆڵەتم کرد تا بچمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی: ((ئەوە کێیە)) منیش وتم: منم، پێغەمبەر (ﷺ) پێی ناخۆش بوو، فەرمووی: ((منم، منم)) [(مەبەست ئەوەیە ئەبوایە ناوی خۆی بوتایە)].. و لە ڕیوایەتێکدا: وەك ئەو وەڵامەی منی پێناخۆش بووبێ.

## (٢٣) ڕێگریکردن لەسەرەتاتکێ کاتی مۆڵەت خواستن

١٣٥٦ـ عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا اطَّلَعَ فِي جُحْرٍ فِي بَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِدْرًى يَحُكُّ بِهِ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْتَظِرُنِي لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ)). وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ)). [البخاري/ الديات/ ٦٥٠٥]

(سهل) کوڕی (سعد الساعدي) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لە کونی دەرگای ماڵی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەیڕوانیە ژوورەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاسنێکی شێوە شانەی پێبوو سەریخۆی پێدەخوراند، هەر کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی پێی کەوت فەرمووی: ((ئەگەر بمزانیایە سەیرم دەکەیت ئابەمە لە چاوتم دەدا)). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((مۆڵەت خواستن بۆ ئەوە دانراوە تا چاو داخەیت و عەیب و عاری خەڵکی نەبینی)).

## (٢٤) کەسێ بڕوانێتە ماڵی خەڵکی بەبێ مۆڵەت

١٣٥٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَوْ أَنَّ رَجُلًا اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ فَخَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، مَا كَانَ عَلَيْكَ مِنْ جُنَاحٍ)). [البخاري/ الديات/ ٦٤٩٣]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بەبێ مۆڵەتی خۆت پیاوێك سەیری ماڵەکەتی کرد، تۆیش بەردێکت تێگرت و چاوت تەقاند، گوناهبار نابیت)).

## (٢٥) سەیرکردنی کتوپڕی و چاووەرگێڕان

١٣٥٨ـ عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ نَظَرِ الْفُجَاءَةِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَصْرِفَ بَصَرِي.

(جَرير) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لەبارەی سەیرکردنی کتوپڕییەوە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمانی پێدام کە زوو چاو وەربگێڕم.

## (٢٦) ئەو کەسەی دەچێتە کۆڕی دانیشتن با سەلام بکات و دابنیشێ

١٣٥٩ـ عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ إِذْ أَقْبَلَ نَفَرٌ ثَلَاثَةٌ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَذَهَبَ وَاحِدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الْآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَلَا أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلَاثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ)). [البخاري/ العلم/ ٦٦]

(ابو واقد الليثي) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مزگەوت دانیشتبوو خەڵکیش لە خزمەتیدا بوون، لەکتوپڕدا سێ کەس هاتن، دووانیان ڕوویان کردە پێغەمبەری خواو (ﷺ) یەکێکیان ڕۆیشت، لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وەستان، یەکێکیان بۆشاییەکی لە ئەڵقەی کۆڕەکەدا بینی و تیایدا دانیشت، ئەوی دیکەیان لەدوایانەوە دانیشت، بەڵام سێیەمیان پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێبوویەوە فەرمووی: ((هەواڵی ئەو سێ کەسەتان نەدەمێ؟ یەکێکیان پەنای هێنا بەخوا، خوایش

جێگەی کردەوە، ئەوی تریان شەرمی کرد خوای گەورە مەعزەرەتی قبولْ کرد، بەلاّم سێیەمینیان پشتی هەڵکرد و خوایش پشتی لەو هەڵکرد)).

## (٢٧) ڕێگری لە هەستاندنی کەسێ لەمەجلیسا بۆئەوەی خۆی دابنیشێ

١٣٦٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِـيِّ (ﷺ) قَـالَ: ((لَـا يُقِيـمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَقْعَدِهِ ثُـمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وتوسـعوا)). وفي روايـة: قُلْـتُ: فِـي يَـوْمِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَغَيْرِهَا. وكان ابن عمر إذا قام له رجل عن مجلسه لم يجلس فيه. [البخاري/ الجمعة/ ٨٦٩]

(ابـن عمـر) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ﴿باکـەس کەسـێکی تـر هەڵنەستێنێ و خۆی لەجێگەکەیدا دابنیشێ، بەڵکو بڵاوە بکەن و جێـی یەکتر بکەنەوە!! جا ئەگەر کەسێ لە شوێنەکەی خۆی هەستابایەو چۆڵی بکردایـە بۆ (ابن عمر)، (ابن عمر) لە جێگەی ئەو کەسەدا دانەدەنیشت.

## (٢٨) کەسێ لە شوێنی خۆی هەستێ و دوایی بگەڕێتەوە شیاوترە پێی

١٣٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ -وَفِي حَدِيثِ أَبِي عَوَانَةَ: مَنْ قَامَ- مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ)).

(أبـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((هـەرکات یـەکێکتان لە جێگـەی خـۆی هەستا- لە فەرموودەی (أبو عوانـة)- هـەر کەسـێ هەستا- پاشان گەڕایەوە بۆی، ئەوە ئەو شیاوترە بەو شوێنەی خۆی)).

## (٢٩) ڕێگری لەچپەکردنی دووکەس

١٣٦٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود(ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ)). [البخاري/ الأستئذان/ ٥٩٣٢]

(عبدالله)ی کـوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی: ((ئەگەر ئێوە سێ‌کەس بوون ، با دوانتان نەکەونە چپەکردن جیالەوی‌تر، هەتا تێکەڵ دەبن بەخەڵکانی‌تر، چونکە ئەوکەسە دڵگران دەبێت)).

## (٣٠) سەلام کردن لە منداڵان

١٣٦٣- عَنْ سَيَّارٍ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَحَدَّثَ ثَابِتٌ: أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ أَنَسٍ فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَحَدَّثَ

أَنَسٌ: أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. [البخاري/ الأستئذان/ ٥٨٩٣]

(سيّار) دەڵێ: لەگەڵ (ثابت البناني)دا دەڕۆیشتم بەڕێگەدا –تێپەڕی بەلای چەند منداڵێكدا و سـەلامی لێكـردن، (ثـابت) گێڕایـەوە: كـە لەگـەڵ (أنـس) دا دەڕۆیشـت، تێپـەڕی بـەلای چـەند منداڵێكـدا و سـەلامی لێكـردن، (أنـس)یـش گێڕایەوە كەلە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەڕۆیشت، تێپەڕی بەلای چەند منداڵێكدا و سەلامی لێكردن.

## (٣١) وەڵامدانەوەی سەلامی خاوەن كتێبەكان

١٣٦٤ـ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: سَلَّمَ نَاسٌ مِنْ يَهُودَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَقَالَ: ((وَعَلَيْكُمْ)). فَقَالَتْ عَائِشَةُ (ﷺ) –وَغَضِبَتْ–: أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: ((بَلَى قَدْ سَمِعْتُ، فَرَدَدْتُ عَلَيْهِمْ، وَإِنَّا نُجَابُ عَلَيْهِمْ وَلَا يُجَابُونَ عَلَيْنَا)).

(جابر) كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵـێ: كەسانێك لـە جولەكـە سڵاویان كـرد لـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، وتیـان: (السـام علیـك) واتـە مردنـت لەسـەر ئـەی (أبـا القاسم)، فەرمووی: ((لەسەر ئێوەش)). عائشە (ﷺ) تووڕە بوو بوو وتـی: ئـەی گوێـت لێنـەبوو كـە چیـان وت؟ فـەرمووی: ((بـەڵێ گوێـم لێبـوو منیـش وەڵامـم دانەوە، دۆعای ئێمـە لەسـەر ئەوان گیرادەبێ، بـەڵام دۆعـای ئـەوان لەسـەر ئێمـە گیرا نابێ)).

## (٣٢) ڕێگری لە چوونە دەرەوەی ئافرەتـان

١٣٦٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ أَزْوَاجَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ إِذَا تَبَرَّزْنَ إِلَى الْمَنَاصِعِ، وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ، وَكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) يَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): احْجُبْ نِسَاءَكَ، فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَفْعَلُ، فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ –زَوْجُ النَّبِيِّ (ﷺ)– لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي عِشَاءً، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ (ﷺ): أَلَا قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ. حِرْصًا عَلَى أَنْ يُنْزَلَ الْحِجَابُ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْحِجَابَ. [البخاري/ الوضوء/ ١٤٦]

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: خێزانەكانی پێغەمبەر (ﷺ) بەشەودا دەچوونە دەرەوە بۆ چوونە سەرئاو، كە دەشتێكی فراوان بوو، (عمر) كوڕی (خطاب) (ﷺ) بە پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) دەوت: با خێزانـەكانت دەرنەكـەون بـۆ خـەڵك، پێشـتر

پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئـەوەی نـەدەكرد، شـەوێك لەشـەوان لـەكاتی عیشـادا (سودە)ی كچی (زمعة) ـ خێزانی پێغەمبـەر (ﷺ) ـ كە ئافرەتێكی باڵابـەرز بـوو رۆیشتە دەرەوە، (عمـر) (رضي الله عنه) بانگی كـرد، ئـەی (سـودة) ئاگاداربـە دەتناسـین (عمـر) بە پەرۆشـەوە بـوو كـە ئایـەتی حیجاب دابەزێ، عائشە وتـی: خـوا (ﷻ) ئایەتی حیجابی دابەزاند.

## ( ٣٣ ) مۆڵەت بەچوونە دەرەوەی ئافرەتـان

١٣٦٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ (رضي الله عنها) بَعْـدَ مَـا ضُـرِبَ عَلَيْـهَا الْحِجَابُ لِتَقْضِيَ حَاجَتَهَا، وَكَانَتِ امْرَأَةً جَسِيمَةً تَفْرَعُ النِّسَاءَ جِسْمًا، لَا تَخْفَى عَلَى مَنْ يَعْرِفُهَا، فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) فَقَالَ: يَا سَوْدَةُ، وَاللَّهِ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا فَانْظُرِي كَيْفَ تَخْرُجِينَ. قَالَتْ: فَانْكَفَأَتْ رَاجِعَةً، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَيْتِي وَإِنَّهُ لَيَتَعَشَّى وَفِي يَدِهِ عَرْقٌ، فَدَخَلَتْ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي خَرَجْتُ، فَقَالَ لِي عُمَرُ: كَذَا وَكَذَا. قَالَتْ: فَأُوحِيَ إِلَيْهِ، ثُمَّ رُفِعَ عَنْهُ وَإِنَّ الْعَرْقَ فِي يَدِهِ مَا وَضَعَهُ، فَقَالَ: ((إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ)). [البخاري/ التفسير/ ٤٥١٧]

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: لەپاش ئەوەی كە حیجاب لەسەرمان فەرز كرا (سودة) چووە دەرەوە بۆ چوونە سەرئاو، ئافرەتێكی قایم و قوڵو باڵا بەرز بوو، لەناو ئافرەتەكاندا دیاربوو، نەدەشاردرایەوە لە كەسێ كە بیناسیایە، (عمر) كوڕی (خطاب) (رضي الله عنه) بینیو وتی: ئەی (سودة)، بەخوا لێمان ون نابیت جا ئیتر بزانە چۆن دەچیتە دەرەوە، ئەویش گەڕایەوە، لەوكاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵی مندابوو نانی ئێوارەی خوارد و ئێسـقانێكی بەدەسـتەوە بـوو، (سـودة) هاتـە ژوورەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من چوومە دەرەوە، (عمر) ئەوە و ئەوەی پـێوتم، (عائشـة) دەڵـێ: وەحـی هـات بـۆ پێغەمبـەر، پاشان تـەواو بـوو، هێشـتا ئێسقانەكە بەدەستیەوە بوو داینەنابوو ئینجا فەرمووی: ((ئێـوە ژنـان مۆڵەتتان پێدراوە كە بۆ پێویستیەكانتان بچنە دەرەوە)).

## ( ٣٤ ) لەدواوە سواركردنی ئافرەتی مەحرەم لە سواریدا

١٣٦٧ـ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رضي الله عنها) قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ، وَمَا لَـهُ فِـي الْأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلَا مَمْلُوكٍ وَلَا شَيْءٍ غَيْرَ فَرَسِهِأَعْلِفُ فَرَسَهُ وَأَكْفِيهِ مَئُونَتَهُ وَأَسُوسُهُ، وَأَدُقُّ النَّوَى لِنَاضِحِهِ، وَأَعْلِفُهُ، وَأَسْتَقِي الْمَاءَ وَأَخْرُزُ غَرْبَهُ وَأَعْجِنُ، وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ، وَكَانَ يَخْبِزُ لِي جَارَاتٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَكُنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ، قَالَتْ:

وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرْضِ الزُّبَيْرِ الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى رَأْسِي، وَهِيَ عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ، قَالَتْ: فَجِئْتُ يَوْمًا وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي، فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَدَعَانِي ثُمَّ قَالَ: ((إِخْ إِخْ)) لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ، قَالَتْ: فَاسْتَحْيَيْتُ وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ، فَقَالَ: وَاللَّهِ لَحَمْلُكِ النَّوَى عَلَى رَأْسِكِ أَشَدُّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ. قَالَتْ: حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) بَعْدَ ذَلِكَ بِخَادِمٍ، فَكَفَتْنِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَتْنِي. [البخاري/ النكاح/ ٤٩٢٦]

(أسماء) کچی (ابو بکر) (ﷺ) دەڵێ: (زبیر) گواستمیەوە و، لەم سەرزەویەدا نە سامان و نە کارگوزار و نە هیچ شتێکی تری نەبوو جگە لە ئەسپەکەی، دەڵێ: ئاڵفم دەدا بە ئەسپەکەی و پێداویستیم دابین دەکرد و ئەسپەکەیم پاك دەکردەوە و ڕامم دەکرد، ناوکە خورمام دەکوتا بۆ حوشترەکەی کە سواری دەبوو و ئاوی پێڕادەکێشا، ئاڵفم دەدا و ئاوم دەهێنا و دۆڵچەکەم دەدوریەوە و هەویرم دەشێلا، بەڵام نەمدەزانی باش نان بکەم، چەند ئافرەتێکی دراوسێم لە یارمەتیدەران نانیان بۆ دەکردم، بەڕاستی ئافرەت بوون، دەڵێ: لە زەویەکەی زبیرەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی دابڕیبوو ناوکە خورمام لەسەر سەر دەگواستەوە کەدوو لەسەرسێی قۆناغێك دوور بوو، ڕۆژێکیان دەگەڕامەوە ناوکە خورما لەسەر سەرم بوو، گەیشتم بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە چەند هاوەڵێك لە خزمەتیدا بوون، بانگی کردم و پاشان فەرمووی: ((ئیخ ئیخ)) بۆ ئەوەی حوشترەکە دانەوێت و لەدوای خۆیەوە هەڵم بگرێ، دەڵێ: خۆم شەرمم کرد و غیرەتی تۆشم دەزانی، (زبیر) وتی: بەخوا هەڵگرتنی ئەو ناوکە خورمایانە لەسەر سەرت لەلام قورسترە تا سواربوونت لەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ)، (أسماء) وتی: لە دوای ئەوەوە (ابو بکر) (ﷺ) خزمەتکارێکی بۆ ناردم، بوو بەهۆی ئەوەی ڕزگارم ببێ لە بەخێوکردنی ئەسپەکە، وەك ئەوەی کە ئازادی کردبم لە کۆیلەیەتی.

## (٣٥) کەسێ ئافرەتی لەگەڵدابێ و بەلای خەڵکدا تێپەڕببێ با ناوی ئافرەتەکە بڵێ

١٣٦٨ـ عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) مُعْتَكِفًا، فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلًا، فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ لِأَنْقَلِبَ فَقَامَ مَعِيَ لِيَقْلِبَنِي –وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ)– فَمَرَّ رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ (ﷺ) أَسْرَعَا،

فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ)). فَقَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: ((إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الْإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَرًّا)). أَوْ قَالَ: ((شَيْئًا)). [بخاري/ الاعتكاف/ ١٩٣٠]

(صفيـة) كچـی (حُيـيٍّ) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لـە (اعتكـاف)دا بـوو، شـەوێك هاتمـە خزمـەتی و سـەردانم كـرد و، لەگـەڵیدا دوام، پاشـان هەسـتام بگەڕێمـەوە ئـەویش لەگـەڵمدا هەستا ڕەوانـەم بكـات –مـاڵی (صفيـة) لـە ماڵی (أسامة) كـوڕی (زيـد) بـوو (ﷺ)– دوو پيـاوی (انصـار)ی تێپـەڕين، هــەر كـە پێغەمبـەريان (ﷺ) بينـی پەلـەيان كـرد، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((لەسـەر خۆتـان، ئـەوە (صفيـة)یكچـی (حُيَّـی) ئـەوانيش وتيـان: سـبحان الله ئـەی پێغەمبەری خوا! (جەنابت جێی گومان بيت) فەرمووی: ((لەڕاستيدا شەيتان وەك خوێن بەلەشتاندا دەگەڕێ، منيش ترسام لەوە كەگومانێكی خراپ بخاتە دڵەكانتانەوە)).

## (٣٦) ڕێگری كردن لەمانەوەی پياو لای ئافرەتی نامەحرەم

١٣٦٩ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَلَا لَا يَبِيتَنَّ رَجُلٌ عِنْدَ امْرَأَةٍ ثَيِّبٍ إِلَّا أَنْ يَكُونَ نَاكِحًا أَوْ ذَا مَحْرَمٍ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((با هيچ كەسێ شەو لەلای ئافرەتی بێوەژن نەمێنێتەوە مەگەر مـارە بـڕی بێـت يـان مـەحرەم بێـت پێی)).

١٣٧٠ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ)). فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟ قَالَ: ((الْحَمْوُ الْمَوْتُ)). قَالَ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ: يَقُولُ الْحَمْوُ أَخُ الزَّوْجِ وَمَا أَشْبَهَهُ مِنْ أَقَارِبِ الزَّوْجِ، ابْنُ الْعَمِّ وَنَحْوُهُ. [بخاري/ النكاح/ ٤٩٣٤]

(عقبە)ی كوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((وريـا بـن تـەنيا مەكـەون لەگـەڵ ئـافرەتدا)). پيـاوێك لـە يارمـەتيدەران وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئەی ئەگـەر شوو بـرا يـان خزمـی مێردەكـەی بـوو؟ فـەرمووی شووبرا مردنە)) [( واتە: لەبەرئەوە تێكەڵی زياترە ئەبێ زياتر خۆی لەتێكەڵی بپارێزێ)].

## ( ٣٧ ) ڕێگری لە چوونە سەردانی ئافرەتـانێ کە مێردیان لەماڵەوە نەبێت

١٣٧١ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ): أَنَّ نَفَرًا مِنْ بَنِي هَاشِمٍ دَخَلُوا عَلَى أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ) -وَهِيَ تَحْتَهُ يَوْمَئِذٍ- فَرَآهُمْ فَكَرِهَ ذَلِكَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَقَالَ: لَمْ أَرَ إِلَّا خَيْرًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَرَّأَهَا مِنْ ذَلِكَ)). ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: ((لَا يَدْخُلَنَّ رَجُلٌ بَعْدَ يَوْمِي هَذَا عَلَى مُغِيبَةٍ إِلَّا وَمَعَهُ رَجُلٌ أَوِ اثْنَانِ)).

(عبدالله) کوڕی (عمرو) کوڕی (العاص) (ﷺ) دەڵێ: چەند کەسی لە (بنو هاشم) چوونە سەردانی (أسماء)کچی (عُمیس)، کە لەوڕۆژەدا خێزانی (ابو بکر الصدیق) (ﷺ) بوو –ابو بکر هاتەوە بۆ ماڵ – کە بینینی پێی ناخۆش بوو، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسکرد و وتیشی چاکە نەبێ هیچم نەدی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((خوا لەخراپە بەدووری گرتووە)) ، پاشان پێغەمەری خوا(ﷺ) هەستاو چووەسەر دوانگەو فەرمووی: ((لەم ڕۆ بەدواوە با هیچ پیاوێ نەچێتە ماڵی ژنێکەوە مێردەکەی لەماڵ نەبێ، مەگەر یەك یان دوو پیاوی لەگەڵدابێ)).

## ( ٣٨ ) کوژاندنەوەی ئاگر کاتی خەوتن

١٣٧٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ عَلَى أَهْلِهِ بِالْمَدِينَةِ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا حُدِّثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِشَأْنِهِمْ، قَالَ: ((إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ)). [بخاري/ الاستئذان/ ٥٩٣٦]

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: شەوێك لە مەدینە ماڵێك سوتا بە سەرخەڵکەکەیدا، کاتێ لە بارەیانەوە هەواڵ درا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بەڕاستی ئەم ئاگرە دوژمنتانە، هەر کاتێ خەوتن لە خۆتانی بکوژێننەوە)).

# (٤٣) بەشی نوشتە و دوعا (كتاب الرُّقي)

## (١) نوشتەی جبریل بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

١٣٧٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ إِذَا اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَقَاهُ جِبْرِيلُ (عليه السلام)، قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ يُبْرِيكَ، وَمِنْ كُلِّ دَاءٍ يَشْفِيكَ، وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ، وَشَرِّ كُلِّ ذِي عَيْنٍ.

(عائشە) (رضي الله عنها) دەڵێ: هەركاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ئازاری ببوایە جبریل (عليه السلام) دۆعای بەسەردا دەخوێندەوە و دەیفەرموو: بەناوی خواوە دەپارێمەوە ئازارت لابەرێت، لەهەموو دەردێك شیفات بدات، لە خراپەی هەموو حەسودێك كەحەسادەت بەرێت، لەخراپەی هەموو چاوپیسێك بتپارێزێت!.

١٣٧٤ـ [عَنْ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رضي الله عنه): أَنَّ جِبْرِيلَ (عليه السلام) أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ فَقَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ اللَّهُ يَشْفِيكَ، بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ].

(عبدالعزيز)ی كوڕی (صهیب)، ئەویش لە (ابي نضرة)ەوە، ئەویش لە (ابي سعيد)ەوە (رضي الله عنه) كە جبریل (عليه السلام) هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی محمد ئازارت هەیە؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، فەرمووی: بەناوی خواوە نوشتەت بۆ دەخوێنم، لەهەموو شتێك كە ئازارت بدات، لەشەڕی هەموو دەرون نەخۆشێك، لە هەموو چاوێكی پیسیش، خوا شیفات بدات، بەناوی خواوە نوشتە و دوعات بۆ دەخوێنم.

## (٢) جادو كردنی جولەكە لە پێغەمبەر (ﷺ)

١٣٧٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِي زُرَيْقٍ، يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، قَالَتْ: حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا يَفْعَلُهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ -أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ- دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، ثُمَّ دَعَا ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ قَالَ: ((يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ جَاءَنِي رَجُلَانِ، فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالْآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ الَّذِي عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذِي عِنْدَ رِجْلَيَّ، أَوِ الَّذِي عِنْدَ رِجْلَيَّ لِلَّذِي عِنْدَ رَأْسِي: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، قَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَ فِي

مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ قَالَ وَجُفُّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ، قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْرِ ذِي أَرْوَانَ)).
قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ قَالَ: ((يَا عَائِشَةُ، وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءوسُ الشَّيَاطِينِ)). قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا أَحْرَقْتَهُ؟ قَالَ: ((لَا، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِي اللَّهُ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا، فَأَمَرْتُ بِهَا فَدُفِنَتْ)). [بخاري/ الطب/ ٥٤٣٠]

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: جولەکەیەك لە جولەکەکانی (بني زريق)کە پێی دەوترا (لبيد بن الاعصم) جادوی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) هەتا پێغەمبەر (ﷺ) وادەهات بە خەیاڵیدا کەشتێکی کردووە نەیشی کردبوو، هەتا ڕۆژێك یان شەوێك- پێغەمبەر (ﷺ) پاڕایەوە، هەر پاڕایەوە هەرپاڕایەوە، پاش ئەوە فەرمووی: ((ئەی عائشة ئایاهەستت کرد خوا ئاگاداری کردم لەوشتەی داوام لێکرد ئاگادارم کات؟ دوپیاو هاتن بۆ لام یەکێکیان لای سەرم و ئەوی تریان لای قاچم دانیشت، ئەمەی لای سەرم بەوەی لای قاچم یان ئەوەی لای قاچم بەوەی لای سەرمی وت : ئازاری ئەم پیاوە چی‌یە؟ وتی: جادوی لێکراوە، وتی: کێ جادوی لێکردووە؟ وتی: (لبيد)ی کوڕی (اعصم) وتی: لە چ شتێکدا؟ وتی: لەشانەیەك و چەند تاڵێك موو کەبەدەم شانەکردنی سەر، یان ڕیشەوە دەکەونە خوارەوەلەناو قاوغی گوڵی دارخورمایەکی نێردا، وتی: وا لەکوێدا؟ وتی: وا لەناو بیری (ذي أروان)دا)).

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانیدا چوو بۆ لای ئەو بیرە، لەپاشدا فەرمووی: ((ئەی عائشە والله ئاوی ئەو بیرە وەك خەنەی تێکرابێ وەهابوو، دارخورماکانیشی وەك سەری شەیتانەکان بوون)) عائشة دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نەتسوتاند؟! فەرمووی: ((نەخێر، چونکە من خوا شیفای دام، پێیشم ناخۆش بوو شەڕ بئاڵۆزێنم بۆ خەڵکی، فەرمانم دا لەبیرەکە دەریان هێنا و خستیانە ژێر گڵەوە)).

### (٣) خوێندنی (قل أعوذ)وەکان بەسەر نەخۆشدا

١٢٧٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا مَرِضَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ نَفَثَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا مَرِضَ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ جَعَلْتُ أَنْفُثُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُهُ بِيَدِ نَفْسِهِ، لِأَنَّهَا كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْ يَدِي. [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٢٨]

(عائشــة)(ﷺ) دەڵــێ: ئەگــەر یــەکێ لەکەســەکانی پێغەمبــەر (ﷺ) نــەخۆش بکەوتایە (قل أعوذ)وەکانی بەسەردا دەخوێند و فوی دەکرد بەسەریدا، کاتێ خۆی نـەخۆش کـەوت لەنەخۆشـینی وەفـاتیدا، مـن فـوم دەکـرد بەســەریدا و بەدەستی خۆی ڕومەتیم دەماڵی لەبەر ئەوەی دەستی ئەو لەدەستی من پیرۆز تر بوو.

## (٤) نوشتەکردن بەناوی خوا

١٣٧٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا مَرِضَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ نَفَثَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا مَرِضَ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ جَعَلْتُ أَنْفُثُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُهُ بِيَدِ نَفْسِهِ، لِأَنَّهَا كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْ يَدِي.

(عثمان)ی کوڕی (أبي العاص الثقفي)(ﷺ) دەڵێ: سکاڵای برد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەتاو ئازارێك لەلاشەیدا هەبوو لەوکاتـەوە موسـوڵمان بوبـوو، پێغەمبـەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((دەستت دابنێ لەسەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لەلاشەت، ئەمجا سێ جـار بڵـێ: (بسم الله)، وەحـەوت جـار بڵـێ: پـەنا ئـەگرم بـەخوا و بـەتوانای خـوا لــە خراپــەی ئــەو ئــازارەی مــن هەســتی پێدەکــەم خۆمــی لێپەنادەگرم)).

## (٥) پەناگرتن لەشەیتانی وەسوەسەی نوێژ

١٣٧٨ـ عَنْ أَبِي الْعَلَاءِ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ (ﷺ) أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: ((يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ حَالَ بَيْنِي وَبَيْنَ صَلَاتِي وَقِرَاءَتِي يَلْبِسُهَا عَلَيَّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((ذَاكَ شَيْطَانٌ يُقَالُ لَهُ خَنْزَبٌ، فَإِذَا أَحْسَسْتَهُ فَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْهُ، وَاتْفِلْ عَلَى يَسَارِكَ ثَلَاثًا)). قَالَ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ، فَأَذْهَبَهُ اللَّهُ عَنِّي.

لە (أبي العلاء)ەوە: کە (عثمان) کوڕی (أبي العاص) (ﷺ) هاتـە خزمـەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: یارسول الله، شەیتان بووەتە کۆسپ لە نێوان من و نوێژو قورئـان خوێندنەکـەمدا لێـم تێکـدەدات، پێغەمبــەر (ﷺ) فــەرمووی: ((ئــەوە شەیتانێکە پێی دەوترێ (خِنزَب)ئەگەر هەستت پێکرد پەنا بگرە بەخوا لێی، وە سێ جار تف بکە بەلای چەپدا)) دەڵێ: ئەمەم کرد خوای گەورە شەیتانی لێدور خستمەوە.

## (٦) نوشتەی گەزراو

١٣٧٩ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) كَانُوا فِي سَفَرٍ، فَمَرُّوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ، فَاسْتَضَافُوهُمْ فَلَمْ يُضِيفُوهُمْ، فَقَالُوا لَهُمْ: هَلْ فِيكُمْ رَاقٍ؟ فَإِنَّ سَيِّدَ الْحَيِّ لَدِيغٌ، أَوْ مُصَابٌ؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: نَعَمْ، فَأَتَاهُ فَرَقَاهُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَبَرَأَ الرَّجُلُ، فَأُعْطِيَ قَطِيعًا مِنْ غَنَمٍ، فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهَا، وَقَالَ: حَتَّى أَذْكُرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا رَقَيْتُ إِلَّا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ. فَتَبَسَّمَ وَقَالَ: ((وَمَا أَدْرَاكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ)). ثُمَّ قَالَ: ((خُذُوا مِنْهُمْ، وَاضْرِبُوا لِي بِسَهْمٍ مَعَكُمْ)). [بخاري/ الإجازة/ ٢١٥٦]

له (ابي سعيد الخدري)ەوە (ﷺ)، کە چەند کەسێك لە یارانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرێکدا بوون تیپەڕین بەلای خێڵێك لە خێڵەکانی عەرەب، داوای میوانداریان لێکردن، بەمیوان وەریان نەگرتن، وتیان کەستان تیایە دوعاخوێن بێت؟ چونکە گەورەی خێڵ گەزراوە، یان نەخۆشە، پیاوێکیان وتی: بەڵێ، ڕۆیشت بۆ لای سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند، پیاوەکە چاك بوویەوە، مێگەلێکیان پێبەخشی، وەری نەگرت وتی: دەبێ بچم پرس بە پێغەمبەر (ﷺ) بکەم، ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی گێڕایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تەنها سورەی فاتیحەم بەسەردا خوێندوە، پێغەمبەر (ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: ((چۆن زانیت فاتیحە نوشتەیە؟)) پاشان فەرمووی: ((بڕۆن لێیان وەرگرن بەشێکیش بۆمن دانێن)).

## (٧) نوشتە لەهەموو گیان لەبەرێکی ژەهراوی

١٣٨٠ـ عَنْ الْأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنِ الرُّقْيَةِ؟ فَقَالَتْ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فِي الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ. [بخاري/ الطب/ ٥٤٠٩]

(اسود)دەڵێ: پرسیارم کرد لە (عائشة) سەبارەت بەنوشتە، فەرمووی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەی داوە بە بنەماڵەیەکی (انصار) نوشتە بکەن لە هەموو گیاندارێکی ژەهراوی.

## (٨) نوشتە لەنەخۆشی پێست

١٣٨١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْعَيْنِ، وَالْحُمَةِ، وَالنَّمْلَةِ.

(انـس)ی کـوڕی (مـالك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبــەر (ﷺ) ڕێگـای داوە نوشــتە بکرێت لەچاوی پیس و گەستنی گیانداری ژەهراوی و برینی پێست.

## (٩) نوشتە لەدوپشك

١٣٨٢ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الرُّقَى، فَجَاءَ آلُ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ كَانَتْ عِنْدَنَا رُقْيَةٌ نَرْقِي بِهَا مِنَ الْعَقْرَبِ، وَإِنَّكَ نَهَيْتَ عَنِ الرُّقَى. قَالَ: فَعَرَضُوهَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: ((مَا أَرَى بَأْسًا، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَنْفَعَ أَخَاهُ فَلْيَنْفَعْهُ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کرد لە نوشتە، بنەماڵەی (عمرو)ی کوڕی (حزم) هـاتن بـۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، وتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئێمـە نوشتەیەکمان هەبوو دەمانکرد بۆ دوپشك، کەچی تۆ ڕێگات گرتووە لە نوشتە، نوشـتەکەی خۆیـان بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) ڕوون کـردەوە، فـەرمووی: ((خراپـەی تیانـابینم، هەرکەس لە ئێـوە دەتوانـێ سـودێ بەبراکـەی بگەیـەنێ بـا سـودی پێبگەیەنێ)).

١٣٨٣ـ [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لَقِيتُ مِنْ عَقْرَبٍ لَدَغَتْنِي الْبَارِحَةَ. قَالَ: ((أَمَا لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ تَضُرَّكَ))].

(ابـو هریـرة) دەڵـێ: پیـاوێك هاتــە خزمــەتی پێغەمبــەر (ﷺ) وتــی: ئــەی پێغەمبــەری خــوا ئـای چ ئـازارم گەیشــت لــە دوپشــکێك ئەمشــەو گەســتمی فەرمووی: ((ئەگەر سەر لە ئێوارە بتوتایە؛ پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە زیانی ئەو شتانەی دروستی کردووە، ئەو دوپشکە زیانی بۆت نەدەبو)).

## (١٠) چاو ڕاستە ئەگەر داوای خۆشۆردنتان لێکرا خۆتان بشۆن

١٣٨٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا)).

لـە (ابــن عبــاس)ەوە (ﷺ) ئــەویش لــە پێغەمبــەرەوە (ﷺ) فەرموویــەتی: ((چاوپیسـی ڕاسـتە ئەگـەر شـتێك پێـش چـارەنوس، بکەوتایـە چـاو پێشـی

پێیدان و پاداشتی ئەو ڕاستییە بوو، دواتر لە ڕۆژی بەدری {دوهەمدا} خوا پێی بەخشین.

**(٢) پێغەمبەر (ﷺ) (مسیلمە)ی درۆزن و (عنسی) درۆزن لەخەودا دەبینێ**

١٤٣٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: قَدِمَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) الْمَدِينَةَ، فَجَعَلَ يَقُولُ: إِنْ جَعَلَ لِي مُحَمَّدٌ الْأَمْرَ مِنْ بَعْدِهِ تَبِعْتُهُ. فَقَدِمَهَا فِي بَشَرٍ كَثِيرٍ مِنْ قَوْمِهِ، فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) وَمَعَهُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ ابْنِ شَمَّاسٍ، وَفِي يَدِ النَّبِيِّ (ﷺ) قِطْعَةُ جَرِيدَةٍ، حَتَّى وَقَفَ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِي أَصْحَابِهِ، قَالَ: ((لَوْ سَأَلْتَنِي هَذِهِ الْقِطْعَةَ مَا أَعْطَيْتُكَهَا، وَلَنْ أَتَعَدَّى أَمْرَ اللَّهِ فِيكَ، وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللَّهُ، وَإِنِّي لَأُرَاكَ الَّذِي أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ، وَهَذَا ثَابِتٌ يُجِيبُكَ عَنِّي)). ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَسَأَلْتُ عَنْ قَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ): ((إِنَّكَ أُرَى الَّذِي أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ)) فَأَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا، فَأُوحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ: أَنِ انْفُخْهُمَا، فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِي، فَكَانَ أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيَّ صَاحِبَ صَنْعَاءَ، وَالْآخَرُ مُسَيْلِمَةَ صَاحِبَ الْيَمَامَةِ)). [بخاري/ المناقب/ ٣٤٢٤]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: (مسیلمە)ی درۆزن لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتە مەدینە، دەیوت: ئەگەر محمد دوای خۆی کارەکەی بداتە دەست من دوای دەکەوم، هات بۆ مەدینە لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لەگەلەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (ثابت)ی کوڕی (قیس)ی کوڕی (شماس)داهات بۆلای چڵێدارخورمای بەدەستەوە بوو، هەتا وەستابەلای (مُسیلمە)وە کەلەناو هاوڕێکانیدا بوو، فەرمووی: ((گەر داوای ئەم چڵەدارەم لێبکەیت ناتدەمێ من لە فەرمانی خوا دەرناچم دەربارەی تۆ، ئەگەر لە ڕاستیش پشت هەڵکەیت خوا سەرت دەبڕێ، من دەتبینم بەو شێوەی لەخەودا پیشانی من دراوی، ئەویش (ثابت)ە لە بریتی من وەڵامت دەداتەوە)) ئیتر بەجێی هێشت.

(ابن عباس) دەڵێ: پرسیارم کرد لەو فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ): ((تۆ وا دێیتە پێش چاوم کە من لە لەخەودا پیشانم دراوە، ئەوەی پیشانم دراوە)) أبو هریرە هەواڵی پێدام کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەکاتێکدا من خەوتبووم دوو بازنەی ئاڵتونیم دی لەهەردوو دەستمدا، زۆر بەلامەوە گران بوو، هەر لەو خەوەدا نیگام بۆ هات: فویان لێکە، فوم لێکردن بابردنی، بەدوو درۆزن خەو

پرژێنم کردن، دوای من پەیدا دەبن، یەکێکیان (عنسی) خەڵکی (صنعاء)بوو، ئەوی دیکەشیان (مسیلمة)ی خەڵکی (یمامه) بوو.

## (٣) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)

## (هەرکەس لەخەودا بمبینێ ئەوە منی دیوە).

١٤٤٠ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ، أَوْ: لَكَأَنَّمَا رَآنِي فِي الْيَقَظَةِ، لَا يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي)). وَقَالَ: فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ)). [بخاري/ التعبير/ ٦٥٩٢]

(ابو هريرة)دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((هەر کەس لەخەودا من ببینێ ئەوە لە بێداریشدا هەر دەمبینێ، یان: وەك ئەوە وەهایە لە بێداریدا منی دیبێ، شەیتان نایەتە شێوەی منەوە)).

ابو هريره وتی: لە (ابو سلمة)ەوە: لە (ابو قتادة)ەوە : کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس منی لەخەودا بینی ئەوە هەقی بینیوە)) {واتە: خەوەکەی ڕاستە و هەڵەشەو پەڵەشە نیە}.

## (٤) خەوی باش لەخواوەیە خەوی خراپ لە شەیتانەوەیە

١٤٤١ـ عن أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ (ﷺ) يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ)). فَقَالَ: إِنْ كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا أَثْقَلَ عَلَيَّ مِنْ جَبَلٍ، فَمَا هُوَ إِلَّا أَنْ سَمِعْتُ بِهَذَا الْحَدِيثِ فَمَا أُبَالِيهَا. [بخاري/ الطب/ ٥٤١٥]

(أبي سلمة)دەڵێ: لە (ابو قتادة)م بیستووە دەیوت: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە، دەیفەرموو: ((خەوی باش لەخواوەیە خەوی خراپ لەشەیتانەوە، ئەگەر یەکێ لە ئێوە خەوێکی دی پێی ناخۆش بوو باسێ‌جار تف بکات بەلای چەپیدا و، پەنابگرێت بەخوا لە خراپەی ئەو خەوە ئیتر ئەو خەوە زیانی پێناگەیەنێت)).

(ابو سلمه) دەڵێ: خەوی وام دەبینی لە کێوێك قورستر بوو بەلامەوە هەتا ئەم فەرموودەیەم بیست ئیتر دوای ئەوە گوێم نەئەدایە.

## (٥) خەوی چاك لە خواوەیە هەركەس شتێكی بینی پێی ناخۆش بوو با نەیگێڕێتەوە

١٤٤٢ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: إِنْ كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي، قَالَ: فَلَقِيتُ أَبَا قَتَادَةَ فَقَالَ: وَأَنَا كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((إِن الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّه، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلَا يُحَدِّثْ بِهَا إِلَّا مَنْ يُحِبُّ. وَإِنْ رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّـهِ مِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشَرِّهَا، وَلَا يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ)). [بخاري/ التعبير/ ٦٦٣٧]

(أبي مسلمة)دەڵێ: من خەوی وام دەبینی نەخۆشی دەخستم تاگەیشتم بە (أبو قتادة) ئەویش وتی: منیش خەوم دەبینی نەخۆشی دەخستم هەتا بیستم لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((بەڕاستی خەوی چاك لەخواوەیە، هەركەس لە ئێوە خەوێكی بینی پێیخۆش بوو باسی نەكات لای كەسێ نەبێ‌كە خۆشی دەوێ، ئەگەر شتێكی بینی بەلایەوە ناخۆش بوو باسێ جار تف بكات بەلای چەپیدا وپەنابگرێت بەخوا لە خراپەی شەیتان و خراپەی ئەو خەوە، بۆ كەسیشی نەگێڕێتەوە، ئیتر ئەوخەوە زیانی بۆی نابێت)).

## (٦) ئەگەر خەوێكی بینی پێی ناخۆش بوو با پەنا بگرێت بەخواو خۆی وەربگێڕێت و لەسەر لاكەی تری بخەوێت

١٤٤٣ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلَاثًا، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ)).

لە (جابر)ەوە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((ئەگەر یەكێ لەئێوە خەوێكی ناخۆشی بینی باسێ جار تف بكات بەلای چەپیدا و، سێ‌جار پەنابگرێت بەخوا و، خۆی وەربگێڕێت لەو لایەی لەسەری خەوتووە)).

## (٧) خەوی باوەڕدار بەشێكە لەچل وشەش بەشی پێغەمبەرایەتی

١٤٤٤ـ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ): ((رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ)). [بخاري/ التعبير/ ٦٥٨٦]

(عبادة)ی كوڕی (صامت) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خەوی باوەڕدار بەشێكە لە چل وشەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).

## (٨) خەوی چاك بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی

١٤٤٥ـ مكرر ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ)) بخاری / التعبير / ٦٥٦٨.

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خەوی چاك بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی)).

## (٩) هەرکات ئاخر زەمان نزیك بوویەوە خەوی موسڵمان زۆربەی دێتەدی

١٤٤٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا، وَرُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ، وَالرُّؤْيَا ثَلَاثَةٌ: فَرُؤْيَا الصَّالِحَةِ بُشْرَى مِنَ اللَّهِ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ، فَإِنْ رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ، وَلَا يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ)). قَالَ: ((وَأُحِبُّ الْقَيْدَ وَأَكْرَهُ الْغُلَّ، وَالْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ)). فَلَا أَدْرِي هُوَ فِي الْحَدِيثِ أَمْ قَالَهُ ابْنُ سِيرِينَ. [بخاري/ التعبير/ ٦٦١٤]

لە(أبو هريرة)وە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکات دوا رۆژ نزیك بوویەوە نزیکە خەوی موسڵمان بەدرۆ دەرنەچێ، ئەوەتان کە زۆرترین خەوی بەراست دەگەڕێ ڕاستگۆترینتانە، خەوی موسڵمان بەشێکە لە چل و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتی، خەو سێ جۆرە خەوی چاك مـوژدەی خواییـیە، خـەوی خەفـەتئامێز لەشـەیتانەوەیە، خـەوێکیش دالغـەی دەروونـی ئـەو کەسەخۆیەتی، ئەگەر یەکێ لە ئێوە خەوی ناخۆشی بینی باهەستێ و نوێـژ بکات و، بۆ خەڵکی نەگێڕێتـەوە)). (ڕاوی) فەرمودەکە دەڵـێ: مـن پێوەنـدم پێخۆشە و کۆتی ملم پێناخۆشە، پێوەند دامەزراوییـە لـە ئایندا، نازانم ئەوە لەفەرموودەکەدا بووەیان: ابن سيرين وتوویەتی.

## (١٠) ئەوەی دەربارەی خەو پرژێن هاتووە

١٤٤٧ـ عَنْ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَجُلًا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَرَى اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطُفُ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ، فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا بِأَيْدِيهِمْ، فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ، وَأَرَى سَبَبًا وَاصِلًا مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ، فَأَرَاكَ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ،

ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَعَلَا، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلَا، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ بِهِ، ثُمَّ وُصِلَ لَهُ فَعَلَا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ، وَاللَّهِ لَتَدَعَنِّي فَلَأَعْبُرَنَّهَا. قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اعْبُرْهَا)). قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَظُلَّةُ الْإِسْلَامِ، وَأَمَّا الَّذِي يَنْطِفُ مِنَ السَّمْنِ وَالْعَسَلِ فَالْقُرْآنُ حَلَاوَتُهُ وَلِينُهُ، وَأَمَّا مَا يَتَكَفَّفُ النَّاسُ مِنْ ذَلِكَ فَالْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآنِ وَالْمُسْتَقِلُّ [منه]. وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِي أَنْتَ عَلَيْهِ. تَأْخُذُ بِهِ، فَيُعْلِيكَ اللَّهُ [بِهِ]، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ، ثُمَّ يُوصَلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ، فَأَخْبِرْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ [وامي]، أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا)). قَالَ: فَوَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّي مَا الَّذِي أَخْطَأْتُ؟ قَالَ: ((لَا تُقْسِمْ)). [بخاري/ التعبير/ ٦٦٣٩]

لە (عبید اللە)ی كوڕی (عبداللە) ی كـوڕی (عتبـە)وە كـە (ابـن عبـاس)(ﷺ) فەرموودەیـەكی گێڕایـەوە: كـە پیـاوێك هـات بـۆ لای پێغەمبــەر (ﷺ) وتــی: ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ئەمشەو لەخەودا دیم پارچە هەورێك ڕۆن و هەنگوینی لێدەتكا، خەڵكم دەبینـی دەسـتیان بـۆ دەگرتـەوە، هـەیانبوو زۆری دەگرتـەوە، هەیانبوو كەم، گوریسێكم بینی لە ئاسمانەوە شۆڕ بوبویەوە بۆسەر زەمین، تۆم دی ئەوگوریسەت گرت وپێیدا سەركەوتی، دوای تۆ پیاوێك گرتی و سەركەوت، دوای ئەویش پیاوێكی تر گرتی وسەركەوت، دوای ئەویش پیاوێكی تر گرتـی و بچڕا، بۆیان گەیاندەوەیەك و سەركەوت. (ابوبكر)(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا -بـاوكم فیداتبـێ- سـوێند بـەخوا لێـم دەگـەڕێی خـەوبرژێنی دەكـەم. پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: ((خـەو پرژێنـی بكـە)) ابوبكر وتـی: پارچـە هـەورەكـە سێبەری ئیسلامە، ئەوەیشی لێی دەتكا لـەڕۆن و هـەنگوین شـیرینی و نـەرم و نیانی قورئانە، ئەوەیشی خـەڵك دەیانگرتـەوە زۆر وەرگرتنیانە لە قورئان، یـان كەم وەرگرتنیانە لـەو. ئـەو گوریسـەش لـە ئاسمانـەوە هـاتبووە سەر زەمین ئەو ڕاستییەیە تۆی لەسەری و دەستی پێوەدەگریت و خوابەرزت دەكاتـەوە پێـی، دوای تۆ پیاوێكی تر دەیگرێ و پێی بەرز دەبێتەوە، دوای ئەویش پیاوێكی تر دەیگرێ و پێی بەرز دەبێتەوە دوای ئەویش پیاوێكی تر دەیگرێت و دەبچڕێ، ئەمجا بۆی گرێدەدەنەوە و پیاسەردەكەوێت، هەواڵم بدەرێ ئـەی پێغەمبـەری

خوا باوك و{دايكم} فيدات بىٚ- ئايا پيٚكام يان هەڵەم كـرد؟ پيٚغەمبـەر (ﷺ) فەرمووى: ((هەنديٚكت پيٚكا و هەنديٚكت هەڵە كرد)) وتـى: سويٚند بەخوا ئەى پيٚغەمبەرى خوا دەبىٚ پيٚم بلٚيى چيم هەڵەكرد؟ فەرمووى: ((سويٚند مەخۆ)).

## (١١) ئەوەى لەخەودا شەيتان يارى پيٚكردووە نەيگيٚڕيٚتەوە

١٤٤٨ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ أعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ رَأسِي ضُرِبَ فَتَدَحْرَجَ، فَاشْتَدَدْتُ عَلَى أثَرِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) [لِلْأَعْرَابِيِّ]: ((لَا تُحَدِّثْ النَّاسَ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِكَ فِي مَنَامِكَ)). وَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَخْطُبُ فَقَالَ: ((لَا يُحَدِّثَنَّ أحَدُكُمْ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِهِ فِي مَنَامِهِ)).

(جابر)ى كوڕى (عبدالله)(ﷺ) دەڵێ: دەشتەكييەك هاتە خزمەت پيٚغەمبەر (ﷺ) وتى: ئەى پيٚغەمبـەرى خوا، لەخەودا ديم سەرم پەڕيٚنرا و غل بوويـەوە، بەتوندى ڕام دەكـرد بەدوايدا. پيٚغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووى {بەدەشـتەكيەكە}: ((قسـە مەكـە بـۆ خـەڵك كـە شـەيتان لەخـەوتدا يـارى پيٚكردويـت)). (جـابر) فەرمووى: بيستومە لە پيٚغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى: ((هيچ كەس لە ئيٚوە باسى ئەوە نەكات كە شەيتان يارى پيٚكردووە)).

## (٥١) بەشی پلەوپایەکان (كتاب الفضائل)
## پلەوپایەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

### (١) هەڵبژاردنی پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٤٩. عن وَاثِلَةَ بْنَ الْأَسْقَعِ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ اللَّهَ (عز وجل) اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَعِيلَ (عليه السلام)، وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ)).

(واثلـه)ی کـوڕی (الاسـقع) (رضي الله عنه) دەڵـێ: لـە پێغەمبـەرم (ﷺ) بیسـتووە دەیفـەرموو: ((خـوای گـەورە لـە ڕۆڵـەکانی (إسمـاعیل) (عليه السلام) (كنانـة)ەی هەڵبژاردووە، لە (كنانـة)یش قورەیشـی هـەڵبژاردووە، لـە قورەیشیش نـەوەی هاشمی هەڵبژاردووە، لەنەوەی هاشمیش منی هەڵبژاردووە.

### (٢) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): (من گەورەی ڕۆڵەکانی ئادەمم)

١٤٥٠- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ، وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ)).

(ابو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا من گـەورەی ڕۆڵـەکانی ئـادەمم، یەکـەم کەسیشـم سـەرلە گـۆڕ دێنمـە دەر، یەکـەم شەفاعەتکارم و یەکەم شەفاعەت وەرگیراوم)).

### (٣) نموونە بۆ ئەو ڕێنمایی و زانستەی خوا بە پێغەمبەردا (ﷺ) ناردویەتی

١٤٥١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ مَثَلَ مَا بَعَثَنِيَ اللَّهُ بِهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَصَابَ أَرْضًا، فَكَانَتْ مِنْهَا طَائِفَةٌ طَيِّبَةٌ قَبِلَتِ الْمَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الْكَلَأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ. وَكَانَ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ الْمَاءَ، فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ فَشَرِبُوا مِنْهَا وَسَقَوْا وَرَعَوْا. وَأَصَابَ طَائِفَةً مِنْهَا أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لَا تُمْسِكُ مَاءً وَلَا تُنْبِتُ كَلَأً. فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللَّهِ وَنَفَعَهُ بِمَا بَعَثَنِيَ اللَّهُ بِهِ، فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ)). [بخاري/ العلم/ ٧٩]

(ابو موسى الأشعري)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بەڕاستی نموونەی ئەم ڕێنمایی و زانستەی خوای گەورە بە مندا ناردویەتی وەك بارانێك وەهایە دەدا لەزەوییەك، ئەو زەوییە بەشێکی بەپیتە ئاوەکە هەڵدەمژێ ، ڕوەك و گژوگیـــای زۆر دەڕوێنـــێ، هەندێکیشـــی خـــاکێکی بێپیتـــە ئاوەکـــەی تیادەمێنێتەوە و خوا دەیکـات بـەهۆی سـوودی خـەڵکی ئـاوی لێدەخۆنـەوە و ئاژەڵ و مەزرای پێئاودەدەن، هەر ئەو بارانە دەدات لەپارچەیـەکی تـری ئـەو ئەرزە کە تەخت و کرێنە نەئاو هەڵدەگرێت و نەگیا سەوز دەکات، ئەم نموونانە: بۆ کەسێکە کە شارەزا بوبێت لە ئاینی خوای (ﷻ) و خوا سودی پێبەخشیبێ بـەو پەیامـەی بـەمندا ناردویـەتی، خـۆی فـێربووە و خەڵکیشـی فـێرکردووە، هـەروەها نموونـەی کەسێکیشـە کە ئەو پەیامەی پشت گـوێ خسـتووە و ئـەو ڕێنمایییەی وەرنەگرتووە کە منی بۆ ڕەوانەکردووە)).

١٤٥٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ مَا بَعَثَنِـيَ اللَّهُ بِهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمَهُ، فَقَالَ: يَا قَوْمِ إِنِّـي رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَـيَّ، وَإِنِّـي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ، فَالنَّجَاءَ. فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِهِ فَأَدْلَجُوا فَانْطَلَقُوا عَلَى مُهْلَتِهِمْ، وَكَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ، فَأَهْلَكَهُمْ وَاجْتَاحَهُمْ، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَنِي وَاتَّبَعَ مَا جِئْتُ بِهِ، وَمَثَلُ مَنْ عَصَانِي وَكَذَّبَ مَا جِئْتُ بِهِ مِنَ الْحَقِّ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١١٧]

لە(ابو موسى)وە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((نموونـەی مـن و ئەو پەیامەی خوا منی پێناردوە، وەك پیاوێك وەهایە چووەتـە لای گەلەکەی و پێی وتوون: ئەی گەلەکەم من بەم دووچاوی خۆمە سوپاکەم بینی و، مـن هـاوار بەدەمی ڕووت و قوتم[1]، فریای خۆتان کەون، کۆمەڵێك لـە گەلەکەی بەقسـەیان کرد و هەر سەر لـەئێوارە کەوتنـە ڕێ لەسـەرخۆ و بەئارامی، کۆمەڵێکی تـر لـەو گەلە هەواڵەکەیان بەدرۆ زانی لەشوێنی خۆیان نـەجوڵان تابـەیانی سـوپاکە دای بەسەریاندا، لەناوی بردن و لە بنی هێنان، ئەمە نموونەی ئەو کەسەیە بەقسەی

---

[1] هاواربـەدەمی ڕووت و قوت (النذیر العریان) زاراوەیـەکی عەرەبییـە لـەکاتی ترسـی کـوت وپڕدا بەکاری دێنن.بڕوانە (لسان العرب) مادة (نذر)

منی كردووە و دوای ئەو پەیامە كەوتووە كە هێناومە، نموونەی ئەو كەسەیش لەمن یاخی بووە و، ئەو پەیامە ڕاستەی من پێی هاتووم ئەو بەدرۆی زانیوە)).

### (٤) كۆتـایی هاتـنی پێغەمبەران بە پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٥٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَثَلِي وَمَثَلُ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بُنْيَانًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ، إِلَّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ مِنْ زَوَايَاهُ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ: هَلَّا وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ؟ قَالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ)). [بخاري/ المناقب/ ٣٣٤٢]

لە(ابـو هریـرة)وە، كـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((نموونـەی مـن و پێغەمبـەرانی پێش من وەك نموونـەی پیـاوێك وەهایـە كـە بینایـەكی دروست كردووە و زۆر چاك و جوانـی كـردووە، تەنها جێگـای یـەك خشـت نـەبێت، لـە سوچێك لە سوچەكانیدا، خەڵك بەدەوریدا دەگەڕێن و سەرسام دەبن و دەڵێن: ئەی ئەم خشتە بۆچ دانـەنراوە؟ فەرمووی: من ئـەو خشـتەم و مـن سـەرمۆری پێغەمبەرانم)).

### (٥) سڵاوكردنی بەرد لە پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٥٤ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنِّي لَأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ، إِنِّي لَأَعْرِفُهُ الْآنَ)).

(جـابر)ی كـوڕی (سمـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((مـن بەردێك دەناسم لە مەككەدا پێش ئەوەی بكرێم بە پێغەمبەر سەلامی لێدەكردم، من ئێستە دەیناسم)).

### (٦) هەڵقوڵاندنی ئاو لەنێو پەنجەكانی پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٥٥ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) وَأَصْحَابَهُ بِالزَّوْرَاءِ -قَالَ: وَالزَّوْرَاءُ بِالْمَدِينَةِ عِنْدَ السُّوقِ وَالْمَسْجِدِ فِيمَا ثَمَّهْ- دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ، فَوَضَعَ كَفَّهُ فِيهِ فَجَعَلَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ جَمِيعُ أَصْحَابِهِ. قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانُوا يَا أَبَا حَمْزَةَ؟ قَالَ: كَانُوا زُهَاءَ الثَّلَاثِ مِائَةِ. [بخاري/ الوضوء/ ١٦٧]

لە (انس)ی كـوڕی (مـالك)ەوە (ﷺ) كە پێغەمبـەری خـوا و(ﷺ) یارەكـانی لە (زوراء)دابـوون، -دەڵـێ زوراء جێگایەكـە لـە مەدینـە لای بـازاڕ و مزگەوتدایـە لەكاتێكدا لەوێ بوو- بانگی كرد جامۆڵكەیەك ئاوی بۆ بهێنن لـەپی خستە نـاو ئاوەكە، ئاو لە نێوان پەنجەكانی هەڵدەقوڵا، هەموو یارەكانی دەسنوێژیان گرت،

{قتادە}دەڵێ: وتم چەند کەس بوون ئەی باوکی حەمزە؟ وتی: ئەندازەی سێصەد کەس دە بوون.

### (٧) نیشانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەئاودا

١٤٥٦ـ عن مُعَاذ بْنَ جَبَلٍ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللّه (ﷺ) عَامَ غَزْوَةِ تَبُوك، فَكَانَ يَجْمَعُ الصَّلَاةَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمًا أَخَّرَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَ ذَلِكَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، ثُمَّ قَالَ: ((إِنَّكُمْ سَتَأْتُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ [تعالى] عَيْنَ تَبُوك، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَأْتُوهَا حَتَّى يُضْحِيَ النَّهَارُ، فَمَنْ جَاءَهَا مِنْكُمْ فَلَا يَمَسَّ مِنْ مَائِهَا شَيْئًا حَتَّى آتِيَ)). فَجِئْنَاهَا وَقَدْ سَبَقَنَا إِلَيْهَا رَجُلَانِ، وَالْعَيْنُ مِثْلُ الشِّرَاك، تَبِضُّ بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، قَالَ: فَسَأَلَهُمَا رَسُولُ اللّه (ﷺ): ((هَلْ مَسَسْتُمَا مِنْ مَائِهَا شَيْئًا)). قَالَا: نَعَمْ، فَسَبَّهُمَا النَّبِيُّ (ﷺ)، وَقَالَ لَهُمَا مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، قَالَ: ثُمَّ غَرَفُوا بِأَيْدِيهِمْ مِنَ الْعَيْنِ قَلِيلًا قَلِيلًا، حَتَّى اجْتَمَعَ [فِي] شَيْءٍ، [قَالَ]: وَغَسَلَ رَسُولُ اللّه (ﷺ) فِيهِ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ ثُمَّ أَعَادَهُ فِيهَا فَجَرَتِ الْعَيْنُ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ –أَوْ قَالَ: غَزِيرٍ، شَكَّ أَبُو عَلِيٍّ أَيُّهُمَا قَالَ– حَتَّى اسْتَقَى النَّاسُ، ثُمَّ قَالَ: ((يُوشِكُ يَا مُعَاذُ –إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ– أَنْ تَرَى مَا هَاهُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا)).

(معاذ)ی کوڕی (جبل)(ﷺ) دەڵێ: دەرچووین لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) ساڵی غەزای تەبوك، نوێژەکانی کۆدەکردەوە، نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کرد، مەغریب و عیشایشی پێکەوە کرد، هەتا ڕۆژێك نوێژەکەی دواخست، لەپاشدا دەرچو نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کرد و هاتەوە ژوور، لەپاشدا دەرچوو مەغریب و عیشای پێکەوە کرد، ئەمجا فەرمووی: ((ئێوە سبەینێ –انشاء الله– [تعالى] دەگەنە سەرکانیاوی تەبوك، نایشگەنە ئەوێ تا خۆر بەرز دەبێتەوە، هەر کەس لە ئێوە چووە سەری دەست نەدا لەئاوەکەی تا خۆم دێم))، گەیشتینە سەر کانیەکە دوو پیاومان پێش ئێمە کەوتبوون، ئاوەکە وەك سیرمەی کەوش باریك بوو، کەمێ ئاوی لێهەڵ دەقولا (معاذ)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەودوانەی پرسی: ((ئایا دەستتان داوە لە ئاوەکە؟)) وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەندەی خوا حەزبکات قسەی پێوتن، دەڵێ: لەپاشدا [خەڵکەکە] بەدەستیان کەم کەم لە کانیاوەکەیان هەڵگۆست هەتا کۆبوویەوە [لە] شتێکدا، (معاذ)دەڵێ:

پێغەمبـەری خـوا لەوشـتەدا هـەردوو دەسـت و دەموچـاوی شـۆرد، لەپاشـدا ئاوەکەی ڕۆکردەوە ناوکانییەکە، کانییەکە تـەقی بەئاوێکی لافاو -یـان وتـی: زۆر، باوکی علی لـە گۆماندایـە کامیـانی فـەرموو- هـەتا خـەڵك گشـتی ئـاوی خواردەوە، ئەمجا فەرمووی: ((ئەی معاذ، دوور نیە -ئەگەر تەمەنت درێژ بوو- ئەم دەڤەرە ببینیت پڕبووە لە باخ و باخات)).

## (٨) بەرەكەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە خواردندا

١٤٥٧ـ عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) يَسْتَطْعِمُهُ، فَأَطْعَمَهُ شَطْرَ وَسْقِ شَعِيرٍ، فَمَا زَالَ الرَّجُلُ يَأْكُلُ مِنْهُ وَامْرَأَتُهُ وَضَيْفُهُمَا حَتَّى كَالَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: ((لَوْ لَمْ تَكِلْهُ لَأَكَلْتُمْ مِنْهُ، وَلَقَامَ لَكُمْ)).

لە(جابر)ەوە (رضي الله عنه) کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) داوای خواردنی لێکرد، نیوەی ویسقێك جۆی پێبەخشی، ئەو پیاوە خۆی و خێزانی و میوانی لێیـان دەخـوارد، هـەتا پێـوای، دوای ئـەوە هاتـەوە خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر نەتپێوایێ هەر لێتان دەخوارد و دەمایەوە بۆتان)).

١٤٥٨ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا حُفِرَ الْخَنْدَقُ رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) خَمَصًا، فَانْكَفَأْتُ إِلَى امْرَأَتِي فَقُلْتُ لَهَا: هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ فَإِنِّي رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) خَمَصًا شَدِيدًا، فَأَخْرَجَتْ لِي جِرَابًا فِيهِ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَلَنَا بُهَيْمَةٌ دَاجِنٌ، قَالَ: فَذَبَحْتُهَا وَطَحَنَتْ فَفَرَغَتْ إِلَى فَرَاغِي، فَقَطَّعْتُهَا فِي بُرْمَتِهَا، ثُمَّ وَلَّيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: لَا تَفْضَحْنِي بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَمَنْ مَعَهُ، قَالَ: فَجِئْتُهُ فَسَارَرْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا قَدْ ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا وَطَحَنَتْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ كَانَ عِنْدَنَا، فَتَعَالَ أَنْتَ فِي نَفَرٍ مَعَكَ. فَصَاحَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَقَالَ: ((يَا أَهْلَ الْخَنْدَقِ، إِنَّ جَابِرًا قَدْ صَنَعَ لَكُمْ سُورًا، فَحَيَّ هَلًا بِكُمْ)). وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تُنْزِلُنَّ بُرْمَتَكُمْ، وَلَا تَخْبِزُنَّ عَجِينَتَكُمْ حَتَّى أَجِيءَ)). فَجِئْتُ وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقْدُمُ النَّاسَ، حَتَّى جِئْتُ امْرَأَتِي، فَقَالَتْ: بِكَ وَبِكَ! فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ الَّذِي قُلْتِ لِي، فَأَخْرَجْتُ لَهُ عَجِينَتَنَا فَبَصَقَ فِيهَا وَبَارَكَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى بُرْمَتِنَا فَبَصَقَ فِيهَا وَبَارَكَ، ثُمَّ قَالَ: ((ادْعِي خَابِزَةً فَلْتَخْبِزْ مَعَكِ، وَاقْدَحِي مِنْ بُرْمَتِكُمْ وَلَا تُنْزِلُوهَا)). وَهُمْ أَلْفٌ، فَأُقْسِمُ بِاللَّهِ لَأَكَلُوا حَتَّى تَرَكُوهُ، وَانْحَرَفُوا وَإِنَّ بُرْمَتَنَا لَتَغِطُّ كَمَا هِيَ، وَإِنَّ عَجِينَتَنَا -أَوْ كَمَا قَالَ الضَّحَّاكُ- لَتُخْبَزُ كَمَا هُوَ. [بخاري/ المغازي/ ٣٨٧٦]

(جابر)ى كـوڕى (عبـدالله)(ﷺ) دەڵـێ: لـەكاتێكدا خەنـەك هەڵدەكـەنرا ديـم پێغەمبـەر (ﷺ) برسييەتى، گەڕامـەوە بۆ لاىخێزانم و پێم وت: ئايـە هيچـت لا هەيە؟ من برسييەتىيەكى زۆرم بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بينى، توێشەبەرەيەكى بۆ دەرهێنـام مەنێ جۆى تێدابوو، كـاوڕێكى بچكۆلـەى ماڵيشـمان هـەبوو سـەرم بڕى، خێزانيشم جۆكەى هاڕى و لەگەڵ لێبوونـەوەى مندا ئەويش لىبوويـەوە، گۆشـتەكەم ورد كـردە نـاو مەنجەڵەكـەى خـێزانم، پاشـان گەڕامـەوە، بـۆلاى پێغەمبەر (ﷺ)، خێزانم وتى: ئابڕوم مەبە، پێغەمبـەر (ﷺ) و ئەوەى لەگەڵيدايـە بيهێنى، دەڵێ: هاتمـە خزمـەتى چرپـاندم بەگوێيدا، وتم: ئەى پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) ئێمە كاوڕێكمان سەربڕيوە، مەنێ جۆيشمان هـەبوو خێزانم هاڕيويـەتى، تۆ و چەند كەسێك لەگەڵ خۆت بفەرموون، پێغەمبەر (ﷺ) هـاوارى كـرد: ((ئـەى خــەڵكى خــەندەق جــابر دەعوەتــى بۆكــردوون خــێرا وەرن)) پێغەمبـــەر (ﷺ) فەرمووى: ((مەنجەڵەكە دامـەگرن و هەويرەكـەش مەكـەن بـەنان تـا دێـم)). مـن هاتمەوە، پێغەمبەريش (ﷺ) پێش خەڵكەكە كەوتبوو هات، هـەتا گەيشـتمە لاى خێزانم، وتى: تـۆ واو تـۆوا! وتم: ئـەوەى تـۆ پێـت وتم: وەهـام كـرد. هەويـرەكـەم دەرهێنا بۆ {پێغەمبـەر (ﷺ)} تفـى تێكـردوو دوعـاى بەرەكـەتى بۆكـرد، ئـەمجا ڕۆيشـت بۆ لاى مەنجەڵەكە و تفى تێكـرد و دوعـاى بەرەكـەتىبۆ كـرد، پاشـان بەخێزانمى فەرموو: ((ئافرەتێك بانگ بكە نانت لەگەڵ بكـات، لـەو مەنجەڵـەيش هەڵبگۆزن و دايمەگرن)) ئامادەبوان هەزار كەس بـوون، سوێندم بـەخوا هـەموو نانيان خوارد تا خۆيان وازيان هێنا و ڕۆيشتن، هێشـتا، مەنجەڵەكـەمان پـڕ بـوو وەك خۆى، هەويرەكەيشمان نانى لێدەكرا وەك خۆى.

١٤٥٩ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ) قَالَ: كُنَّـا مَعَ النَّبِـيِّ (ﷺ) ثَلَـاثِينَ وَمِائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَـامٌ)). فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَـاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ، ثُـمَّ جَـاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ بِغَنَمٍ يَسُـوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَبَيْعٌ أَمْ عَطِيَّةٌ)). أَوْ قَالَ: ((أَمْ هِبَةٌ)). فَقَالَ: لَا بَلْ بَيْعٌ، فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً، فَصُنِعَتْ، وَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِسَوَادِ الْبَطْنِ أَنْ يُشْوَى، قَالَ: وَايْمُ اللَّهِ، مَا مِنَ الثَّلَاثِينَ وَمِائَةٍ إِلَّا حَزَّ لَـهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حُـزَّةً [حُـزَّةً] مِنْ سَوَادِ بَطْنِـهَا، إِنْ كَانَ شَاهِدًا أَعْطَاهُ، وَإِنْ كَانَ غَائِبًا خَبَأَ لَـهُ، قَالَ: وَجَعَلَ قَصْعَتَيْـنِ، فَأَكَلْنَـا مِنْـهُمَا

أَجْمَعُونَ وَشَبِعْنَا، وَفَضَلَ فِـي الْقَصْعَتَيْـنِ، فَحَمَلْتُـهُ عَلَـى الْبَعِـيرِ. أَوْ كَمَـا قَـالَ.
[بخاري/ الهبة/ ٢٤٧٥]

(عبدالرحمـن)ی كـوڕی (ابـو بكـر) (ﷺ) دەڵـێ: صـەد و سـیكەس لەگـەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، فەرمووی: ((ئایە كەستان خواردنتان پێیە؟)) پیاوێك مەنێ، یان نزیكی مەنێ خواردنی پێبوو، كرابەهـەویر، دوای ئەوە پیاوێكی موشـریكی قژگفی درێـژ هـات بڕگەیـەك مـەڕی دابـوو لەبـەر، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((فرۆشتنە، یان بەخشینە؟)) وتی: نەخێر فرۆشتنە، مەڕێكی لێكڕی كرا بە {مەرگە} ئەمجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دا جگەرەكەی ببرژێنرێ، عبدالرحمـن دەڵـێ: سـوێندم بـەخوا ئـەو صـەد و سی كەسـە كەسـی نـەماوە پێغەمبـەر (ﷺ) پارچەیـەك لـەو جگـەرەی بۆلێنەكاتـەوە، ئەگـەر حازر بوایە پێـی ئـەدا، ئەگـەر لەوێش ئەبوایـە بـۆی هـەڵدەگرت، دەڵـێ: هەرلـەو مەڕە دولەگـەن چێشـتی دروسـت كـرد هـەموو لێمـان خـوارد و تـێربووین، لێیشـی مایـەوە و خستمە سەرپشتی وشترەكە.

١٤٦٠ـ عن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ): أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا نَاسًا فُقَرَاءَ، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ مَـرَّةً: ((مَنْ كَـانَ عِنْـدَهُ طَعَـامُ اثْنَيْـنِ فَلْيَذْهَـبْ بِثَلَاثَةٍ، وَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ أَرْبَعَةٍ فَلْيَذْهَبْ بِخَامِسٍ، بِسَادِسٍ)). أَوْ كَمَا قَالَ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلَاثَةٍ، وَانْطَلَقَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) بِعَشَرَةٍ وَأَبُو بَكْرٍ بِثَلَاثَةٍ، قَالَ: فَهُوَ وَأَنَا وَأَبِي وَأُمِّي، وَلَا أَدْرِي هَلْ قَالَ: وَامْرَأَتِي وَخَادِمٌ بَيْنَ بَيْتِنَا وَبَيْتِ أَبِي بَكْرٍ، [قَالَ]: وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ (ﷺ) تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) ثُمَّ لَبِثَ حَتَّى صُلِّيَتِ الْعِشَاءُ، ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِثَ حَتَّى نَعَسَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَجَاءَ بَعْدَمَا مَضَى مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ، قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ: مَا حَبَسَكَ عَنْ أَضْيَافِكَ؟ -أَوْ قَالَتْ: ضَيْفِكَ- قَالَ: أَوَ مَا عَشَّيْتِهِمْ، قَالَتْ: أَبَوْا حَتَّى تَجِيءَ، قَدْ عَرَضُوا عَلَيْهِمْ فَغَلَبُوهُمْ، قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ، وَقَالَ: يَا غُنْثَرُ، فَجَدَّعَ وَسَبَّ، وَقَالَ: كُلُوا لَا هَنِيئًا، وَقَالَ: وَاللَّهِ لَا أَطْعَمُهُ أَبَدًا، قَالَ: فَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذُ مِنْ لُقْمَةٍ، إِلَّا رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرَ مِنْهَا، قَالَ: [حَتَّى] شَبِعْنَا وَصَارَتْ أَكْثَرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذَلِكَ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ (ﷺ)، فَإِذَا هِيَ كَمَا هِيَ أَوْ أَكْثَرُ، قَالَ لِامْرَأَتِهِ: يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ مَا هَذَا، قَالَتْ: لَا -وَقُرَّةِ عَيْنِي- لَهِيَ الْآنَ أَكْثَرُ مِنْهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِثَلَاثِ مِرَارٍ، قَالَ: فَأَكَلَ مِنْهَا أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ. يَعْنِي يَمِينَهُ، ثُمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً، ثُمَّ حَمَلَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ

(ﷺ) فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ، قَالَ: وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ، فَمَضَى الْأَجَلُ، فَعَرَّفْنَا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ، اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ، قَالَ: إِلَّا أَنَّهُ بَعَثَ مَعَهُمْ فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ. أَوْ كَمَا قَالَ. [بخاري/ مواقيت الصلاة/ ٥٧٧]

له (عبدالرحمن)ی کوڕی (ابو بکر)ەوە : کە (أصحاب الصّفه)چەند کەسێکی هەژاربوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێکیان فەرمووی: ((هەر کەس خواردنی دوانی لاهەیە باسیان بەرێتەوە، هەرکەس چواری لا هەیە با پێنج، شەش بەرێتەوە)). یان شتێکی لەم جۆرەی فەرموو، (ابو بکر)هاتەوە بەسێ کەسەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت بەدەکەسەوە، ابوبکر بەسیانەوە، وتی: ئەوو من و باوکم و دایکم، نازانم ئایە وتی: خێزانم و خزمەتکارێك لە نێوان ماڵ ئێمە و ماڵ ابوبکر دا، وتی: ابوبکر نانی ئێوارەی خوارد لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پاشان لەوێ مایەوە هەتا نوێـژی عیشا کرا، دیسان گەڕایەوە و مایەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) خەو دایگرت، هاتەوە دوای ئەوەی شەو ئەوەندەی لێڕۆیی کەخوا ویستی، خێزانەکەی پێی وت: چی دوای خستی لەمیوانەکانت؟ -یان وتی: میوانەکەت- وتی: بۆچ نانی ئێوارەت نەداونێ؟ وتی: نانیان نەخوارد تا تۆ بێیتەوە نانیشیان بۆ دانان، بەڵام قسەی خۆیان سەرخست، عبدالرحمن دەڵێ: من ڕۆیشتم خۆم شاردەوە {لەترسی باوکم} بانگی لێکردم: ئەی ڕەزیل، ئەی نەزان، دوعای لێکردوم و قسەی پێوتم، وتی: نان بخۆن عافیەتتان نەبێ (والله) من قەت لەگەڵتان ناخۆم، {عبدالرحمن} دەڵێ: سوێندم بەخوا هەر پارویەکمان هەڵدەگرت لەبنەوە زیادی دەکرد زیاتر لەپاروەکە، دەڵێ: هەتا تێرمان خوارد زیاتر بوو لەجاران، (ابو بکر)(ﷺ) تەماشای کرد وەك خۆی مابوو یان زیاتر، بەخێزانەکەی وت: ئەمەچی‌یە ئەی خوشکی (بني فراس)؟ وتی: نەخێر -چاوم ڕوون- ئێستە سێ‌قات زیاترە لەجاران {عبدالرحمن} دەڵێ: ابوبکر لێی‌خوارد و وتی: ئەوەیش لە شەیتانەوە بوو. مەبەستی سوێندەکەی بوو، لەپاشدا پارویەکی لێخوارد و بردی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) شەوتابەیانی لای ئەو مایەوە، دەڵێ: لەنێوان ئێمە و قەومێك پەیمانێك هەبوو ماوەکەی تەواو بوو {هاتن بۆ مەدینە} دوانزە کەسمان لێکردن بە (عەریف) هەر یەکێ لەوانیش چەندکەسێکیان لەگەڵ بوو، خوا دەزانێ یەکی چەند کەسیان لەگەڵ بوو، بەڵام پێغەمبەر بەواندا خواردنەکەی نارد {بۆیان} هەموویان بەگشتی لێیان خوارد.

## ( ٩ ) بەرەکەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەشیردا

١٤٦١ـ عَنِ الْمِقْدَادِ (ﷺ) قَالَ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَصَاحِبَانِ لِي، وَقَدْ ذَهَبَتْ أَسْمَاعُنَا وَأَبْصَارُنَا مِنَ الْجَهْدِ، قَالَ: فَجَعَلْنَا نَعْرِضُ أَنْفُسَنَا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْهُمْ يَقْبَلُنَا، فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ (ﷺ) فَانْطَلَقَ بِنَا إِلَى أَهْلِهِ، فَإِذَا ثَلَاثَةُ أَعْنُزٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((احْتَلِبُوا هَذَا اللَّبَنَ بَيْنَنَا)). قَالَ: فَكُنَّا نَحْتَلِبُ، فَيَشْرَبُ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنَّا نَصِيبَهُ، وَنَرْفَعُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) نَصِيبَهُ، قَالَ: فَيَجِيءُ مِنَ اللَّيْلِ فَيُسَلِّمُ تَسْلِيمًا لَا يُوقِظُ، نَائِمًا وَيُسْمِعُ الْيَقْظَانَ قَالَ: ثُمَّ يَأْتِي الْمَسْجِدَ فَيُصَلِّي، ثُمَّ يَأْتِي شَرَابَهُ فَيَشْرَبُ، فَأَتَانِي الشَّيْطَانُ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَقَدْ شَرِبْتُ نَصِيبِي، فَقَالَ: مُحَمَّدٌ يَأْتِي الْأَنْصَارَ فَيُتْحِفُونَهُ وَيُصِيبُ عِنْدَهُمْ، مَا بِهِ حَاجَةٌ إِلَى هَذِهِ الْجُرْعَةِ، فَأَتَيْتُهَا فَشَرِبْتُهَا، فَلَمَّا أَنْ وَغَلَتْ فِي بَطْنِي، وَعَلِمْتُ أَنَّهُ لَيْسَ إِلَيْهَا سَبِيلٌ، قَالَ: نَدَّمَنِي الشَّيْطَانُ فَقَالَ: وَيْحَكَ مَا صَنَعْتَ؟ أَشَرِبْتَ شَرَابَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) فَيَجِيءُ فَلَا يَجِدُهُ، فَيَدْعُو عَلَيْكَ فَتَهْلِكُ، فَتَذْهَبُ دُنْيَاكَ وَآخِرَتُكَ؟ وَعَلَيَّ شَمْلَةٌ إِذَا وَضَعْتُهَا عَلَى قَدَمَيَّ خَرَجَ رَأْسِي، وَإِذَا وَضَعْتُهَا عَلَى رَأْسِي خَرَجَ قَدَمَايَ، وَجَعَلَ لَا يَجِيئُنِي النَّوْمُ، وَأَمَّا صَاحِبَايَ فَنَامَا وَلَمْ يَصْنَعَا مَا صَنَعْتُ، قَالَ: فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَسَلَّمَ، كَمَا كَانَ يُسَلِّمُ ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ فَصَلَّى ثُمَّ أَتَى شَرَابَهُ فَكَشَفَ عَنْهُ فَلَمْ يَجِدْ فِيهِ شَيْئًا، فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقُلْتُ: الْآنَ يَدْعُو عَلَيَّ فَأَهْلِكُ، فَقَالَ: ((اللَّهُمَّ أَطْعِمْ مَنْ أَطْعَمَنِي، وَأَسْقِ مَنْ أَسْقَانِي)). قَالَ: فَعَمَدْتُ إِلَى الشَّمْلَةِ فَشَدَدْتُهَا عَلَيَّ، وَأَخَذْتُ الشَّفْرَةَ فَانْطَلَقْتُ إِلَى الْأَعْنُزِ أَيُّهَا أَسْمَنُ فَأَذْبَحُهَا لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَإِذَا هِيَ حَافِلَةٌ، وَإِذَا هُنَّ حُفَّلٌ كُلُّهُنَّ، فَعَمَدْتُ إِلَى إِنَاءٍ لِآلِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) مَا كَانُوا يَطْمَعُونَ أَنْ يَحْتَلِبُوا فِيهِ، قَالَ: فَحَلَبْتُ فِيهِ حَتَّى عَلَتْهُ رَغْوَةٌ فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: ((أَشَرِبْتُمْ شَرَابَكُمُ اللَّيْلَةَ)). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْرَبْ، فَشَرِبَ ثُمَّ نَاوَلَنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْرَبْ، فَشَرِبَ ثُمَّ نَاوَلَنِي، فَلَمَّا عَرَفْتُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَدْ رَوِيَ وَأَصَبْتُ دَعْوَتَهُ، ضَحِكْتُ حَتَّى أُلْقِيتُ إِلَى الْأَرْضِ، قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((إِحْدَى سَوْآتِكَ يَا مِقْدَادُ)). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَانَ مِنْ أَمْرِي كَذَا وَكَذَا، وَفَعَلْتُ كَذَا. فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((مَا هَذِهِ إِلَّا رَحْمَةٌ مِنَ اللَّهِ أَفَلَا كُنْتَ آذَنْتَنِي فَنُوقِظَ صَاحِبَيْنَا فَيُصِيبَانِ مِنْهَا)). قَالَ: فَقُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، مَا أُبَالِي إِذَا أَصَبْتَهَا وَأَصَبْتُهَا مَعَكَ مَنْ أَصَابَهَا مِنَ النَّاسِ.

(مقداد) (ﷺ) دەڵێ: من و دوو هاوڕێکەم هاتین، ئەوەندە شەکەت و برسی بووین گوێمان نەیدەبیست و چاومان نەیدەبینی، دەڵێ: خۆمان ئاراستەی یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کرد کەس میوانداری نەکردین، هاتین بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بردینی بۆ ماڵ خۆی، سێ بزنی هەبوو فەرمووی: ((ئەم شیرە بدۆشن بۆ هەموومان)) دەڵێ: ئەماندۆشی و{بەشمان دەکرد} هەرکەس بەشی خۆی دەخوارد و بەشەکەی پێغەمبەریشمان (ﷺ) هەڵدەگرت، شەو دەهات سلاوی دەکرد، سلاوێك خەوتوی خەبەر نەدکردەوە بەلام بێدار دەیبیست، دەڵێ: لەپاشدا دەچووە مزگەوت و نوێژی دەکرد، ئەمجا دەهاتە لای بەشە شیرەکەی و دەیخواردەوە، شەوێك بەشەکەی خۆم خواردەوە شەیتان هانی دام و وتی: (محمد) دەچێتە ناو (انصار)ەکان دیاری دەدەنێ و شتی لای ئەوان دەستدەکەوێ، هیچ پێویستی بەم قومە شیرەنیە، چوم بۆی و خواردمەوە، هەرکەلە قورگم چووە خوارەوە و زانیم چارەم نەماوە، شەیتان پەشیمانی کردمەوە و وتی: ئەی کۆست کەوێ چیت کرد؟ شیرەکەی (محمد)ت (ﷺ)خواردەوە؟ ئێستە دێت و، دەبینێ شیرەکەی نەماوە، دوعات لێدەکات و،لەناو دەچیت و دنیا و پاشەڕۆژت دەڕوات، پارچە جلێکیشم بەسەرەوە بوو ئەمدا بەسەر قاچەکانمدا سەرم دەردەکەوت، ئەمدا بەسەر سەرمدا قاچەکانم دەردەکەوت، خەوم زڕابوو، بەلام دوو هاوڕێکەم {بۆخۆیان} خەوتن و ئەوەی من کردم ئەوان نەیانکرد، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هات و سەلامی کرد وەك جاران سەلامی دەکرد، پاشان هاتە مزگەوت و نوێژی کرد، ئەمجا هات بۆلای شیرەکەی سەری هەڵدایەوە هیچی تیانەدی، سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، وتم: ئێستا دوعام لێدەکات و دەفەوتێم، فەرمووی: ((ئەی خوا خۆراك بدە بەوکەسەی خۆراکم پێدەدات، ئاوو خواردنەوەیش ببەخشە بەو کەسەی پاراوم دەکات)).

دەڵێ: پەلاماری پارچە جلەکەمدا و ئالانم بەخۆمەوە، چەقۆکەم هەڵگرت چووم بۆ لای بزنەکان، تا کامیان قەڵەوە سەری بڕم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کەچی ئەوەیان گوانی پڕ بوو لەشیر، نەخێر هەموویان گوانیان پڕبوو لەشیر، چووم قاپێکی بنەماڵەی (محمد)م هێنا کەخۆیان بەهیوای ئەوە نەبوون شیری تێبدۆشن، من شیرم تێدۆشی هەتا کەف هەڵچو بەسەریدا، ئەمجا هاتم بۆ

خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا ئەمشەو شیرەکەتان خوارد؟)) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بخۆرەوە، خواردیەوە، لەپاشا دایەوە بەمن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بخۆرەوە، خواردیەوە دیسانەوە دایەوە بەمن، کاتی زانیم پێغەمبەر (ﷺ) پاراو بۆتەوە و دوعاکەیشی منی گرتەوە، پێکەنیم، ئەوەندە پێکەنیم هەتا کەوتم بەزەویدا، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمەیش یەکێکە لە کەتنەکانی خۆت ئەی مقداد)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئاوابووم و ئاوابووم، ئەوەم کرد و ئەوەم کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمە بەزەیی خوای گەورەیە، ئەی نەدەبوو ئاگادارم کەیت تادوهاورێکەی تریشمان خەبەر کەینەوە و بەشیان ببێت لەم شیرەدا؟)) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا سوێندم بەوکەسەی تۆی بەهەق ناردووە، دوای ئەوەی خۆم و خۆت لەو شیرەمان خوارد گوێ نادەمێ کێ لەوشیرە دەخوا یان نایخوا؟.

## (١٠) بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆندا

١٤٦٢ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ): أَنَّ أُمَّ مَالِكٍ (ﷺ) كَانَتْ تُهْدِي لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فِي عُكَّةٍ لَهَا سَمْنًا، فَيَأْتِيهَا بَنُوهَا فَيَسْأَلُونَ الْأُدْمَ وَلَيْسَ عِنْدَهُمْ شَيْءٌ، فَتَعْمِدُ إِلَى الَّذِي كَانَتْ تُهْدِي فِيهِ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَتَجِدُ فِيهِ سَمْنًا، فَمَا زَالَ يُقِيمُ لَهَا أُدْمَ بَيْتِهَا حَتَّى عَصَرَتْهُ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: ((عَصَرْتِيهَا)). قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: ((لَوْ تَرَكْتِيهَا مَا زَالَ قَائِماً)).

لە(جابر)ەوە (ﷺ) کە (أم مالك (ﷺ)) لە هیزەیەکی بچکۆلەی خۆی ڕۆنی بەدیاری دەنارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، کوڕەکانی دەهاتن داوای پێخۆریان لێدەکرد، خۆیان هیچیان نەبوو، پەلاماری ئەو هیزەیەی ئەدا کە ڕۆنی لێ دەنارد بەدیاری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەمووجار ڕۆنی تیادەسدەکەوت، بەوشێوە مایەوە پێخۆری ماڵەکەی بەڕێدەکرد، هەتا گوشی، {ئەمجاتیانەما} چو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((گوشیت؟)) وتی: بەڵێ فەرمووی: ((گەر وازت لێبهێنایە هەر تیا دەما)).

## (١١) ملکەچبوونی درەخت بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٦٣ـ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الْوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي نَطْلُبُ الْعِلْمَ فِي هَذَا الْحَيِّ مِنَ الْأَنْصَارِ قَبْلَ أَنْ يَهْلِكُوا، فَكَانَ أَوَّلُ مَنْ لَقِينَا أَبَا الْيَسَرِ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَمَعَهُ غُلَامٌ لَهُ مَعَهُ ضِمَامَةٌ مِنْ صُحُفٍ، وَعَلَى

أَبِي الْيَسَرِ بُرْدَةٌ وَمَعَافِرِيٌّ، وَعَلَى غُلَامِهِ بُرْدَةٌ وَمَعَافِرِيٌّ فَقَالَ لَهُ أَبِي: يَا عَمِّ إِنِّي أَرَى فِي وَجْهِكَ سَفْعَةً مِنْ غَضَبٍ. قَالَ: أَجَلْ كَانَ لِي عَلَى فُلَانِ ابْنِ فُلَانٍ الْحَرَامِيِّ مَالٌ، فَأَتَيْتُ أَهْلَهُ فَسَلَّمْتُ فَقُلْتُ: ثَمَّ هُوَ؟ قَالُوا: لَا؟ فَخَرَجَ عَلَيَّ ابْنٌ لَهُ جَفْرٌ، فَقُلْتُ: لَهُ أَيْنَ أَبُوكَ، قَالَ: سَمِعَ صَوْتَكَ فَدَخَلَ أَرِيكَةَ أُمِّي. فَقُلْتُ: اخْرُجْ إِلَيَّ، فَقَدْ عَلِمْتُ أَيْنَ أَنْتَ، فَخَرَجَ، فَقُلْتُ: مَا حَمَلَكَ عَلَى أَنِ اخْتَبَأْتَ مِنِّي؟ قَالَ: أَنَا وَاللَّهِ أُحَدِّثُكَ ثُمَّ لَا أَكْذِبُكَ، خَشِيتُ وَاللَّهِ أَنْ أُحَدِّثَكَ فَأَكْذِبَكَ، وَأَنْ أَعِدَكَ فَأُخْلِفَكَ، وَكُنْتَ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَكُنْتُ وَاللَّهِ مُعْسِرًا. قَالَ: قُلْتُ: آللَّهِ؟ قَالَ: اللَّهِ. قُلْتُ: آللَّهِ؟ قَالَ: اللَّهِ. [قُلْتُ: آللَّهِ؟ قَالَ: اللَّهِ] قَالَ: فَأَتَى بِصَحِيفَتِهِ فَمَحَاهَا بِيَدِهِ، فَقَالَ: إِنْ وَجَدْتَ قَضَاءً فَاقْضِنِي وَإِلَّا أَنْتَ فِي حِلٍّ. فَأَشْهَدُ، بَصَرُ عَيْنَيَّ هَاتَيْنِ -وَوَضَعَ إِصْبَعَيْهِ عَلَى عَيْنَيْهِ- وَسَمْعُ أُذُنَيَّ هَاتَيْنِ، وَوَعَاهُ قَلْبِي هَذَا -وَأَشَارَ إِلَى نِيَاطِ قَلْبِهِ- رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، وَهُوَ يَقُولُ: ((مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا أَوْ وَضَعَ عَنْهُ أَظَلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ)). قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ أَنَا: يَا عَمِّ لَوْ أَنَّكَ أَخَذْتَ بُرْدَةَ غُلَامِكَ وَأَعْطَيْتَهُ مَعَافِرِيَّكَ، وَأَخَذْتَ مَعَافِرِيَّهُ وَأَعْطَيْتَهُ بُرْدَتَكَ، فَكَانَتْ عَلَيْكَ حُلَّةٌ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ؟ فَمَسَحَ رَأْسِي وَقَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ، يَا ابْنَ أَخِي، بَصَرُ عَيْنَيَّ هَاتَيْنِ، وَسَمْعُ أُذُنَيَّ هَاتَيْنِ، وَوَعَاهُ قَلْبِي هَذَا، -وَأَشَارَ إِلَى نِيَاطِ قَلْبِهِ- رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ يَقُولُ: ((أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهُمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ)). وَكَانَ أَنْ أَعْطَيْتُهُ مِنْ مَتَاعِ الدُّنْيَا أَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ حَسَنَاتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ. ثُمَّ مَضَيْنَا حَتَّى أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ فِي مَسْجِدِهِ وَهُوَ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُشْتَمِلًا بِهِ. فَتَخَطَّيْتُ الْقَوْمَ حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، أَتُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ وَرِدَاؤُكَ إِلَى جَنْبِكَ؟ قَالَ: فَقَالَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي هَكَذَا -وَفَرَّقَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ وَقَوَّسَهَا- أَرَدْتُ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيَّ الْأَحْمَقُ مِثْلُكَ، فَيَرَانِي كَيْفَ أَصْنَعُ فَيَصْنَعُ مِثْلَهُ. أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي مَسْجِدِنَا هَذَا وَفِي يَدِهِ عُرْجُونُ ابْنِ طَابٍ، فَرَأَى فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ نُخَامَةً فَحَكَّهَا بِالْعُرْجُونِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا فَقَالَ: ((أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يُعْرِضَ اللَّهُ عَنْهُ)). قَالَ: فَخَشَعْنَا، ثُمَّ قَالَ: ((أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يُعْرِضَ اللَّهُ عَنْهُ)). قَالَ: فَخَشَعْنَا، ثُمَّ قَالَ: ((أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يُعْرِضَ اللَّهُ عَنْهُ)). قُلْنَا: لَا أَيُّنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ((فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قِبَلَ وَجْهِهِ، فَلَا يَبْصُقَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ، تَحْتَ رِجْلِهِ الْيُسْرَى فَإِنْ عَجِلَتْ بِهِ بَادِرَةٌ فَلْيَقُلْ بِثَوْبِهِ هَكَذَا)). ثُمَّ طَوَى ثَوْبَهُ بَعْضَهُ، عَلَى بَعْضٍ فَقَالَ: ((أَرُونِي عَبِيرًا)). فَقَامَ فَتًى

منَ الْحَيِّ يَشْتَدُّ إِلَى أَهْلِه، فَجَاءَ بِخَلُوقٍ فِي رَاحَتِه، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَجَعَلَهُ عَلَى رَأسِ الْعُرْجُونِ، ثُمَّ لَطَخَ بِهِ عَلَى أَثَرِ النُّخَامَة، فَقَالَ جَابِرٌ: فَمِنْ هُنَاكَ جَعَلْتُمُ الْخَلُوقَ فِي مَسَاجِدِكُمْ. سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ بَطْنِ بُوَاطٍ، وَهُوَ يَطْلُبُ الْمَجْدِيَّ بْنَ عَمْرٍو الْجُهَنِيَّ، وَكَانَ النَّاضِحُ يَعْقُبُهُ مِنَّا الْخَمْسَةُ وَالسِّتَّةُ وَالسَّبْعَةُ، فَدَارَتْ عُقْبَةُ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ عَلَى نَاضِحٍ لَهُ، فَأَنَاخَهُ فَرَكِبَهُ ثُمَّ بَعَثَهُ، فَتَلَدَّنَ عَلَيْهِ بَعْضَ التَّلَدُّنِ، فَقَالَ لَهُ: شَأْ لَعَنَكَ اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ هَذَا اللَّاعِنُ بَعِيرَهُ)). قَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ((انْزِلْ عَنْهُ، فَلَا تَصْحَبْنَا بِمَلْعُونٍ. لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ، وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لَا تُوَافِقُوا مِنَ اللَّهِ سَاعَةً يُسْأَلُ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبُ لَكُمْ)). سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، حَتَّى إِذَا كَانَتْ عُشَيْشِيَةٌ، وَدَنَوْنَا مَاءً مِنْ مِيَاهِ الْعَرَبِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ رَجُلٌ يَتَقَدَّمُنَا فَيَمْدُرُ الْحَوْضَ، فَيَشْرَبُ وَيَسْقِينَا)). قَالَ جَابِرٌ: فَقُمْتُ: فَقُلْتُ هَذَا رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَيُّ رَجُلٍ مَعَ جَابِرٍ)). فَقَامَ جَبَّارُ بْنُ صَخْرٍ، فَانْطَلَقْنَا إِلَى الْبِئْرِ فَنَزَعْنَا فِي الْحَوْضِ سَجْلًا أَوْ سَجْلَيْنِ، ثُمَّ مَدَرْنَاهُ، ثُمَّ نَزَعْنَا فِيهِ حَتَّى أَفْهَقْنَاهُ، فَكَانَ أَوَّلَ طَالِعٍ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((أَتَأْذَنَانِ)). قُلْنَا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَشْرَعَ نَاقَتَهُ فَشَرِبَتْ، شَنَقَ لَهَا فَشَجَتْ، فَبَالَتْ ثُمَّ عَدَلَ بِهَا فَأَنَاخَهَا، ثُمَّ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى الْحَوْضِ فَتَوَضَّأَ مِنْهُ ثُمَّ قُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ مِنْ مُتَوَضَّإِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَذَهَبَ جَبَّارُ ابْنُ صَخْرٍ يَقْضِي حَاجَتَهُ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِيُصَلِّيَ، وَكَانَتْ عَلَيَّ بُرْدَةٌ ذَهَبْتُ أَنْ أُخَالِفَ بَيْنَ طَرَفَيْهَا فَلَمْ تَبْلُغْ لِي، وَكَانَتْ لَهَا ذَبَاذِبُ فَنَكَّسْتُهَا، ثُمَّ خَالَفْتُ بَيْنَ طَرَفَيْهَا، ثُمَّ تَوَاقَصْتُ عَلَيْهَا، ثُمَّ جِئْتُ حَتَّى قُمْتُ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَدَارَنِي حَتَّى أَقَامَنِي عَنْ يَمِينِه، ثُمَّ جَاءَ جَبَّارُ بْنُ صَخْرٍ، فَتَوَضَّأَ ثُمَّ جَاءَ فَقَامَ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخَذَ [رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)] بِيَدَيْنَا جَمِيعًا، فَدَفَعَنَا حَتَّى أَقَامَنَا خَلْفَهُ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَرْمُقُنِي وَأَنَا لَا أَشْعُرُ، ثُمَّ فَطِنْتُ بِه، فَقَالَ هَكَذَا بِيَدِه، يَعْنِي شُدَّ وَسَطَكَ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((يَا جَابِرُ)). قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ((إِذَا كَانَ وَاسِعًا فَخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْه، وَإِذَا كَانَ ضَيِّقًا فَاشْدُدْهُ عَلَى حَقْوِكَ)).

سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَكَانَ قُوتُ كُلِّ رَجُلٍ مِنَّا فِي كُلِّ يَوْمٍ تَمْرَةً، فَكَانَ يَمَصُّهَا ثُمَّ يَصُرُّهَا فِي ثَوْبِه، وَكُنَّا نَخْتَبِطُ بِقِسِيِّنَا وَنَأْكُلُ حَتَّى قَرِحَتْ أَشْدَاقُنَا،

فَأُقْسِمُ أُخْطِئُهَا رَجُلٌ مِنَّا يَوْمًا فَانْطَلَقْنَا بِهِ نَنْعَشُهُ، فَشَهِدْنَا أَنَّهُ لَمْ يُعْطَهَا فَأُعْطِيَهَا، فَقَامَ فَأَخَذَهَا. سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى نَزَلْنَا وَادِيًا أَفْيَحَ، فَذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقْضِي حَاجَتَهُ، فَاتَّبَعْتُهُ بِإِدَاوَةٍ مِنْ مَاءٍ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَلَمْ يَرَ شَيْئًا يَسْتَتِرُ بِهِ، فَإِذَا شَجَرَتَانِ بِشَاطِئِ الْوَادِي، فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى إِحْدَاهُمَا فَأَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، فَقَالَ: ((انْقَادِي عَلَيَّ بِإِذْنِ اللَّهِ)). فَانْقَادَتْ مَعَهُ كَالْبَعِيرِ الْمَخْشُوشِ الَّذِي يُصَانِعُ قَائِدَهُ، حَتَّى أَتَى الشَّجَرَةَ الْأُخْرَى، فَأَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا فَقَالَ: ((انْقَادِي عَلَيَّ بِإِذْنِ اللَّهِ)). فَانْقَادَتْ مَعَهُ كَذَلِكَ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالْمَنْصَفِ مِمَّا بَيْنَهُمَا لَأَمَ بَيْنَهُمَا -يَعْنِي جَمَعَهُمَا- فَقَالَ: ((الْتَئِمَا عَلَيَّ بِإِذْنِ اللَّهِ)). فَالْتَأَمَتَا، قَالَ جَابِرٌ: فَخَرَجْتُ أُحْضِرُ مَخَافَةَ أَنْ يُحِسَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِقُرْبِي فَيَبْتَعِدَ -وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّادٍ: فَيَتَبَعَّدَ- فَجَلَسْتُ أُحَدِّثُ نَفْسِي، فَحَانَتْ مِنِّي لَفْتَةٌ، فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مُقْبِلًا وَإِذَا الشَّجَرَتَانِ قَدِ افْتَرَقَتَا، فَقَامَتْ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا عَلَى سَاقٍ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَقَفَ وَقْفَةً، فَقَالَ بِرَأْسِهِ هَكَذَا -وَأَشَارَ أَبُو إِسْمَعِيلَ بِرَأْسِهِ يَمِينًا وَشِمَالًا- ثُمَّ أَقْبَلَ، فَلَمَّا انْتَهَى إِلَيَّ قَالَ: ((يَا جَابِرُ هَلْ رَأَيْتَ مَقَامِي)). قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((فَانْطَلِقْ إِلَى الشَّجَرَتَيْنِ، فَاقْطَعْ مِنْ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا غُصْنًا فَأَقْبِلْ بِهِمَا، حَتَّى إِذَا قُمْتَ مَقَامِي فَأَرْسِلْ غُصْنًا عَنْ يَمِينِكَ وَغُصْنًا عَنْ يَسَارِكَ)). قَالَ جَابِرٌ: فَقُمْتُ فَأَخَذْتُ حَجَرًا فَكَسَرْتُهُ وَحَسَرْتُهُ فَانْذَلَقَ لِي، فَأَتَيْتُ الشَّجَرَتَيْنِ فَقَطَعْتُ مِنْ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا غُصْنًا، ثُمَّ أَقْبَلْتُ أَجُرُّهُمَا حَتَّى قُمْتُ مَقَامَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَرْسَلْتُ غُصْنًا عَنْ يَمِينِي وَغُصْنًا عَنْ يَسَارِي، ثُمَّ لَحِقْتُهُ، فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَعَمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: ((إِنِّي مَرَرْتُ بِقَبْرَيْنِ يُعَذَّبَانِ، فَأَحْبَبْتُ بِشَفَاعَتِي أَنْ يُرَفَّهَ عَنْهُمَا مَا دَامَ الْغُصْنَانِ رَطْبَيْنِ)). قَالَ: فَأَتَيْنَا الْعَسْكَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا جَابِرُ نَادِ بِوَضُوءٍ)). فَقُلْتُ: أَلَا وَضُوءَ، أَلَا وَضُوءَ، أَلَا وَضُوءَ؟ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا وَجَدْتُ فِي الرَّكْبِ مِنْ قَطْرَةٍ، وَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُبَرِّدُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) الْمَاءَ فِي أَشْجَابٍ لَهُ عَلَى حِمَارَةٍ مِنْ جَرِيدٍ، قَالَ: فَقَالَ لِيَ: ((انْطَلِقْ إِلَى فُلَانِ ابْنِ فُلَانٍ الْأَنْصَارِيِّ، فَانْظُرْ هَلْ فِي أَشْجَابِهِ مِنْ شَيْءٍ)). قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَيْهِ فَنَظَرْتُ فِيهَا، فَلَمْ أَجِدْ فِيهَا إِلَّا قَطْرَةً فِي عَزْلَاءِ شَجْبٍ مِنْهَا، لَوْ أَنِّي أُفْرِغُهُ لَشَرِبَهُ يَابِسُهُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لَمْ أَجِدْ فِيهَا إِلَّا قَطْرَةً فِي عَزْلَاءِ شَجْبٍ مِنْهَا، لَوْ أَنِّي أُفْرِغُهُ لَشَرِبَهُ يَابِسُهُ. قَالَ: ((اذْهَبْ فَأْتِنِي بِهِ)). فَأَتَيْتُهُ بِهِ، فَأَخَذَهُ

بِيَدِهِ، فَجَعَلَ يَتَكَلَّمُ بِشَيْءٍ لَا أَدْرِي مَا هُوَ، وَيَغْمِزُهُ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ أَعْطَانِيهِ فَقَالَ: ((يَا جَابِرُ نَادِ بِجَفْنَةٍ)). فَقُلْتُ: يَا جَفْنَةَ الرَّكْبِ، فَأُتِيتُ بِهَا تُحْمَلُ فَوَضَعْتُهَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِيَدِهِ فِي الْجَفْنَةِ هَكَذَا فَبَسَطَهَا، وَفَرَّقَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ ثُمَّ وَضَعَهَا فِي قَعْرِ الْجَفْنَةِ وَقَالَ: ((خُذْ يَا جَابِرُ فَصُبَّ عَلَيَّ وَقُلْ: بِاسْمِ اللَّهِ)). فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ: بِاسْمِ اللَّهِ، فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَفُورُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ فَارَتِ الْجَفْنَةُ وَدَارَتْ حَتَّى امْتَلَأَتْ، فَقَالَ: ((يَا جَابِرُ نَادِ مَنْ كَانَ لَهُ حَاجَةٌ بِمَاءٍ)). قَالَ: فَأَتَى النَّاسُ فَاسْتَقَوْا حَتَّى رَوُوا، قَالَ: فَقُلْتُ: هَلْ بَقِيَ أَحَدٌ لَهُ حَاجَةٌ؟ فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَدَهُ مِنَ الْجَفْنَةِ وَهِيَ مَلْأَى.

وَشَكَا النَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) الْجُوعَ، فَقَالَ: ((عَسَى اللَّهُ أَنْ يُطْعِمَكُمْ)). فَأَتَيْنَا سِيفَ الْبَحْرِ، فَزَخَرَ الْبَحْرُ زَخْرَةً فَأَلْقَى دَابَّةً، فَأَوْرَيْنَا عَلَى شِقِّهَا النَّارَ، فَاطَّبَخْنَا وَاشْتَوَيْنَا، وَأَكَلْنَا [حَتَّى] شَبِعْنَا، قَالَ جَابِرٌ: فَدَخَلْتُ أَنَا وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ -حَتَّى عَدَّ خَمْسَةً- فِي حِجَاجِ عَيْنِهَا مَا يَرَانَا أَحَدٌ، حَتَّى خَرَجْنَا فَأَخَذْنَا ضِلَعًا مِنْ أَضْلَاعِهِ فَقَوَّسْنَاهُ، ثُمَّ دَعَوْنَا بِأَعْظَمِ رَجُلٍ فِي الرَّكْبِ وَأَعْظَمِ جَمَلٍ فِي الرَّكْبِ وَأَعْظَمِ كِفْلٍ فِي الرَّكْبِ، فَدَخَلَ تَحْتَهُ مَا يُطَأْطِئُ رَأْسَهُ.

(عبادة)ی کوڕی (ولید)ی کوڕی (عبادة)ی کوڕی (صامت) (ﷺ) دەڵێ: من و باوکم ڕۆیشتین بەدوای زانستدا دەگەڕاین لەناو ئەم تیرەی (انصار)ەدا بەرلەوەی لەناو بچن، یەکەم کەس توشمان هات (ابوالیسر)ی هاوەڵی پێغەمبەر بوو (ﷺ). غولامێکی خۆی لەگەڵ بوو دەستەیە کاغەزی پێچراوەی پێبوو، (ابو الیسر) (بردة)یەك و (معافری)یەکی لەبەردابوو، غولامەکەیشی هەر (بردە)یەك و (معافری)[1] یەکی لەبەردابوو، باوکم پێی وت: مامە شوێنەواری تورە بوون لەناوچاوتا بەدی دەکەم، وتی: بەڵێ، قەرزێکم هەبوو لەسەر فلانی کوڕی فلان لەتیرەی حەرام، چووم بۆلای منداڵەکانی سەلامم لێکرد، وتم: فلان لەوێیە؟ وتیان: نەخێر، کوڕێکی منداڵی توند و تۆڵی هەبوو هات بۆلام و پێم وت: باوکت

---

١. (بردة) جۆرەجلێکی یەمانیە عەرەبە لادێنشینەکان بەکاریان هێناوە (لسان العرب) – بَرَدَ (معافر) شارێکە لەیەمەن، ئەو جۆرە جلەیش بەناوی ئەو شارەوە ناونراوە، (لسان العرب) – عفر. مامۆستا ملا ڕشید دەفەرمووی: بوردە وەك بەرماڵ ئەدەن بەسەر شانیانیدا، معافیریش وەك پشتەماڵ. {بڕوانە: اقتران النیرین}: ٣١٦/٣

لەکوێیــە؟ وتـــی: گوێــی لــەدەنگی تــۆ بــوو خــۆی کــرد بــەناو چرپایــە و پەردەکوللەکەی دایکمدا، بانگم کرد: وەرە دەرەوە زانیم وای لـە کوێـدا، هاتـە دەر، وتم: بۆچ خۆتت لێشاردمەوە وتی: سوێندبەخوا قسەت بۆ دەکەم و درۆت لەگەڵ ناکەم، سوێند بە خوا لەوە ترسام قسەت بۆ بکەم و درۆت لەگەڵ بکەم، بەڵێنت پێبدەم و بەڵێنەکە نەبەمە سەر، تۆ هاورێی پێغەمبەربوی (ﷺ)، سوێند بەخوا منیش هەژارم. وتم: توخوا؟ وتی: بەخوا، وتم: توخـوا؟ وتـی: بـەخوا؟ {وتم: توخـوا؟ وتـی: بـەخوا}، دەڵـێ: قەرزنامەکـەم هێنـا و بەدەسـتی خـۆی سڕیەوە، وتم: ئەگەر بووت بمدەرەوە، ئەگەر نەتبوو ئازادبە، شـایەتی دەدەم بینایی ئەم دوچاوەم دی –هەردوو پەنجەی دانا لەسەر چاوانی– هـەردو گوێم بیسـتی، دڵـم وەریگـرت –ئامـاژەی کـرد بـە بـەندی دڵـی– لـە پێغەمبـەر کـە دەیفـەرموو: ((هەرکـەس مۆڵـەتی هــەژارێك بـدات یـان هــەندێ لــە قەرزکـەی داشکێنێ خوا دەیخاتە ژێر سێبەری خۆی)).

دەڵـێ: پێـم وت: ئـەی مامـە ئەگــەر بـوردەی خزمەتکارەکـەت بـۆ خـۆت هەڵبگرتایە و، (معافر)ی‌یەکەی خۆتت بدایە بەو، یان (معافری) یەکەی ئەوت وەربگرتایە بۆ خۆت و بوردەکەی خۆتت بدایە بەو، ئەو کاتە تۆیش جلەکانت یەکڕەنگ دەبوو، ئەویش جلەکانی یەکڕەنگ دەبوو؟ دەستی هێنا بەسەرمدا و وتی: ئەی خوایە بەفەڕ و پیرۆزی کەیت، ئەی برازام، بە بینایی ئەم دو چاوەم، بە بیستنی ئەم دوو گوێیەم، ئەم دڵەیشـم –ئامـاژەی کـرد بـۆ بـەندی دڵـی– وەریگرتووە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەیفەرموو: ((خۆراکیان بدەنێ لەوەی خۆتان دەیخـۆن، پۆشـاکیان بـۆ بکـەن لـەوەی خۆتـان دەیپۆشـن)). ئەگـەر مـن لەخۆشی‌یەکانی دنیای بدەمێ لام ئاسانترە لەوەی لەچاکەکانی من بەرێ ڕۆژی قیامەت.

پـاش ئـەوە ڕۆیشـتین هـەتا هاتینـە لای (جـابر)ی کـوڕی (عبـدالله) لـە مزگەوتەکەیدا نوێژی دەکـرد تەنـها یـەك پارچـە جلـی لەبـەردابوو ئـاڵاندبوی لەخۆیەوە، هەنگاوم هەڵگرت بەسەر خەڵکەکەدا، تاگەیشـتمە لای ئەو، دانیشتم لەنێوان ئەو و قیبلـەدا، وتم: خـوا ڕەحمـت پێبکـات، بەیـەك پارچـە پۆشـاکەوە نوێژدەکەیت و عەباکەیشت والەپاڵتا؟ ئامـاژەی کرد بە دەسـتی بـەرەو سینەم و –پەنجەکانیشــی بــڵاوە پێکــرد و خــواری کردنــەوە– فــەرمووی: ((ویســتم

گەوجێکی وەك تۆ بێتــە لام و بمبینــێ بزانــێ مـن چـۆن دەکـەم ئـەویش وەهـا بکـات، پێغەمبـەر (ﷺ) هاتـە لامـان ئالــەم مزگەوتــەدا لقــێ دارخورمــای (ابــن خطاب)ی بەدەستەوە بوو، لـە قیبلـەی مزگەوتەکـەدا بەڵغـەمێکی دی بەسـەری دارخورماکە کڕاندی، ئەمجا ڕوی تێکردین و فەرمووی: ((کێتـان حـەز دەکـات خوا ڕووی لێوەربگێڕێت؟)) دەڵێ: ڕاچڵەکاین دیسانەوە فەرمووی: ((کێتان حەز دەکات خـوا ڕووی لێوەربگێڕێت؟)). دەڵــێ: ڕاچڵـەکاین. دیسـانەوە فـەرمووی: ((کێتان حـەزدەکات خوا ڕووی لێوەربگـێڕێت؟)) وتمـان: کـەسمان حەزناکـەین ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: (( یەکێ لەئێوە هەرکات هەستا نوێژ بکات ئەوە بەڕاستی خـوای بـەرز و بڵنـد لەبەردەمیدایە، باهیچ کـەس لەبـەردەمیدا وبـەلای ڕاستیدا تف ڕۆنـەکات، بەلایچەپیدا و بـەژێر پێـی چـەپدا تـف ڕۆبکات، ئەگـەر شتێك یەخەی پێگرتو {نەیتوانی وەها بکات} باجلەکانی بەم شێوە لێبکات – ئەمجا هەندێ لە جلەکانی پێچایەوە بەسەر هەندێکی تریدا– پاشان فەرمووی: ((گوڵاوم بۆ بهێنن)) گەنجێکی ئەو گەڕەکە پـەلاماری داو بەپـەلە خـۆی گـەیاندە ماڵەوەیان، عـەترێکی هێنـا لەسـەر لـەپی دەسـتی، پێغەمبـەر (ﷺ) وەریگـرت و خستییە سـەر لقی دارخورماکـە و سـووی بەشـوێنەواری بەڵغەمەکـەدا، جـابر دەڵێ: لەوێوەیە کە بۆنی خـۆشتان بردۆتە ناو مزگەوتەکانتان.

ڕۆیشتین لـە خزمـەت پێغەمبـەردا (ﷺ) لەجـەنگی (بطن بـواط)دا، کەبـەدوای (مجدي)کوڕی (عمـرو)ی (الجهنی)دا دەچـوو، پێـنج وشـەش و حـەوت کـەسمان بەنۆرە سواری یەك وشتر دەبووین، سەرەگەڕایەوە سەر پیاوێکی (أنصـار)ی بـۆ سـواری وشترێکی خـۆی، ییخـیداو سواری بـوو، هەڵیسـان، وشـترەکە هـەندێ هەڵوێستەی کرد، پێی وت: شأ {واتە: هەچە} لەعنەتـی خـوات لێبێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە کێبوو لەعنەتی کرد لەوشترەکەی؟ وتی: مـن بـووم ئـەی پێغەمبەریخوا، فەرمووی: ((دابەزە و لەگەڵ لەعنەت لێکراودا هاوڕێمان مەبە، دوعای شەڕ مەکەن لـە خۆتـان و منداڵتـان و ماڵتـان، نـەکو داواکـەتان یـەکبگرێ لەگـــەڵ ئـــەو ســـاتەدا داوای بەخشـــینی تیـــا وەردەگـــیرێت و لـــە ئێوەیشـــی وەربگرێت.))

ڕۆیشتین لـە خزمـەت پێغەمبــەردا (ﷺ) هـەتا کـاتی ئێـوارە وەختێـك نزیـك بووینەوە لە ئاوێك لەئاوەکانی عەرەبی دەشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((کـام

پیاو پێشمان دەكەوێ بۆ ئەوەی حەوزەكە سواق بدا و كون بڕی بكات خۆیشی ئاوبخواتەوە و ئاویش بدات بە ئێمە، جابر دەڵێ: هەستام و وتم: ئەمە پیاوێكە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((كام پیاو لەگەڵ جابر دەبێـت؟)) (جّبـار)ی كـوڕی (صخر) هەستا، ڕۆیشتین بۆلای بیرەكە دۆلكەیێ دوو دۆلكە ئاومان هەڵگۆست و كردمانە حەوزەكە، لەپاشدا قوڕمان دا، ئەمجا ئاومان تێكرد هەتا پڕمان كرد، یەكـەم كـەس گەیشـتە لامـان پێغەمبـەری خـوا بـوو (ﷺ) فــەرمووی: ((ڕێگـام ئەدەن؟))وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، دەستەجلەوی وشترەكەی شل كـرد تا ئاوی خواردەوە، ئـەمجا دەسـتی لێتونـد كـرد، وشترەكە لنگـی بلاوكـردەوە و میزی كرد، ئەمجا گێڕایەوە دواوە و پیخـی دا، دوای ئـەوە پێغەمبـەر (ﷺ) هاتە سەر حەوزەكە و دەست نوێژی لێگرت، دوای ئەوە منیش هەستام دەستنوێژم گـرت لـە شوێن دەستنوێژەكەی پێغەمبـەر (ﷺ)، (جبـار)ی كوڕی (صخـر) یــش ڕۆیشت پێویستی سەر ئاوی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا نوێـژ بكات منیـش بوردەیەكم لەبەردابوو ویستم چمكەكانی ڕاست و چەپ بكەم بۆم نەگەیشتەوە، بوردەكە ڕیشوی هـەبوو، وەری گێرامـە لای ڕاسـتی خـۆی ، دوای ( جبـار ) ی كوری ( صخر )یش هات دەسنوێژی گرت و لای چەپی پێغەمبەر(ﷺ) وەستا ، سەرەو خوارم كردەوە و، ڕاست و چەپم كرد ئەمجا ملم بـۆ كـورت كـردەوە و{بـەمل گـرتم بـۆ ئەوەی نەكـەوێ}، ئـەمجا هــاتم لـەلای چـەپی پێغەمبــەر (ﷺ) وەسـتام، پێغەمبـەر (ﷺ) دەسـتی هـەردوكمانی گـرت و پاڵینـاین هـەتا لـە دوای خۆیەوە ڕایگرتین و پێغەمبەر (ﷺ) چاوی تێبڕیبووم من هەستم پێنەدەكرد، تا دواتر تێگـەیم مەبەسـتی چی‌یـە؟ بەدەسـتی ئامـاژەی كـرد، وەك ئـەوەی بڵـێ: ((ناوەڕاستت ببەستە)) لـەكاتێكدا پێغەمبـەر (ﷺ) لێبوویـەوە فـەرمووی: ئـەی جابر وتم: گوێڕایـەڵتم ئـەی پێغەمبـەری خوا فـەرمووی: ((ئەگـەر {بوردەكـەت} گـەورە بـوو ڕاسـت و چەپەكـەی بهێنـەرەوە سـەریەك، ئەگـەر تەسك بـوو لەسـەر كەلەكەت ببیەستە)).

ڕۆیشتین لە خزمەتی پێغەمبەر، خواردنی ڕۆژانـەی هەریـەك لـە ئێمـە دەنكە خورمایەك بوو، دەیمژی و لەپاشا لەناو جلەكانیدا گرێی ئەدا، بەكەوانـەكانمان گـەڵا دارمـان دەوەرانـد و دەمـانخوارد هـەتا شـەویلگەمان برینـدار بـوو، سـوێند

دەخـۆم ڕۆژێ یـەکێکیان لـەبیرچوبو، بردمـان بـۆ لای خورمـا بـەدەس هـەڵمان دەگرت، شایەتیمان بۆدا کە خورمای پێنەدراوە، پێیدرا، هەستاو وەریگرت.

ڕۆیشتین لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا (ﷺ) هـەتا گەیشتینە شـیوێکی فـراوان، پێغەمبـەر (ﷺ) چـوو بـۆ پێویسـتی سـەرئاو، جەوەنـەیێ ئـاوم بـەدوادا بـرد، پێغەمبەر (ﷺ) تەماشای کرد شتێکی نەدی خۆی پێ‌بشارێتەوە، دوو درەخت لەکەناری ئەو شیوەدا هەبوون، پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت بۆلای یەکێکیان لقێکی لێگرت و{ڕایکێشاو} فەرمووی: ((بۆم دانەوە بە فەرمانی خوا)) لقەکـە بـۆی دانەوی وەك وشتری مەهار کراو کەبەدوای خاوەنەکەیدا دەڕوات، ئەمجا چوو بۆ لای درەختەکـەی تـر، لقێکـی ئەویشـی ڕاکێشـا و فـەرمووی: ((بـۆم دانـەوە بەفەرمانی خوا)) ئەویش دانەوی لەگەڵیا بەهـەمان جـۆر، هـەتا لەناوەڕاسـتی هـەردوکیاندا گـەیاندنی بەیـەك و فـەرمووی: ((بەیەکـەوە بنوسـێن لەسـەرمن بەفـەرمای خـوا)) نوسـان بەیەکـەوە جـابر دەڵـێ: مـن بەپەلـە لـەو شـوێنە دورکەوتمەوە نەکو پێغەمبەر (ﷺ) هەست بکات بە نزیکی من و دوربکەوێتەوە، دانیشتم خەیاڵم لەگەڵ دەرونی خۆم دەکرد، لەناکاو سەرێکم هـەڵبڕی پێغەمبـەر (ﷺ) بەرەو ڕووی من دەهـات و درەختـەکانیش لێـك جیابووبوونـەوە، هەریـەك لەسەر بنکی خۆیان وەستابوون، پێغەمبـەرم (ﷺ) بینـی هەڵوێستەیەکی کـرد و ئامـاژەی بەسـەری کـرد –ابو اسماعیل ی{ڕاوی} بەسـەری خـۆی ئامـاژەی لای ڕاست و چەپی کـرد– لەپاشـدا بەرەو ڕووم هـات، کاتـێ گەیشتە لام فەرمووی: ((ئـەی جـابر دیـت لـەکوێدا وەسـتابووم؟)) وتم: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا، فەرمووی: ((بڕۆ بۆ لای ئەو دوو درەختە، لەهەر یەکەیان لقێك ببڕەو بیانهێنە تا دەگەیتە شوێن وەستانەکەی من {لەوێدا} لقێك بەلای ڕاستتەوە و لقێك بەلای چەپتەوە بەربدەرەوە)).

جابر دەڵێ: هەستام بەردێکم هەڵگرت و شکاندم، تیژم کرد و بۆم تیژبوو، چووم بـۆلای هـەردوو درەختەکە ولـە هەریەکـەیان لقێکم بڕی، هـاتم و بـەدوای خۆمدا ڕامدەکێشان هەتا لەشوێن وەستانەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) وەستام لقێکم بەردایەوە بەلای ڕاستمدا و لقێکیش بەلای چەپمدا، ئەمجا چووم بۆ خزمـەتی و پێـم وت: ئـەو کـارەم ئـەنجامدا ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەوە لەبـەر چی‌بـوو؟ فەرمووی: ((بەڕاسـتی من تێپـەڕیم بـەلای دوو قـەبردا سـزادەدران، حـەزم کـرد

بەتكای من هەندێ سزایان لەسەر هەڵگیرێ بەدانانی ئەو لقە تەڕە هەتا بەتەڕی مابن)).

دەڵێ: هاتینە ناو سوپاكە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی جابر هاواركە بۆ ئاوی دەست نوێژ)) منیش هاوارم كرد: ئایا ئاوی دەست نوێژ نیە؟ ئایا ئاوی دەستنوێژ نیە؟، ئایا ئاوی دەستنوێژ نیە؟ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەم كاروانەدا یەك تنۆك ئاوم دەست نەكەوتووە، پیاوێكی ئەنصاری هەبوو لەچەند كونەیەكی كۆندا ئاوی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) سارد دەكرد، بەسیپایەكدا لەلقی دارخورما پێكهاتبوو، جابر دەڵێ: پێی فەرمووم: ((بڕۆ بۆ لای فلانی كوڕی فلانی ئەنصاری تەماشا بكە ئایە كونەكانی هیچ ئاویان تیایە؟)) دەڵێ: چووم تەماشایانم كرد هیچم تیا نەدین جگەلە یەك تنوك ئاو كەلە هەنگلی كونەیەكیاندا بوو، ئەگەر دامبكردایە نەدەگەیشتە دەمی كونەكە. هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئاوم دەست نەكەوت لەو كونانەدا جگەلەیەك تنۆك لە هەنگڵی كونەیەكیاندا ئەگەر ڕۆم بكردایە وشكەكەی هەڵیدەمژی، فەرمووی: ((بچۆ ئەو كونەم بۆ بهێنە)) بۆم برد كونەكەی بەدەستەوە گرت و شتێكی دەخوێند من نازانم چیبو؟ ئەمجا بەدەستی خۆی گوشاردی و دایە دەست من و فەرمووی: ((ئەی جابر بانگی تەشتێ بكە)) هاوارم كرد:ئەی تەشتی كاروان، هەڵیانگرت و بۆیان هێنام و خستمە بەردەستی ، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی خستە ناو تەشتەكە و بڵاوی كردەوە و پەنجەكانی لێك جیاكردەوە و ئەمجا لەبن تەشتەكەدا دایناو فەرمووی: ((ئەی جابر {كونەكە} بگرە و ئاوبكە بەسەر دەستمدا و بڵێ: بسم الله)) ئاوم كرد بەسەردەستیدا و وتم: بسم الله، دیم ئاو هەڵدەقوڵا لەنێو پەنجەكانی پێغەمبەر (ﷺ)،لەپاشدا تەشتەكە بەتوندی ئاوی لێهەڵدەقوڵا و ئاوەكە سوڕی دەخوارد، هەتا پڕبوو، ئەمجا فەرمووی: ((ئەی جابر بانگ بكە كێ پێویستی بەئاو هەیە)) دەڵێ: خەڵك هاتن ئاویان خواردەوە هەتا پاراو بوونەوە، وتم: ئایە كەس ماوە پێویستی بەئاو ببێ؟ پێغەمبەر دەستی دەرهێنا لە تەشتەكە هێشتا پڕبوو.

خەڵك هاواری برسێتیان برد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((نزیكە خوای گەورە خواردنتان بۆ بنێرێ)) هاتینە سەر كەناری دەریا، دەریاكە شەپۆلێكی دا

گیانلەبەرێکی فرێدایە دەر ئاگرمان لەسەر لایەکی کردەوە کولاَنمان و برژاندمان و خواردمان تا تێر بووین. جابر دەڵێ: من و فلاَن و فلاَن –پێنج کەسی ژمارد– چووینە ناو کالانەی چاویەوە کەس نەیبینین تا هاتینە دەر ، پەراسویەکمان هێنا و خوارمان کردەوە گەورەترین پیاوی ئەو کاروانەمان، بانگ کردو، گەورەترین وشتر لەکاروانەکەدا و گەورەترین کۆپان {واتە ئەو پیاوەی سواری ئەو وشتر و کۆپانە بوو} چووە ژێر ئەو پەراسووە سەری دانەئەخست.

## ( ١٢ ) لەتبوونی مانگەشەو

١٤٦٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِمِنًى إِذَا انْفَلَقَ الْقَمَرُ فِلْقَتَيْنِ، فَكَانَتْ فِلْقَةٌ وَرَاءَ الْجَبَلِ وَفِلْقَةٌ دُونَهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اشْهَدُوا)). [بخاري/ المناقب/ ٣٤٣٧]

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا دانیشتبووین لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) لە مینا {دیمان} مانگ بوو بەدوکەرتەوە کەرتێکیان لەپشتی چیاکەوە بوو کەرتێکیشیان لەملای چیاکەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووین: ((شایەت بن)).

١٤٦٥ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً، فَأَرَاهُمُ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ مَرَّتَيْنِ. [بخاري/ المناقب/ ٣٤٣٨]

لە(انس)ی کوڕی (مالك)ەوە (ﷺ) کە خەڵکی مەککە داوایان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەیەکیان نیشان بدات، دوجار لەتبونی مانگی پیشاندان.

## ( ١٣ ) پاراستنی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەو کەسەی ویستبێتی ئازاری بدات

١٤٦٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: هَلْ يُعَفِّرُ مُحَمَّدٌ وَجْهَهُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ قَالَ: فَقِيلَ: نَعَمْ، فَقَالَ: وَاللَّاتِ وَالْعُزَّى، لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ لَأَطَأَنَّ عَلَى رَقَبَتِهِ، أَوْ لَأُعَفِّرَنَّ وَجْهَهُ فِي التُّرَابِ. قَالَ: فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ يُصَلِّي. زَعَمَ لِيَطَأَ عَلَى رَقَبَتِهِ، قَالَ: فَمَا فَجِئَهُمْ مِنْهُ إِلَّا وَهُوَ يَنْكُصُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَيَتَّقِي بِيَدَيْهِ، قَالَ: فَقِيلَ لَهُ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَخَنْدَقًا مِنْ نَارٍ وَهَوْلًا وَأَجْنِحَةً. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَوْ دَنَا مِنِّي لَاخْتَطَفَتْهُ الْمَلَائِكَةُ عُضْوًا عُضْوًا)). قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ –لَا نَدْرِي فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ أَوْ شَيْءٌ بَلَغَهُ– ﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى. أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى. إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى. أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى. عَبْدًا إِذَا صَلَّى. أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى. أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى. أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى. –يَعْنِي أَبَا

جَهْلٍ- أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى. كَلَّا لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ. نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ. فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ. سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ. كَلَّا لَا تُطِعْهُ﴾. وَفِي رواية قَالَ: ((وَأَمَرَهُ بِمَا أَمَرَهُ بِهِ)). في رواية: ﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَه﴾ يَعْنِي قَوْمَهُ.

له(أبو هريرة)هوه (ﷺ) دەڵێ: ابوجهل وتی: ئایا محمد لەناو ئێوەدا ڕووی خۆی دەنێتە سەر خاك؟ ابوهریرە دەڵێ: وترا بەڵێ، وتی: سوێندم بە (لات و عزێ) ئەگەر بینیم ئەوەی كرد دەبێ پێ‌بنێم بەگەردنیدا، یان دەبێ ڕوومەتی بچەقێنم بەخۆڵدا، دەڵێ: هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دەكرد، بەتەمابوو پێ‌بنێ بەگەردنیدا، لەناكاو پاشەو پاش گەڕایەوە و دەستی دەنا بەڕووی خۆیەوە {وەك ئەوەی شتێك دوربخاتەوە لە خۆی}، دەڵێ: وترا: ئەوە چیتە؟ وتی: لە نێوان من ئەودا خەنەكێكی ئاگرین و شتێكی زۆر ترسناك و چەند باڵێك هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر لەمن نزیك بكەوتایەتەوە فریشتەكان پارچە پارچە دەیانفڕاند)) دەڵێ: خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نازڵ كرد كە ئەمە ماناكانیانە: ((ڕاستە مرۆڤ لە سنور لائەدات بەرەو ملهوڕی و ئارەزو پەرستی هەركات خۆی بەدەسەڵاتدار و دەوڵەمەند بینی بەڕاستی گەڕانەوەیان بۆ لای خوایە هەر كەس پاداشتی كردەوەی خۆی وەردەگرێت. ئەی محمد هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئەو ملهوڕەی ڕێگریدەكات لەبەندەیەكی نوێژكار. هەواڵم بدەرێ ئەگەر ئەو بەندە نوێژكارە لەسەر ڕێگەی ڕاست و هیدایەت بێت یان فەرمان بەچاكە و تەقوا بكات. هەواڵم بدەرێ ئەگەر ئەو كەسە ملهوڕەیش فەرمانەكانی خوا بەدرۆ بزانێ و پشتیان لێ‌هەڵكات، ئایا نازانێت كە خوا ئاگایە بەهەموو شتێك. ئەگەر ئەو ملهوڕە وازنەهێنێ لەسەر ناوچەوان ڕایدەكێشین بۆ ناو دۆزەخ، ناوچەوانیكی درۆزنی خەتاكار. با ئەو خەڵكی یانەكەی خۆی بانگ بكات ئێمەیش زەبانی‌یەكانی دۆزەخی بۆ بانگ دەكەین ئەی محمد تۆ بەگوێی نەكەیت..﴾.

## ( ١٤ ) پاراستنی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەكەسێك ویستی بیكوژێت

١٤٦٧ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ، فَأَدْرَكَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَعَلَّقَ سَيْفَهُ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، قَالَ: وَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي الْوَادِي يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ [قَالَ]: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ رَجُلًا أَتَانِي وَأَنَا نَائِمٌ فَأَخَذَ

السَّيْفَ، فَاسْتَيْقَظْتُ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي، فَلَمْ أَشْعُرْ إِلَّا وَالسَّيْفُ صَلْتًا فِي يَدِهِ، فَقَالَ لِي: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّانِيَةِ: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ، قَالَ: فَشَامَ السَّيْفَ، فَهَا هُوَ ذَا جَالِسٌ)). ثُمَّ لَمْ يَعْرِضْ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). [بخاري/ المغازي/ ٣٩٠٨]

لە(جابر)ی کوڕی (عبدالله)وە (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) چووین بۆ جەنگێك لەلای نەجدەوە، توشی پێغەمبەر (ﷺ) هاتین لە دۆڵێکدا درەختی دڕکاوی زۆر تێدابوو، پێغەمبەر (ﷺ) لەبن درەختێکدا دابەزی و شمشێرەکەی هەڵواسی بەلقێك لە لقەکانیدا، دەڵێ: خەڵکیش بڵاوەی کرد لەو دۆڵەدا بۆ بن سێبەری درەختەکان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((پیاوێك هات بۆلام من خەوتبووم، شمشێرەکەی هەڵگرتبوو وەختێ خەبەر بوومەوە بەسەرسەرمەوە وەستابوو، شمشێرەکەی بەڕووتی بەدەستەوە گرتبوو،پێی وتم: کێ‌لەمن دەتپارێزێ؟ وتم: الله، جاری دووهەم وتی: کێ لە من دەتپارێزێ؟ وتم: الله، فەرمووی: ((شمشێرەکەی کردەوە بەکێلانیدا، ئەوەتا ئێستا دانیشتووە، دوای ئەوەیش پێغەمبەر (ﷺ) هیچ سزایەکی نەدا.

## (١٥) ژەهر و خواردنی مەڕی ژەهراوی

١٤٦٨ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ امْرَأَةً يَهُودِيَّةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَجِيءَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ: أَرَدْتُ لِأَقْتُلَكَ. قَالَ: ((مَا كَانَ اللَّهُ لِيُسَلِّطَكِ عَلَى ذَاكِ)). قَالَ: أَوْ قَالَ: ((عَلَيَّ)). قَالَ: قَالُوا: أَلَا نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: ((لَا)) قَالَ: فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). [بخاري/ الهبة/ ٢٤٧٤]

لە(أنس)ەوە (ﷺ) کە ئافرەتێکی جوولەکە مەڕێکی ژەهراوی هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، لێی خوارد، ئافرەتەکەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، پرسیاری لێکرد لەوبارەوە؟ وتی: ویستم بتکوژم، فەرمووی: ((خوا توانای ئەوەت ناداتێ))، (أنس) دەڵێ: یان وتی بەسەرمندا، وتیان ئەی نەیکوژین؟ فەرمووی: ((نەء)) انس دەڵێ: هەمووکات {شوێنەواری ئەو ژەهرەم} دەبینی لە زمانە بچکۆڵەی پێغەمبەردا (ﷺ).

## ( ١٦ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) پێكاویەتی لە خەملاندندا

١٤٦٩ـ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) غَزْوَةَ تَبُوكَ، فَأَتَيْنَا وَادِيَ الْقُرَى عَلَى حَدِيقَةٍ لِامْرَأَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اخْرُصُوهَا)). فَخَرَصْنَاهَا، وَخَرَصَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، وَقَالَ: ((أَحْصِيهَا حَتَّى نَرْجِعَ إِلَيْكِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ)). وَانْطَلَقْنَا حَتَّى قَدِمْنَا تَبُوكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((سَتَهُبُّ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَلَا يَقُمْ فِيهَا أَحَدٌ مِنْكُمْ، فَمَنْ كَانَ لَهُ بَعِيرٌ فَلْيَشُدَّ عِقَالَهُ)). فَهَبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَقَامَ رَجُلٌ، فَحَمَلَتْهُ الرِّيحُ حَتَّى أَلْقَتْهُ بِجَبَلَيْ طَيِّئٍ، وَجَاءَ رَسُولُ ابْنِ الْعَلْمَاءِ صَاحِبِ أَيْلَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِكِتَابٍ، وَأَهْدَى لَهُ بَغْلَةً بَيْضَاءَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَهْدَى لَهُ بُرْدًا، ثُمَّ أَقْبَلْنَا حَتَّى قَدِمْنَا وَادِيَ الْقُرَى، فَسَأَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْمَرْأَةَ عَنْ حَدِيقَتِهَا كَمْ بَلَغَ ثَمَرُهَا؟ فَقَالَتْ: عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنِّي مُسْرِعٌ، فَمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ فَلْيُسْرِعْ مَعِيَ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيَمْكُثْ)). فَخَرَجْنَا حَتَّى أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: ((هَذِهِ طَابَةُ، وَهَذَا أُحُدٌ، وَهُوَ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ)). ثُمَّ قَالَ: ((إِنَّ خَيْرَ دُورِ الْأَنْصَارِ دَارُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي سَاعِدَةَ، وَفِي كُلِّ دُورِ الْأَنْصَارِ خَيْرٌ)). فَلَحِقَنَا سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَقَالَ: أَبُو أُسَيْدٍ: أَلَمْ تَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَيَّرَ دُورَ الْأَنْصَارِ، فَجَعَلَنَا آخِرًا؟ فَأَدْرَكَ سَعْدٌ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خَيَّرْتَ دُورَ الْأَنْصَارِ، فَجَعَلْتَنَا آخِرًا؟ فَقَالَ: ((أَوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الْخِيَارِ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٤١١]

(ابو حميد (ﷺ))دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) چووین بۆ جەنگی تەبووك، لە(وادی القری)دا تێپەڕین بەلای باخی ئافرەتێكدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((بیخەملێنن)). ئێمە خەملاندمان، پێغەمبەریش (ﷺ) خەملاندی بەدەویسق و فەرمووی: ((بیژمێرە تا دەگەڕێنەوە (انشاالله) ڕۆیشتین تا چووینە تەبووك، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمشەو بایەكی زۆر سەخت هەڵدەكات لەسەرتان، كەس لەئێوە لەوكاتەدا هەڵنەسێ، هەركەس وشتری هەیە باگوریسەكەی توندكات)) بایەكی زۆر توند هەڵیكرد پیاوێك هەستا بابردی هەتا لە كێوی (طيئ)دا فڕێیدا، نێردراوی (ابن العلماء ) فەرمانداری (أيله) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) نامەیەكی بۆ هێنابوو هێسترێكی سپیشی بە دیاری بۆ ناردبوو، پێغەمبەر (ﷺ) وەڵام نامەی بۆ نوسیەوە و عەبایەكیشی بەدیاری بۆ

نارد، پاشان هاتین تا گەیشتینە (وادی القری)، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری کرد لـە ئافرەتەکـە: ((بـەروبومی باخەکـە چـەند بـوو؟)) وتـی: دە ویسـق دەبـوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((من پەلەمە ، هەرکەس دەیەوێت لەگەڵم پەلە بکات، هەر کەس دەیەوێت بابمێنێتـەوە)) ڕۆیشتن هـەتا مەدینـەمان لێـوە دەرکـەوت، فـەرمووی: ((ئەمـە (طابـة)یـە و، ئـەویش (احـد)ە شـاخێکە خۆشـی دەوێـین و خۆشمان دەوێت، دوای ئەوە فەرمووی: ((چاکترین بنەماڵـەی یاریدەدەرەکـان بنەماڵەی (بنی النجار)ە ئینجا بنەماڵەی (بنی عبدالاشهل)ە، ئینجا بنەماڵـەی (بني حارث بن الخزرج)ە ئینجا بنەماڵەی (بني ساعدة)یەو لەهەموو بنەماڵـەی یاریدەدەرەکاندا چاکـە هەیـە، (سـعد)ی کـوڕی (عُبـادة)پێمانگەیشـت، (أبـو اسَید)پێـی وت: نـەتزانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بنەماڵـەی یاریدەدەرەکـانی هەڵسەنگاند بەخێر، ئێمەی خستە دواوە، (سعد) خۆی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ) وتی: یا رسول الله بنەماڵەی یاریدەدەرەکانت هەڵسەنگان بەخێر ئێمەت خستە پاشکۆوە؟ فەرمووی: ((ئەی ئەوەندەتان بەس نیە لەچاکەکان بن؟))).

## ( ١٧ ) فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ) من پشتێنەتان دەگرم

١٤٧٠ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَثَلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا، فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهَا جَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذِهِ الدَّوَابُّ الَّتِي فِي النَّارِ يَقَعْنَ فِيهَا، وَجَعَلَ يَحْجُزُهُنَّ وَيَغْلِبْنَهُ فَيَتَقَحَّمْنَ فِيهَا، قَالَ: فَذَلِكُمْ مَثَلِي وَمَثَلُكُمْ، أَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، فَتَغْلِبُونِي تَقَحَّمُونَ فِيهَا)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١١٨]

(ابو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((نموونـەی مـن وئێـوە وەك پیـاوێك وەهایـە ئـاگرێکی خۆشـکردبێت لـەکاتێکدا دەوروبـەری خـۆی ڕوونکردەوە، پەپولە و چرپوجانەوەر خۆیـان دەخەنـە نـاو ئاگرەکـە، ئـەو هـەر ئەیـەوێ ڕێگایـان لێبگـرێ، بـەڵام زاڵدەبـن بەسـەریدا و خۆیـان فرێدەدەنـە نـاو ئاگرەکە، فەرمووی: ((ئەمە نموونـەی من و ئێوەیە، من پشتێنەتان دەگرم لـەو ئاگرە و {دەڵێم دورکەونەوە لە ئاگر دورکەونەوە لە ئاگر، کەچی ئێوە لە دەستم دەردەچن و خۆتان فرێ دەدەنە ناو ئاگرەکە}))).

## ( ١٨ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) خواناسترین کەسە

١٤٧١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي أَمْرٍ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ نَاسٌ مِنَ النَّاسِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (ﷺ) فغضبَ حَتَّى بَانَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: ((مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْغَبُونَ عَمَّا رُخِّصَ لِي فِيهِ؟ فَوَاللَّهِ لَأَنَا أَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ، وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً)). [بخاري/ الأدب/ ٥٧٥٠]

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای دا بەکارێك هەندێ کەس لەوخەڵکە نەیانکرد و بەلایانەوە باش نەبوو، ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕقی هەستا هەتا لە ڕوخساریدا دیاربوو، پاشان فەرمووی: ((هۆی چی‌یە هەندێ کەس دەبینم خۆیان لائەدەن لەشتێك ڕێگای پێدراوە؟ سوێند بەخوا من خواناسترین کەسیانم لە هەموویشیان زیاتر لە خوا دەترسم)).

## ( ١٩ ) دووریی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەتاوان

١٤٧٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِنَفْسِهِ إِلَّا أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. [بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٧]

(عائشة)(رضي الله عنها) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ کات سەرپشك نەکراوە لە نێوان دوو کاردا مەگەر کامیان ئاسانە ئەوەیانی هەڵبژاردووە ئەگەر تاوان نەبووبێت، ئەگەر تاوان بووبێت ئەوە دوورترین کەس بووە لێی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ کات تۆڵەی بۆنەفسی خۆی نەسەندووە، مەگەر سنووری خوای گەورە پێشێل کرابێت)).

## ( ٢٠ ) نوێژکردنی پێغەمبەر ( ﷺ ) هەتا هەردوپێی ئاوساوە

١٤٧٣ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَتَكَلَّفُ هَذَا، وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ فَقَالَ: ((أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا)) ﴿ بخاری / التهجر/ ١٠٧٨ ﴾.

لە(مغيرة)ی کوڕی (شعبە)وە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە نوێژکرد هەتا قاچەکانی ئاوسان، پێی وترا: بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەیت، کەخوایش لە گوناهی ڕابووردوت و داهاتووت بوردووە، فەرمووی: ((ئەی من بەندەیێکی سوپاس گوزارنەبم؟)).

## ( ٢١ ) فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ) من پێشەنگی کاروانتانم بۆ سەر حەوزەکە

١٤٧٤ـ عن جُنْدَب (ﷺ) قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦٢٧١]

(جندب)(ﷺ) دەڵێ: بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((من پێشەنگی کاروانتانم بۆ سەر حەوزەکە)).

## ( ٢٢ ) گەورەیی حەوزەکەی پێغەمبەر ( ﷺ )

١٤٧٥ـ عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو ابْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ، وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الْوَرِقِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَا يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا)). قَالَ: وَقَالَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ): قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنِّي عَلَى الْحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرَ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، وَسَيُؤْخَذُ أُنَاسٌ دُونِي فَأَقُولُ: يَا رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي، فَيُقَالُ: أَمَا شَعَرْتَ مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ، وَاللَّهِ مَا بَرِحُوا بَعْدَكَ يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ)). قَالَ: فَكَانَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نَرْجِعَ عَلَى أَعْقَابِنَا، أَوْ [أَنْ] نُفْتَنَ عَنْ دِينِنَا. [بخاري/ الرقاق/ ٦٢٠٦، ٦٢٠٨، ٦٢١٩، ٦٢٢٠]

(عبدالله) کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عاص) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((حەوزەکەی من مانگێ ڕێگایە، سوچەکانی یەکسانن ئاوەکەی سپیترە لە زیو، بۆنی خۆشترە لە میسك ، سوراحی‌یەکانی ئەوەندەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەرکەس لێی بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز تینوی نابێت)) (عبدالله)و (أسماء )ی کچی ابوبکر (ﷺ) دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من لەسەر حەوزەکەم، تەماشا دەکەم کێ لەئێوە دێت بۆلام، کەسانێك ڕێی لای منیان لێدەگیرێ، دەڵێم: ئەی پەروەردگار ئەوانە لە منن، لە ئوممەتی منن، دەوترێ: ئەی نازانیت دوای تۆ چی‌یان کردووە؟ سوێند بەخوا دوای تۆ هەر خەریکی پاشگەزبوونەوە بوون {لەئاینەکەت})).

بۆیە (ابن أبي مُليكة)دەپاڕایەوە: ئەی خوایە پەنا دەگرین بەتۆ لەوەی پاشگەزببینەوە یان توشی تاقیکردنەوەی لادان لەدین ببین)).

١٤٧٦ـ عَنْ حَارِثَةَ بن وهب (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((حَوْضُهُ مَا بَيْنَ صَنْعَاءَ وَالْمَدِينَةِ)). فَقَالَ لَهُ الْمُسْتَوْرِدُ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ قَالَ: الْأَوَانِي؟ [قَالَ: لَا]. فَقَالَ الْمُسْتَوْرِدُ: ((تُرَى فِيهِ الْآنِيَةُ مِثْلَ الْكَوَاكِبِ)).

لە(حارث)ی كوڕی (وهب)(ﷺ) كەلە پێغەمبەری (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((حەوزەكەی ئەو بەقەد نێوان صەنعاو مەدینەیە)) (مستورد) پێی وت: گوێت لێنەبووە باسی قاپ و قاچاغ بكات؟ {وتی: نەء} (مستورد) وتی: قاپ و قاچاخەكەی بەئەندازەی ئەستێرەكانە)).

١٤٧٧ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ أَمَامَكُمْ حَوْضًا كَمَا بَيْنَ جَرْبَاءَ وَأَذْرُحَ))، وَفِي رِوَايَةٍ: ((حَوْضِي)). وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَسَأَلْتُهُ – يعني نافعاً– فَقَالَ: قَرْيَتَيْنِ بِالشَّأْمِ، بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ ثَلَاثِ لَيَالٍ، وَفِي رِوَايَةٍ: ثلاثة أيام. [بخاري/ الرقاق/ ٦٢٠٦، ٦٢٠٨، ٦٢١٩، ٦٢٢٠]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( لەبەردەمتاندا حەوزێك هەیە بەپانی نێوان (جَرباء) و (أذرح) )) لەریوایەتێكدا: (حەوزەكەی من) لەریوایەتێكدا عبیدالله دەڵێ: پرسیارم كرد لە (نافع) وتی: ئەو دوشوێنە دووگوندن لەشام نێوەندیان سێشەو ڕێگایە، لە ریوایەتێكی تردا: سێ ڕۆژ.

١٤٧٨ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَلَا إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، وَإِنَّ بُعْدَ مَا بَيْنَ طَرَفَيْهِ كَمَا بَيْنَ صَنْعَاءَ وَأَيْلَةَ، كَأَنَّ الْأَبَارِيقَ فِيهِ النُّجُومُ)).

(جابر)ی كوڕی (سمرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئاگاداربن من پێشەنگی كاروانتانم بۆسەر حەوزەكە، دووریی نێوان هەردوو كەناری وەكو نێوان (صنعاء)و (أیلة)یە، مەسینەكانیشی ئەوەندەی ئەستێرەكانە)).

١٤٧٩ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا آنِيَةُ الْحَوْضِ؟ قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ وَكَوَاكِبِهَا، أَلَا فِي اللَّيْلَةِ الْمُظْلِمَةِ الْمُصْحِيَةِ، آنِيَةُ الْجَنَّةِ مَنْ شَرِبَ مِنْهَا لَمْ يَظْمَأْ آخِرَ مَا عَلَيْهِ، يَشْخَبُ فِيهِ مِيزَابَانِ مِنَ الْجَنَّةِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ لَمْ يَظْمَأْ، عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ مَا بَيْنَ عَمَّانَ إِلَى أَيْلَةَ، مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ)).

(أبـي ذر)(ﷺ) دەڵـیٚ: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا كاسـەی حــەوز چیـیە؟ فەرمووی: ((سوێند بەوكەسـەی گیـانی منـی بەدەسـتە كاسـەكانی زیـاترن لـە ئەستێرەكانی ئاسمـان و هەسارەكانیش بـەڵام لـە شـەوێكی تـاریك و سـامالْدا، كاسەی بەهەشـت هەركـەس تیاخواردەوە تینـوی نابێ تـا كۆتـایی ئـەو حاڵـەی لەسـەر یـەتی {واتـە هـەتا هەتایـە} دوو پلوسك لەبەهەشتەوە دەڕژێنـە نـاو ئـەو حـەوزە، هەركـەس لێیخـواردەوە تینـوی نابـێ، پانایییەكـەی وەك نێوەنـدی عەممان و ئەیلەیە، ئاوەكەی سپی ترە لەشیر، شیرینترە لە هەنگوین)).

١٤٨٠ـ عَنْ ثَوْبَانَ (ﷺ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنِّي لَبِعُقْرِ حَوْضِي أَذُودُ النَّاسَ لِأَهْلِ الْيَمَنِ، أَضْرِبُ بِعَصَايَ حَتَّى يَرْفَضَّ عَلَيْهِمْ)). فَسُئِلَ عَنْ عَرْضِهِ؟ فَقَالَ: ((مِنْ مَقَامِي إِلَى عَمَّانَ)). وَسُئِلَ عَنْ شَرَابِهِ؟ فَقَالَ: ((أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، يَغُتُّ فِيهِ مِيزَابَانِ يَمُدَّانِهِ مِنَ الْجَنَّةِ، أَحَدُهُمَا مِنْ ذَهَبٍ وَالْآخَرُ مِنْ وَرِقٍ)).

لە (ثوبان)ەوە (ﷺ) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((من لەئاوەڕۆگە و كۆتـایی حەوزەكـەمدام، خـەڵكی لێدەگێڕمـەوە لـە پێنـاو خـەڵكی یەمـەندا، بەداردەستەكەم لێـی دەدەم تـا دەچـێ بـۆ ئـەوان)) پرسـیاركرا لەپانیییەكـەی؟ فەرمووی: ((لەم شوێن وەستانی منەوە بۆ عەممانە)) پرسیار كرا لـە ئاوەكـەی؟ فەرمووی: ((لەشیر سپیترە، لە هەنگوین شیرینترە، دوو پلوسكی بەتوندی تیا هەڵدەقوڵێ لەبەهەشتەوە دێن و یەكێكیان لەئاڵتون و ئەوی تریان لە زیوە)).

١٤٨١ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: ((إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لَأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الْآنَ، وَإِنِّي قَدْ أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الْأَرْضِ، أَوْ: مَفَاتِيحَ الْأَرْضِ، وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَتَنَافَسُوا فِيهَا)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٧٩]

(عَقبة)ەی كوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبـەر (ﷺ) دەرچوو نوێـژی كرد لەسەر شەهیدەكانی (أحد) وەك نوێـژی لەسـەر مردوو، پاشان چووە سـەر مینبـەر و فـەرمووی: ((مـن پێشـەنگی ئێـوەم ومـن شـایەتم لەسـەرتان، سـوێندم بەخوا ئێستا من تەماشـای حەوزەكـەم دەكـەم، مـن كلیلـی گەنجینـەكانی زەوی،

يـان كليلـى زەويـم پـێبەخشـراوە، سـوێندم بـەخوا ناترسـم لـێتـان كـە دواى مـن هاوەڵ بۆ خوا بڕيارب‌دەن، بەلام لەوە دەترسم لەسەردنيا كێبەركێ بكەن)).

## ( ٢٣ ) شێوەو تەمەنى پێغەمبەر ( ﷺ )

١٤٨٢ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ وَلَا بِالْقَصِيرِ، وَلَيْسَ بِالْأَبْيَضِ الْأَمْهَقِ وَلَا بِالْآدَمِ، وَلَا بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ وَلَا بِالسَّبِطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ. [بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٥]

(انـس)ى كـوڕى (مـالك) (ﷺ) دەڵـێ: پـێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) زۆر بـالا بـەرز نەبوو، كورتە بالاش نەبوو، زۆر سپى و گەچين نەبوو زۆر گەنم ڕەنگيش نەبوو، زۆر قژى لول نـەبوو زۆريش نـەرم و خـاو نـەبوو، خـواى گـەورە لـەچل سـاڵيدا كردى بەپێغەمبەر (ﷺ)، دەساڵ لە مەككە مايەوە، دەساڵيش لەمەدينە، خواى گەورە شەصت ساڵيدا گيانى كێشا هێشتا سەر و ڕيشى بيست مووى سپى تێ نەكەوتبوو.

١٤٨٣ـ عن الْبَرَاءَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلًا مَرْبُوعًا، بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ، عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ (ﷺ). [بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٨]

(براء)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) پياوێكى ميانەبالا و ناوشان پـان بـوو، قـژى بەردەدايـەوە تاسـەر نەرمـەى گوێـى، دەسـتێ جلـى سـوورى لەبـەر دەكرد، هيچ شتێكم لەو جوانترنەبينيوە.

١٤٨٤ـ عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَمَا عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ رَجُلٌ رَآهُ غَيْرِي، قَالَ: فَقُلْتُ [لَهُ]: فَكَيْفَ رَأَيْتَهُ؟ قَالَ: كَانَ أَبْيَضَ مَلِيحًا مُقَصَّدًا. قال مسلم: مَاتَ أَبُو الطُّفَيْلِ سَنَةَ مِائَةٍ، وَكَانَ آخِرَ مَنْ مَاتَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).

(ابو الطفيل)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەرم (ﷺ) بينيـوە، لـەم سەر ڕووى زەمينـەدا كـەس نـەماوە ديبێتـى من نـەبێ، {جريـرى، راوى} دەڵـێ: پێـم وت چۆنـت دى؟ وتـى: سپى بـوو جـوان بـوو، ئەندامـەكانى ڕێك و پێك بـوو. (مسـلم) دەڵـێ: ابـو

الطفیل سالّی صەدی کۆچی وەفاتی کردووە دوایین کەس بوو، لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ).

## ( ٢٤ ) مۆری پێغەمبەرایەتی

١٤٨٥ـ عن جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (رضي الله عنه) قالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قَدْ شَمِطَ مُقَدَّمُ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، وكَانَ إِذَا ادَّهَنَ لَمْ يَتَبَيَّنْ، وَإِذَا شَعِثَ رَأْسُهُ تَبَيَّنَ، وكَانَ كَثِيرَ شَعْرِ اللِّحْيَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ: وَجْهُهُ مِثْلُ السَّيْفِ. قَالَ: لَا، بَلْ كَانَ مِثْلَ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ، وَكَانَ مُسْتَدِيرًا، وَرَأَيْتُ الْخَاتَمَ عِنْدَ كَتِفِهِ مِثْلَ بَيْضَةِ الْحَمَامَةِ، يُشْبِهُ جَسَدَهُ.

(جابر)ی کوڕی (سَمُرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشی سەری و ڕیشی سپی تێکەوتبوو ئەگەر ڕۆنی بکردایە دەرنەدەکەوت، ئەگەر قژی پەژمودە ببوایە پێوە دیار بوو، موی ڕیشی چڕوپڕ بوو، پیاوێك وتی: ڕوی وەکو شمشێر وابوو، وتی: نەء، بەڵکو وەك خۆر و مانگ بوو، خڕ بوو، مۆری پێغەمبەرایەتیم دی بەلای شانیدا وەك هێلکەی کۆتر بوو، لەلاشەی خۆی دەچوو.

١٤٨٦ـ عن السَّائِبِ بْنَ يَزِيدَ (رضي الله عنه) قالَ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ. فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلَ زِرِّ الْحَجَلَةِ. [بخاري/ الوضوء/ ١٨٧]

(سائب)ی کوڕی (یزید)دەڵێ: پورم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم خوشکەزایەم ئازاری هەیە، دەستی هێنا بەسەرمدا دوعای پیرۆز بونی بۆ کردم، لەدواییدا دەستنوێژی گرت و لەئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، ئەمجا هەستام و چوومە پشتی‌یەوە تەماشای مۆرەکەیم کرد لە نێوەندی هەردوو شانیدا وەك هێلکەی کۆتر بوو.

١٤٨٧ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ (رضي الله عنه) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، وَأَكَلْتُ مَعَهُ خُبْزًا وَلَحْمًا. أَوْ قَالَ: ثَرِيدًا. قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: أَسْتَغْفَرَ لَكَ النَّبِيُّ (ﷺ)؟ قَالَ: نَعَمْ وَلَكَ، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ [محمد: ١٩]. قَالَ: ثُمَّ دُرْتُ خَلْفَهُ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، عِنْدَ نَاغِضِ كَتِفِهِ الْيُسْرَى، جُمْعًا، عَلَيْهِ خِيلَانٌ كَأَمْثَالِ الثَّآلِيلِ.

(عبدالله) کوڕی (سَرجِس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرم بینی (ﷺ) نان و گۆشت – یان وتی– تریتم لەگەڵ خوارد {عاصم فەرموودەکەی لە (عبدالله)وە ڕیوایەت کردووە} دەڵێ: پێم وت: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێبوردنی بۆنەکردی؟ وتی: بەڵێ، بۆتۆیشی کرد، ئەمجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿واستَغفِر لِذَنبِك و للمؤمنين و المؤمنات﴾ {محمد: ١٩} {واتە: ﴿داوای لێبوردن بۆ تاوانەکانت بکە، بۆ پیاوانی باوەڕدار و ئافرەتانی باوەڕداریش﴾}.

دەڵێ: دوای ئەوە پێچم کردەوە بۆ پشتی مۆری پێغەمبەرێتیم لەنێوەندی هەردوو شانیدا بینی لە لاسەروی شانی چەپیەوە بوو وەك کوڵە مستە وەهابوو خاڵی ورد وردی لەسەر بوو وەك بالووکە وەهابوو

## (٢٥) شێوەی دەم و چاو و پاژنەی پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٨٨ـ عن جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ضَلِيعَ الْفَمِ، أَشْكَلَ الْعَيْنِ، مَنْهُوسَ الْعَقِبَيْنِ. قَالَ: قُلْتُ لِسِمَاكٍ: مَا ضَلِيعُ الْفَمِ؟ قَالَ: عَظِيمُ الْفَمِ، [قَالَ]: قُلْتُ: مَا أَشْكَلُ الْعَيْنِ؟ قَالَ: طَوِيلُ شَقِّ الْعَيْنِ. قَالَ: قُلْتُ: مَا مَنْهُوسُ الْعَقِبِ؟ قَالَ: قَلِيلُ لَحْمِ الْعَقِبِ.

(جابر)ی کوڕی (سَمُرَة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمی گەورەبوو {واتە زۆر بچووك نەبوو} کالآنەی چاوی درێژبوو، {وەك خاوەنی اقتران النيرين دەڵێ: چاو بادامی بوو} پاژنەی پێی گۆشتن نەبوو.

## (٢٦) شێوەی ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٨٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ يُكْرَهُ أَنْ يَنْتِفَ الرَّجُلُ الشَّعْرَةَ الْبَيْضَاءَ مِنْ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، قَالَ: وَلَمْ يَخْتَضِبْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، إِنَّمَا كَانَ الْبَيَاضُ فِي عَنْفَقَتِهِ وَفِي الصُّدْغَيْنِ، وَفِي الرَّأْسِ نَبْذٌ. [بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٧]

(انس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێی ناخۆش بوو پیاو مووی سپی لەسەر و ڕیشی هەڵبکەنێت، دەڵێ: خەنەشی نەگرتۆتە سەر و ڕیشی، چونکە تەنها کەمێك لەچەناگەی و لاجانەکانی و چەند تاڵێك لەسەری سپی بوو بوو.

## (٢٧) مووی سپی پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٩٠ـ عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَبْيَضَ قَدْ شَابَ، كَانَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ (ﷺ) يُشْبِهُهُ. [بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٠، ٣٣٥٢]

(ابي جحيفة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرم دی (ﷺ) سپی و رووگەش بوو چەند تاڵێك موی سپی بوو حەسەنی کوڕی عەلی (ﷺ) لەو دەچوو.

## ( ٢٨ ) شێوەی مووی پێغەمبەر ( ﷺ )

١٤٩١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَضْرِبُ شَعَرُهُ مَنْكِبَيْهِ. [بخاري/ اللباس/ ٥٥٦٣]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: مووی سەری پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیشتە شانی

١٤٩٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ شَعَرُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ. [بخاري/ اللباس/ ٥٥٦٤]

(انس)(ﷺ) دەڵێ: مووی سەری پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیشتە ناوەڕاستی گوێی.

## ( ٢٩ ) بەردانەوەی مووی پێغەمبەر ( ﷺ ) جیاکردنەوەی

١٤٩٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدِلُونَ أَشْعَارَهُمْ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُءُوسَهُمْ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ بِهِ، فَسَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) نَاصِيَتَهُ ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ. [بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٥]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: خاوەن پەیامەکان (اهل الكتاب) قژیان شۆڕ دەکردەوە، بت پەرستەکانیش دەیانکرد بە دوو پارچەوە بەلای ڕاست و چەپدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەزیدەکرد وەك ئەهلی کیتاب بکات لەشتێکدا کە فەرمانی بۆ نەهاتبایە، بۆیە ماوەیەك بەسەر ناوچەوانیدا بەریدایەوە، دواتر جیای دەکردەوە بەڕاست و چەپی سەریدا.

## ( ٣٠ ) زەردەخەنەی پێغەمبەر ( ﷺ )

فەرموودەکەی (جابر)ی کوڕی (سمرة) لەم بارەیەوە، لەبەشی نوێژدا باسکرا،

## ( ٣١ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) شەرمن تربوو لەگەورە کچی ناوپەردە

١٤٩٤ـ عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (ﷺ) قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئًا عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ. [بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٩]

(ابو سعيد الخدري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەورەکچی ناوپەردە زیاتر شەرمی دەکرد و، ئەگەر شتێکی لاناخۆش بوایە لەڕومەتیا دەمانزانی.

## ( ٣٢ ) بۆنخۆشیی پێغەمبەر و نەرمیی لە پێ

١٤٩٥ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَزْهَرَ اللَّوْنِ، كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ، وَلَا مَسِسْتُ دِيبَاجَةً وَلَا حَرِيرَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَلَا شَمِمْتُ مِسْكَةً وَلَا عَنْبَرَةً أَطْيَبَ مِنْ رَائِحَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). [بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٨]

(انس)ی کوڕی (مالك) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سپی و گەش بوو، عەرەقی وەك مرواری وەهابوو، کەدەڕۆیی بەڕێدا لەنجەی دەکرد بەڕاست و چەپدا، دەستم لەهیچ ئاوریشمێك نەداوە لەناولەپی پێغەمبەر (ﷺ) نەرمتر بوبێت، بۆنی هیچ میسك و عەنبەرێکم نەکردووە لەبۆنی ئەو خۆشتر بووبێت.

١٤٩٦ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) صَلَاةَ الْأُولَى، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَهْلِهِ وَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَاسْتَقْبَلَهُ وِلْدَانٌ، فَجَعَلَ يَمْسَحُ خَدَّيْ أَحَدِهِمْ وَاحِدًا وَاحِدًا، قَالَ: وَأَمَّا أَنَا فَمَسَحَ خَدِّي، [قَالَ]: فَوَجَدْتُ لِيَدِهِ بَرْدًا -أَوْ: رِيحًا- كَأَنَّمَا أَخْرَجَهَا مِنْ جُؤْنَةِ عَطَّارٍ.

(جابر)ی کوڕی (سَمرة)دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژی یەکەمم کرد، دوایی ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ و منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم، منداڵ هاتن بەپیریەوە دەستی دەهێنا بەکوڵمیاندا یەك یەك، دەستی بەهەردوو کوڵمی منیشدا هێنا هەستم بەفێنکی -یان بۆنخۆشی- دەستی کرد، وەك ئەوەی لە قوتوی عەتار دەستی دەرهێنابێت. {مەبەست بە نوێژی یەکەم دەگونجێ نوێژی نیوەڕۆ بێت چونکە یەکەم نوێژێکە کە کرابێت}.

## ( ٣٣ ) عەرەق کردنی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەوەرزی سەرمادا لەکاتی وەحی بۆ هاتنیدا

١٤٩٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: إِنْ كَانَ لَيُنْزَلُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ، ثُمَّ تَفِيضُ جَبْهَتُهُ عَرَقًا. [بخاري/ بدء االوحي/ ٠٢]

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: بەیانی زۆر سارد وەحی دادەبەزییە سەر پێغەمبەر (ﷺ)، ناوچەوانی ئارەقی لێهەڵدەنیشت.

١٤٩٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ): كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ: ((أَحْيَانًا يَأْتِينِي فِي مِثْلِ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، ثُمَّ يَفْصِمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُهُ، وَأَحْيَانًا مَلَكٌ فِي مِثْلِ صُورَةِ الرَّجُلِ، فَأَعِي مَا يَقُولُ)).
[بخاري/ بدء االوحي/ ٠٢]

لە(عائشة)ەوە (ﷺ) کە (حارث)ی کوڕی (هشام) پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ): چۆن وەحیت بۆ دێ؟ فەرمووی: ((هەندێ کات وەك دەنگی زەنگ بۆم دێت، ئەمەیان سەختترین جۆریانە لەسەرم، لەپاشا لێم جیا دەبێتەوە کاتێ تەواو تێی‌گەیشتم، هەندێ جاریش فریشتەیەکە لەوێنەی پیاوێکدا، ئەوەی دەیڵێ تێی دەگەم.

## (٣٤) بۆنخۆشی ئارەقی پێغەمبەر (ﷺ)

١٤٩٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ عِنْدَنَا، فَعَرِقَ، وَجَاءَتْ أُمِّي بِقَارُورَةٍ فَجَعَلَتْ تَسْلُتُ الْعَرَقَ فِيهَا، فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: ((يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ)). قَالَتْ: هَذَا عَرَقُكَ، نَجْعَلُهُ فِي طِيبِنَا، وَهُوَ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ. ﴿بخاری / الاستئذان/ ٥٩٢٥﴾

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لامان و نیوەڕۆ خەوی کرد لای ئێمە، ئارەقی کرد، دایکم شوشەیەکی هێنا ئارەقەکەی دەسڕیە ناوی، پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری بویەوە فەرمووی: ((ئەی (أم سلیم) ئەوەچی دەکەیت؟ وتی: ئەوە ئارەقی تۆ دەکەینە ناو گوڵاوەکانمان، کە خۆشترین بۆنە.

## (٣٥) بەرەکەت وەرگرتن لەئارەقی پێغەمبەر (ﷺ)

١٥٠٠ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَدْخُلُ بَيْتَ أُمِّ سُلَيْمٍ فَيَنَامُ عَلَى فِرَاشِهَا، وَلَيْسَتْ فِيهِ. قَالَ: فَجَاءَ ذَاتَ يَوْمٍ فَنَامَ عَلَى فِرَاشِهَا فَأُتِيَتْ، فَقِيلَ لَهَا: هَذَا النَّبِيُّ (ﷺ) نَامَ فِي بَيْتِكِ عَلَى فِرَاشِكِ، قَالَ: فَجَاءَتْ وَقَدْ عَرِقَ وَاسْتَنْقَعَ عَرَقُهُ عَلَى قِطْعَةِ أَدِيمٍ عَلَى الْفِرَاشِ، فَفَتَحَتْ عَتِيدَتَهَا فَجَعَلَتْ تُنَشِّفُ ذَلِكَ الْعَرَقَ فَتَعْصِرُهُ فِي قَوَارِيرِهَا، فَفَزِعَ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَقَالَ: ((مَا تَصْنَعِينَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ)). فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَرْجُو بَرَكَتَهُ لِصِبْيَانِنَا. قَالَ: ((أَصَبْتِ)).

(انس)ی کوڕی (مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە ماڵی (أم سلیم) لەسەر پێخەفەکەی دەخەوت، خۆی لەماڵ نەبوو، ئەنەس دەڵێ: ڕۆژێك هات لەسەر پێخەفەکەی خەوت، هاتن بۆلای پێیان وت: ئەوە پێغەمبەرە (ﷺ) لەماڵی

ئێوەدایەو، لەسەر پێخەفەکەی تۆ خەوتووە، دەڵـێ: ئـەویش هـات لـەکاتێکدا ئارەقی کردبوو، ئارەقەکـەی کۆبوبوویـەوە لەسـەر پارچەیـەك چـەرم کەلەسـەر پیخەفەکە بوو، أم سلیم جانتاکەی کردەوەو، ئەو ئارەقەی بەپارچە پەڕۆیـەك هـەڵدەمژیو، دەیگوشـاردە نـاو شوشـەکانی‌یەوە، پێغەمبـەر (ﷺ) ڕاچڵـەکا و فەرمووی: ((ئەی (أم سلیم) ئەوە چی دەکەیت؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم ئارەقە هەڵدەگرین بۆ بەرەکەت بۆ منداڵەکانمان. فەرمووی: ((چاکت کرد)).

## (٣٦) نزیکی پێغەمبەر (ﷺ) لەخەڵك و پیرۆزیی وەرگرتن لەوزاتە

١٥٠١ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا صَلَّى الْغَدَاةَ جَاءَ خَدَمُ الْمَدِينَةِ بِآنِيَتِهِمْ فِيهَا الْمَاءُ، فَمَا يُؤْتَى بِإِنَاءٍ إِلَّا غَمَسَ يَدَهُ فِيهَا، فَرُبَّمَا جَاءُوهُ فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ فَيَغْمِسُ يَدَهُ فِيهَا.

لە(انس)ی کوڕی (مالك)ەوە دەفـەرمووێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـەرکات نوێژی بەیانی دەکرد، خزمەتگوزارەکانی مەدینە بەقاپەکانیانەوە دەهاتن ئاوی تیـابوو، هیچ قاپێکیـان بـۆ نـەدەهێنا کەدەستی تێدا نوقم نـەکات، زۆر وابـووە لەبەیانی‌یـەکی ساردا بۆیـان دەهێنـا هـەر دەسـتی تێـدا نوقـم دەکـرد. {واتـە: بۆبەرەکەت}

١٥٠٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَالْحَلَّاقُ يَحْلِقُهُ، وَأَطَافَ بِهِ أَصْحَابُهُ، فَمَا يُرِيدُونَ أَنْ تَقَعَ شَعْرَةٌ إِلَّا فِي يَدِ رَجُلٍ.

(انـس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ)م بینـی سـەرتاش، سـەری دەتاشـی، یارەکانی دەورەیان دابوو، نەیاندەهێڵا یەك تاڵ موو بکەوێت مەگەر لـە دەسـتی پیاوێکیاندا نەبێت.

١٥٠٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ امْرَأَةً كَانَ فِي عَقْلِهَا شَيْءٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً. فَقَالَ: ((يَا أُمَّ فُلَانٍ، انْظُرِي أَيَّ السِّكَكِ شِئْتِ حَتَّى أَقْضِيَ لَكِ حَاجَتَكِ)). فَخَلَا مَعَهَا فِي بَعْضِ الطُّرُقِ حَتَّى فَرَغَتْ مِنْ حَاجَتِهَا.

لە(انس)ەوە (ﷺ) کە ئافرەتێك هەبوو کەمێك عەقڵی ناتەواو بوو، وتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا من پێویستی‌یەکم بەتۆ هەیـە، فەرمووی: ((ئـەی دایکـی فـلان بزانە لەکام کۆڵان دەتەوێت بوەستە هـەتا پێویسـتی یەکـەت بۆجێبەجێ بکـەم، لەهەندێك سەرەڕێگەکاندا تەنها خۆی وخۆی وەسـتان و پێویسـتی‌یەکەی بـۆ ئەنجامدا.

## ( ٣٧ ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەبەزەییترین كەس بووە بۆ منداڵ و خێزان

١٥٠٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَرْحَمَ [الناس] بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ: كَانَ إِبْرَاهِيمُ مُسْتَرْضِعًا لَهُ فِي عَوَالِي الْمَدِينَةِ، فَكَانَ يَنْطَلِقُ وَنَحْنُ مَعَهُ فَيَدْخُلُ الْبَيْتَ وَإِنَّهُ لَيُدَّخَنُ، وَكَانَ ظِئْرُهُ قَيْنًا، فَيَأْخُذُهُ فَيُقَبِّلُهُ، ثُمَّ يَرْجِعُ. قَالَ عَمْرٌو: فَلَمَّا تُوُفِّيَ إِبْرَاهِيمُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ إِبْرَاهِيمَ ابْنِي، [وَإِنَّهُ] مَاتَ فِي الثَّدْيِ، وَإِنَّ لَهُ لَظِئْرَيْنِ تُكَمِّلَانِ رَضَاعَهُ فِي الْجَنَّةِ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٤١]

(انس)ی كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: هیچ كەسم نەدیوە بەبەزەییتر بووبێت بۆ خێزانی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێ: (ابراهیم) درابوو بە دایەن لە گوندەكانی دەوروبەری مەدینە،جاری وابوو دەچوو بۆلای و ئێمەیش لەگەڵی بووین، دەچووە ئەو ماڵە كە چرە دوكەڵی لێهەڵدەستاچونكە مێردی شیردەرەكەی (ابراهیم) ئاسنگەر بوو، {پێغەمبەر (ﷺ)}دەیگرت و ماچی دەكرد و پاشان دەگەڕایەوە. (عمرو) دەڵێ: كاتێ إبرهیم مرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ابراهیم كوڕی من بوو، ئەو مرد لەكاتێكدا دەم بە مەمك بوو، دوو شیردەری هەن لەبەهەشتدا ماوەی شیردانەكەی بۆ تەواو دەكەن)).

{ملاحظة: لەئەصلەكەدا (یكملان) هاتووە واتە مەبەست بە دوو شیردەرەكە ژنەكە و میردەكەیەتی}

١٥٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ أَبْصَرَ النَّبِيَّ (ﷺ) يُقَبِّلُ الْحَسَنَ، فَقَالَ: إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الْوَلَدِ، مَا قَبَّلْتُ وَاحِدًا مِنْهُمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّهُ مَنْ لَا يَرْحَمْ لَا يُرْحَمْ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٦٥١]

(ابو هریرة)(ﷺ) دەڵێ: (اقرع)ی كوڕی (حابس) پێغەمبەری (ﷺ) دی (حسین)ی ماچ دەكرد، (اقرع) وتی: بەڕاستی من دە منداڵم هەیە كەسیانم ماچ نەكردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هەركەس ڕەحمی نەبێت ڕەحمی پێناكرێت)).

## ( ٣٨ ) بەزەیی پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆ ئافرەتان

١٥٠٦- عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، وَغُلَامٌ أَسْوَدُ يُقَالُ لَهُ أَنْجَشَةُ يَحْدُو، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدَكَ سَوْقًا بِالْقَوَارِيرِ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٧٩٧]

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـىٚ: پێغەمبـەر (ﷺ) لەسـەفەرێكدا غولامێكـى ڕەشـيان لەگەڵدابو پێى دەوترا (انجشة) گۆرانى دەوت بۆ ئەوەى وشترەكان خێرا بڕۆن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: ((ئەى (انجشة) نـەرم و نيانبـە بـۆ لێخوڕينـى وشترى شوشەكان)). {مەبەستى ئافرەتەكان بوو}.

## ( ٣٩ ) ئازايەتى پێغەمبەر ( ﷺ ) و پێشڕەوى بۆ جەنگ

١٥٠٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَشْجَعَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَانْطَلَقَ نَاسٌ قِبَلَ الصَّوْتِ، فَتَلَقَّاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَاجِعًا، وَقَدْ سَبَقَهُمْ إِلَى الصَّوْتِ، وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لِأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ فِي عُنُقِهِ السَّيْفُ، وَهُوَ يَقُولُ: ((لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا)). قَالَ: ((وَجَدْنَاهُ بَحْرًا. أَوْ: إِنَّهُ لَبَحْرٌ)). قَالَ: وَكَانَ فَرَسًا يُبَطَّأُ. [بخاري/ الجهاد/ ٢٧٥١]

(انس)ى كوڕى (مالك) (ﷺ) دەڵـىٚ: پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) جوانـترين كـەس بوو، سەخيترين كەس بوو، ئازاترين كەس بـوو، شـەوێكيان خـەڵكى مەدينـە بەدەم دەنگێكەوە ڕاچڵەكان و بەرەو ڕووى دەنگەكە دەرچوون، پێغەمبـەر (ﷺ) پێيـان گەيشـت لەوسـەرەوە دەگەڕايـەوە، چونكـە ئـەو بەرلـەوان ڕۆيشـتبوو بـۆ هـەواڵى ئـەو دەنگـە، بەسـوارى ئەسـپەكەى (ابـو طلحـة)كـە پشـتى ڕوت بـوو پێغەمبەر (ﷺ) شمشێرێك لەمليدابوو، دەيفەرموو: ((مەترسن، مەترسن)). انس دەڵـىٚ: ئـەو ئەسپەمان دى زۆر خێرا دەڕۆيشـت يـان وەك دەريـا شـەپۆلى دەدا، لەكاتێكدا پێشتر بە ئەسپێكى سست و تەمبەڵ ناسرابوو.

## ( ٤٠ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) ڕەوشتى لەهەموو كەس جوانتربووە

١٥٠٨ـ عن أَنَسٌ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقًا، فَأَرْسَلَنِي يَوْمًا لِحَاجَةٍ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَا أَذْهَبُ، وَفِي نَفْسِي أَنْ أَذْهَبَ لِمَا أَمَرَنِي بِهِ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ)، فَخَرَجْتُ حَتَّى أَمُرَّ عَلَى صِبْيَانٍ، وَهُمْ يَلْعَبُونَ فِي السُّوقِ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ قَبَضَ بِقَفَايَ مِنْ وَرَائِي، قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقَالَ: ((يَا أُنَيْسُ، أَذَهَبْتَ حَيْثُ أَمَرْتُكَ)). قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، أَنَا أَذْهَبُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ أَنَسٌ: وَاللَّهِ لَقَدْ خَدَمْتُهُ تِسْعَ سِنِينَ، مَا عَلِمْتُهُ قَالَ لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ: لِمَ فَعَلْتَ كَذَا وَكَذَا. أَوْ لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ: هَلَّا فَعَلْتَ كَذَا وَكَذَا.

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوشتی لەهەموو كەس جوانتر بووە، ڕۆژێك ناردمی بۆ پێویستیەك وتم: بەخوا ناچم، بەڵام لەدڵما وابوو كە بچم بەدەم فەرمانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕۆیشتم تا تێپەڕیم بەلای كۆمەڵێك منداڵدا لەبازاڕدا یاریان دەكرد، وەختێكم زانی پێغەمبەر (ﷺ) لەدواوە پشت ملی گرتم، دەڵێ: تەماشام كرد پێدەكەنی، فەرمووی: ((ئەی (انس) ڕۆیشتی بۆ ئەو شوێنەی فەرمانم پێكردی؟)) وتم: بەڵی وا دەڕۆم ئەی پێغەمبەری خوا، انس وتی سوێند بە خوا نۆ ساڵ خزمەتم كردووە، پێنازانم بۆ شتێ كردبێتم فەرموبێتی بۆچ وەهات كرد و وەهات كرد؟ بۆ شتێكیش نەمكردبێ فەرموبێتی بۆ ئەوە و ئەوەت نەكرد؟

## ( ٤١ ) شێوازی قسەكردنی پێغەمبەر ( ﷺ )

١٥٠٩ـ عن عروة بن الزبير قَالَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُ وَيَقُولُ: اسْمَعِي يَا رَبَّةَ الْحُجْرَةِ، اسْمَعِي يَا رَبَّةَ الْحُجْرَةِ، وَعَائِشَةُ رضوان الله عليهما تُصَلِّي، فَلَمَّا قَضَتْ صَلَاتَهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: أَلَا تَسْمَعُ إِلَى هَذَا وَمَقَالَتِهِ آنِفًا؟ إِنَّمَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُحَدِّثُ حَدِيثًا لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لَأَحْصَاهُ.

(عروة)ی كوڕی (زبیر) دەڵێ: ابو هریرة فەرموودەی دەگێڕایەوە و دەیوت: گوێت لێبێت ئەی خاوەن حوجرە، گوێت لێبێت ئەی خاوەن حوجرە، لەو كاتەدا (عائشة)(ﷺ) نوێژی دەكرد، كاتێ لە نوێژەكەی بویەوە بە عروەی وت: ئایە گوێت لەو كابرا و وتەكانی بوو تۆزێ لەمەوبەر؟ بەراستی پێغەمبەر (ﷺ) بەشێوەیەك فەرموودەی دەفەرموو ئەگەر ژمێریار وشەكانی بژماردایە دەیژمارد {واتە: پەلەی نەدەكرد}

## ( ٤٢ ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەدوای هەلی گونجاودا دەگەڕا بۆ ئامۆژگاریمان

١٥١٠ـ عَنْ شَقِيقٍ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُذَكِّرُنَا كُلَّ يَوْمِ خَمِيسٍ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّا نُحِبُّ حَدِيثَكَ وَنَشْتَهِيهِ، وَلَوَدِدْنَا أَنَّكَ حَدَّثْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ. فَقَالَ: مَا يَمْنَعُنِي أَنْ أُحَدِّثَكُمْ إِلَّا كَرَاهِيَةُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الْأَيَّامِ، كَرَاهِيَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا. [بخاري/ العلم/ ٧٠]

(شقیق ابو وائل)دەڵێ: عبدالله هەموو ڕۆژێكی پێنج شەممە ئامۆژگاری دەكردین، پیاوێك پێی وت: ئەی (ابو عبدالرحمن) ئێمە قسەكانی تۆمان

پێخۆشە و حەزی پێدەکەین، پێمان خۆشە هەموو ڕۆژێك ئامۆژگاریمان بکەیت، وتی: من هیچ شتێ ڕێگرم نیە لەقسە بۆ کردنتان هەموو ڕۆژێك، ئەوە نەبێت پێم ناخۆشە بێزارتان بکەم، لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوبەناو لەهەلی گونجاودا ئامۆژگاری دەکردین لەترسی ئەوەی نەکو بێزار ببین.

## ( ٤٣ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) سەخیترین کەس بووە

١٥١١ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَام كَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ سَنَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ. [بخاري/ بدء الوحي/٦]

(ابن عباس)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەخیترین کەس بوو بۆ بەخشندەیی، سەخیترین کاتی لەمانگی ڕەمەزاندا بوو، بەڕاستی (جبریل (عليه السلام) هەموو ساڵێك لە ڕەمەزاندا تا تەواو دەبوو دەهات و، پێغەمبەر (ﷺ) قورئانی ئاراستە دەکرد کاتێ جبریل پێی دەگەیی پێغەمبەر (ﷺ) لەبایەکی خێراو بەردەوام سەخیتر بوو.

## ( ٤٤ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) داوای هیچ شتێکی لێنەکراوە بڵێ نابێ

١٥١٢ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) شَيْئًا قَطُّ فَقَالَ: لَا. [بخاري/ الأدب/ ٥٦٨٧]

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای هەر شتێکی لێکرابێت نەیفەرمووە نایبەخشم.

١٥١٣ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) غَنَمًا بَيْنَ جَبَلَيْنِ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ، فَأَتَى قَوْمَهُ، فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ أَسْلِمُوا، فَوَاللَّهِ إِنَّ مُحَمَّدًا (ﷺ) لَيُعْطِي عَطَاءً مَا يَخَافُ الْفَقْرَ. فَقَالَ أَنَسٌ: إِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيُسْلِمُ مَا يُرِيدُ إِلَّا الدُّنْيَا. فَمَا يُسْلِمُ حَتَّى يَكُونَ الْإِسْلَامُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا.

(انس)(رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك داوای ڕانە مەڕێکی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) کەلەنێوان دو چیادا بوو، ئەویش پێی بەخشی ئینجا چوو بۆلای هۆزەکەی وتی: ئەی هۆز موسڵمان بن سوێند بەخوا محمد (ﷺ) بەخشینێك دەبەخشێت کەلە هەژاری ناترسێت. انس دەڵێ: جاری وابووە پیاوێك موسڵمان بووە تەنها

وردببنەوە ئایا کەسێکیان تیا دەبینن کە کەسێکی دیبێت ئەو کەسە کەسێکی تری دیبێت کە ئەو یارانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێت؟ پیاوێك پەیدا دەبێ و بەهۆی ئەوەوە سەرکەوتن بەدەس دێنن)).

## (٦٧) باشترین سەدە سەدەی صەحابەیە، ئەمجا ئەوانەی بەدوایاندا دێن ئەمجا ئەوانەی بەدوایاندا دێن

١٦٧٠ـ عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)). قَالَ عِمْرَانُ: فَلَا أَدْرِي أَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ قَرْنِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةً. ((ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلَا يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ)). [بخاري/ الشهادات/ ٢٥٠٨]

لە(عمران)ی کوڕی (حصین)ەوە (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((باشترین سەدە سەدەی منە، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن)) (عمران) دەڵێ: نازانم ئایا پێغەمبەر (ﷺ) دوای سەدەکەی خۆی دووجار یان سێجاری فەرموو، ((دوای ئەوە قەومێك دێن شایەتیدەدەن بێئەوەی داوایان لێبکرێ، {واتە پەلەی تیادەکەن و لەخوا ناترسن} خیانەت دەکەن و جێی متمانە نین، نەزر دەکەن و جێبەجێی ناکەن، قەڵەوییان تیا دەردەکەوێ)).

## (٦٨) خەڵکی کانزای جۆراو جۆرن

١٦٧١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ، فَخِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا. وَتَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ فِي هَذَا الْأَمْرِ أَكْرَهُهُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ فِيهِ. وَتَجِدُونَ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ ذَا الْوَجْهَيْنِ: الَّذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ)). [بخاري/ المناقب/ ٣٣٠٤]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((دەبینن خەڵك وەك كانزا وەهان، چاكترین کەسیان لەنافامیدا چاکترینیانە لە ئیسلامدا بەمەرجێك شارەزای ئایین بن، دەبینن باشترین کەس بۆ بەڕێوەبردنی بەرپرسیاریی ئەم دینە ئەو کەسەیانە زۆری لاناخۆش بێت بەرلەوەی یەخەگیری بێت، دەبینن خراپترین کەس دووڕووەکانە: ئەوانەی دەچنە لای ئەم کۆمەڵە بەڕوویەکەوە و دەچنە لای کۆمەڵێکی تر بەڕوویەکی ترەوە)).

## (٦٩) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)
## صەد ساڵ تێنا پەڕێ لەسەر زەویدا گیانداریك
## لەوانە بمێنێ کەلەسەری بووە

١٦٧٢ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ صَلَاةَ الْعِشَاءِ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: ((أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ؟ فَإِنَّ عَلَى رَأْسِ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ)). قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَهَلَ النَّاسُ فِي مَقَالَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) تِلْكَ، فِيمَا يَتَحَدَّثُونَ مِنْ هَذِهِ الْأَحَادِيثِ عَنْ مِائَةِ سَنَةٍ، وَإِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنْ يَنْخَرِمَ ذَلِكَ الْقَرْنُ)). [بخاري/ مواقيت الصلاة/ ٥٧٦]

(عبدالله)ی کوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) شەوێك نوێژی عیشای بۆکردین لە کۆتایی ژیانیدا، کاتێ سەلامی‌دایەوە فەرمووی: ((ئایا دەزانن لە ئەمشەوی ئێوەوە هەتا صەد ساڵی تر یەك کەس لەوانەی ئێستە لەسەر پشتی زەوین، نامێنن))؟ خەڵکەکە خراپ تێگەیشتن لەم فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە قسەیان لەم صەد ساڵە کرد، ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوەبوو یەك کەس نامێنێ لەوەی ئێستا لەسەر ڕووی زەمینە)) مەبەستی ئەوە بوو ئەو جیلەی ئێستا هەیە نامێنێ.

## (٧٠) نەهیکردن لە جنێودان بەیارانی پێغەمبەر (ﷺ)

١٦٧٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي. فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ)). [بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٧٠]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((جنێو مەدەن بەیارانی من، جنێو مەدەن بەیارانی من، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە گەریەکێ لە ئێوە بەئەندازەی (اُحد) ئاڵتون بکات بەخێر، ناگات بە مشتی یەکێ لەوان و، بەنیوەی مشتێکیش)).

## (٧١) پلە وپایەی (أویس)ی قەرەنی لە(تابعین) (ﷺ)

١٦٧٤ـ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ خَيْرَ التَّابِعِينَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ أُوَيْسٌ، وَلَهُ وَالِدَةٌ، وَكَانَ بِهِ بَيَاضٌ، فَمُرُوهُ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ)).

(عمر)ی كوڕی (خطاب)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: ((چاكترین (تابعین) پیاوێكە پێی دەوترێ (اویس) دایكی ماوە، پەڵەی سپی بەگیانی‌یەوە بووە، پێی بڵێن باداوای لێبوردنتان بۆ بكا)).

١٦٧٥ـ عَنْ أُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) إِذَا أَتَى عَلَيْهِ أَمْدَادُ أَهْلِ الْيَمَنِ سَأَلَهُمْ: أَفِيكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ حَتَّى أَتَى عَلَى أُوَيْسٍ، فَقَالَ: أَنْتَ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَانَ بِكَ بَرَصٌ فَبَرَأْتَ مِنْهُ إِلَّا مَوْضِعَ دِرْهَمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: لَكَ وَالِدَةٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((يَأْتِي عَلَيْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مَعَ أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ، مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ، كَانَ بِهِ بَرَصٌ فَبَرَأَ مِنْهُ إِلَّا مَوْضِعَ دِرْهَمٍ، لَهُ وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌّ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ فَافْعَلْ)). فَاسْتَغْفِرْ لِي. فَاسْتَغْفَرَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: الْكُوفَةَ، قَالَ: أَلَا أَكْتُبُ لَكَ إِلَى عَامِلِهَا. قَالَ: أَكُونُ فِي غَبْرَاءِ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيَّ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ حَجَّ رَجُلٌ مِنْ أَشْرَافِهِمْ فَوَافَقَ عُمَرَ، فَسَأَلَهُ عَنْ أُوَيْسٍ، قَالَ: تَرَكْتُهُ رَثَّ الْبَيْتِ قَلِيلَ الْمَتَاعِ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((يَأْتِي عَلَيْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مَعَ أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ، مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ، كَانَ بِهِ بَرَصٌ فَبَرَأَ مِنْهُ، إِلَّا مَوْضِعَ دِرْهَمٍ، لَهُ وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌّ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ فَافْعَلْ)). فَأَتَى أُوَيْسًا فَقَالَ: اسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: أَنْتَ أَحْدَثُ عَهْدًا بِسَفَرٍ صَالِحٍ، فَاسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: اسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: أَنْتَ أَحْدَثُ عَهْدًا بِسَفَرٍ صَالِحٍ، فَاسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: لَقِيتَ عُمَرَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَاسْتَغْفَرَ لَهُ، فَفَطِنَ لَهُ النَّاسُ، فَانْطَلَقَ عَلَى وَجْهِهِ. قَالَ أُسَيْرٌ: وَكَسَوْتُهُ بُرْدَةً، فَكَانَ كُلَّمَا رَآهُ إِنْسَانٌ قَالَ: مِنْ أَيْنَ لِأُوَيْسٍ هَذِهِ الْبُرْدَةُ؟

(أسَیر)ی كوڕی (جابر) دەڵێ: عمری كوڕی (خطاب)(ﷺ) هەركات سوپای یەمەنی بۆ دەهات لێی دەپرسین، ئایە (اویس)ی كوڕی (عامر)تان تیاهەیە؟ هەتا (اویس)ی دۆزیەوە، وتی: تۆی اویس ی كوڕی عامر؟ وتی: بەڵێ، وتی: لە هۆزی (مراد) و تیرەی (قرن)ی؟ وتی: بەڵێ وتی: بەڵەكت پێوە بوو چاكبویتەوە

بەئەندازەی جێگە درهەمێك نەبێت؟ وتی: بەڵێ، وتی: دایكت ماوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: ((اویس ی كوڕی عامر دێت بۆلاتان لەگەڵ سوپای خەڵكی یەمەندا، لە هۆزی (مراد)و تیرەی (قرن)ە، بەڵەكی پێوەبوو چاكبوەتەوە، جێگای یەك درهەمی نەبێت، دایكێكی هەیە زۆر چاكە بۆی، ئەگەر سوێند بخوا لەسەر خوا سوێندەكەی ناخات، ئەگەر توانات بوو {پێی بڵێ} داوای لێخۆشبوونت بۆ بكا بیكە)) دەی داوای لێخۆش بوونم بۆ بكە. أویس)داوای لێخۆشبوونی بۆ كرد، (عمر) پێی وت: نیازی كوێت هەیە؟ وتی: كوفە، وتی: ئایا نامەت بۆ نەنووسم بۆ لای كارمەندی كوفە؟ وتی: لەناو خەڵكە ڕەش و ڕووتەكەدا بم پێم خۆشترە. لە ساڵی داهاتوودا گەورە پیاوێكی كوفە هات بۆ حەج لەگەڵ عمر توشی یەكهاتن، پرسیاری (أویس)ی لێكرد، وتی: من جێم هێشت لە ماڵێكی شڕ و كەم كەلوپەلدا. وتی: لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: ((دێت بۆ لاتان لەگەڵ سوپای خەڵكی یەمەندا (اویس)ی كوڕی (عامر)، لە هۆزی (مراد) و تیرەی (قَرَن) بەڵەكدار بووە چاكبۆتەوە جگە لە جێگای یەك درهەم نەبێت، دایكێكی هەیە زۆر چاكە بۆی ، ئەگەر سوێند بخوات لەسەر خوا سوێندەكەی ناخات، ئەگەر توانات بوو {پێی بڵێ} داوای لێبوردنت بۆ بكا بیكە، كابرا گەڕایەوە لای (أویس) و پێی وت: داوای لێبوردنم بۆ بكە، وتی: تۆ تازە هاتوویتەوە لەسەفەرێكی چاك داوای لێبوردنم بۆ بكە، وتی: داوای لێبوردنم بۆ بكە، وتی: تۆ تازە هاتویتەوە لەسەفەرێكی چاك داوای لێبوردنم بۆ بكە. ئەمجا وتی: (عمر)ت دی؟ وتی: بەڵێ، داوای لێبوردنی بۆ كرد، خەڵك بە (اویس) یان زانی و شارەزای بوون، سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیی (أسیر) دەڵێ: عەبایەكم پیبەخشی هەركەسێ دەیبینی دەیوت: أویس ئەم عەبای لەكوێ بوو؟

## (٧٢) باسی میصر و خەڵكەكەی

١٦٧٦ـ عَنْ أَبِي ذَرّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ مِصْرَ، وَهِيَ أَرْضٌ يُسَمَّى فِيهَا الْقِيرَاطُ، فَإِذَا فَتَحْتُمُوهَا فَأَحْسِنُوا إِلَى أَهْلِهَا، فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا -أَوْ قَالَ: ذِمَّةً وَصِهْرًا- فَإِذَا رَأَيْتَ رَجُلَيْنِ يَخْتَصِمَانِ فِيهَا فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ فَاخْرُجْ مِنْهَا)). قَالَ: فَرَأَيْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ شُرَحْبِيلَ بْنِ حَسَنَةَ وَأَخَاهُ رَبِيعَةَ يَخْتَصِمَانِ فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ فَخَرَجْتُ مِنْهَا.

لە(ابي ذر)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئێوە میصر ئازاد دەکەن، کە خاکێکە ناوی (قیراط)ی تیا دەبرێ، هەرکات ئازادتان کرد چاکە بکەن لەگەڵ خەڵکەکەیدا، چونکە ئەوان پەیمان وسیلەی ڕەحمیشیان هەیە {لەسەرمان} -یان فەرمووی: -پەیمان و خەزوریەتی- هەرکات دیت دوپیاو لەوێدا دەمەدەمێیان کرد لەسەر جێگەی خشتێك لێی دەرچۆ)) دەڵێ: دیم (عبدالرحمن)ی کوڕی (شرحبیل)ی کوڕی (حسنة) و (ربیعە) ی برای بوبە ناکۆکیان لە جێگە خشتێکدا ئیتر من دەرچووم لە میصر.

## (٧٣) باسی (عمان)

١٦٧٧ـ عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلًا إِلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ، فَسَبُّوهُ وَضَرَبُوهُ، فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَوْ أَنَّ أَهْلَ عُمَانَ أَتَيْتَ مَا سَبُّوكَ وَلَا ضَرَبُوكَ)).

(ابو هریرة)(ﷺ) دەڵێ: دانیشتبووین لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) کە سورەتی (الجمعة) نازڵ بوو، کاتێ ئەمەی خوێند: ﴿و آخرين منهم لما يلحقوا بهم﴾ {الجمعة: ٣} پیاوێك وتی: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی نەدایەوە هەتا دوجار،یان سێجار پرسیارەکەی لێکرد، دەڵێ: سەلمانی فارسیمان لەناودا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی نایە سەر سەلمان و فەرمووی: ((ئەگەر باوەڕ لەلای حەوتەوانەدا بوایە چەند پیاوێك لەمانە دەستیان دەیگەیشتێ)).

## (٧٤) خەڵك وەك صەد وشتر وەهان کە بارە بەرێکیان تیا دەسناکەوێت

١٦٧٨ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تَجِدُونَ النَّاسَ كَإِبِلٍ مِائَةٍ، لَا يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٣٣]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((دەبینن خەڵك وەك صەد وشتر وەهان کە پیاو لەناویاندا یەك دانەی دەست نەکەوێت بە کەڵکی سواری و باربێت)). {واتە: مرۆڤی چاك و پاك کەم دەبێت}.

## (٧٥) باسی زۆر درۆزنەکەی هۆزی (ثقيف)

١٦٧٩ـ عَنْ أَبِي نَوْفَلٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (ﷺ) عَلَى عَقَبَةِ الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَجَعَلَتْ قُرَيْشٌ تَمُرُّ عَلَيْهِ وَالنَّاسُ، حَتَّى مَرَّ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ ابْنُ عُمَرَ (ﷺ)، فَوَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلَامُ عَلَيْكَ

أَبَا خُبَيْبٍ أَمَا وَاللَّه لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا، أَمَا وَاللَّه لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا، أَمَا وَاللَّه لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا، أَمَا وَاللَّه إِنْ كُنْتَ مَا عَلِمْتُ صَوَّامًا قَوَّامًا وَصُولًا لِلرَّحِمِ، أَمَا وَاللَّه لَأُمَّةٌ أَنْتَ أَشَرُّهَا لَأُمَّةٌ خَيْرٌ. ثُمَّ نَفَذَ عَبْدُ اللَّه بْنُ عُمَرَ. فَبَلَغَ الْحَجَّاجَ مَوْقِفُ عَبْدِ اللَّه وَقَوْلُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَأُنْزِلَ عَنْ جِذْعِهِ، فَأُلْقِيَ فِي قُبُورِ الْيَهُودِ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى أُمِّهِ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ)، فَأَبَتْ أَنْ تَأْتِيَهُ، فَأَعَادَ عَلَيْهَا الرَّسُولَ: لَتَأْتِيَنِّي، أَوْ لَأَبْعَثَنَّ إِلَيْكِ مَنْ يَسْحَبُكِ بِقُرُونِكِ. قَالَ: فَأَبَتْ وَقَالَتْ: وَاللَّه لَا آتِيكَ حَتَّى تَبْعَثَ إِلَيَّ مَنْ يَسْحَبُنِي بِقُرُونِي. قَالَ: فَقَالَ: أَرُونِي سِبْتَيَّ. فَأَخَذَ نَعْلَيْهِ ثُمَّ انْطَلَقَ يَتَوَذَّفُ حَتَّى دَخَلَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: كَيْفَ رَأَيْتِنِي صَنَعْتُ بِعَدُوِّ اللَّه؟ قَالَتْ: رَأَيْتُكَ أَفْسَدْتَ عَلَيْهِ دُنْيَاهُ، وَأَفْسَدَ عَلَيْكَ آخِرَتَكَ، بَلَغَنِي أَنَّكَ تَقُولُ لَهُ: يَا ابْنَ ذَاتِ النِّطَاقَيْنِ، أَنَا وَاللَّه ذَاتُ النِّطَاقَيْنِ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكُنْتُ أَرْفَعُ بِهِ طَعَامَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) وَ[طَعَامَ] أَبِي بَكْرٍ مِنَ الدَّوَابِّ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَنِطَاقُ الْمَرْأَةِ الَّتِي لَا تَسْتَغْنِي عَنْهُ، أَمَا إِنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) حَدَّثَنَا: أَنَّ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابًا وَمُبِيرًا، فَأَمَّا الْكَذَّابُ فَرَأَيْنَاهُ، وَأَمَّا الْمُبِيرُ فَلَا إِخَالُكَ إِلَّا إِيَّاهُ. قَالَ: فَقَامَ عَنْهَا وَلَمْ يُرَاجِعْهَا.

(ابو نوفل)دەڵێ: دیم عبدالله ی کوڕی زبیر (ﷺ) بەسەر تەپۆڵکەی شارەوە، قورەیش و خەڵکی بەلایدا تێدەپەرین، هەتا عبدالله ی کوڕی عمر (ﷺ) تێپەڕی بەلایدا و، وەستا لەسەری و، وتی: سەلامت لەسەر ئەی باوکی (خُبیب) سەلامت لەسەر ئەی باوکی (خُبیب)، سەلامت لەسەر ئەی باوکی (خُبیب)، ئاگادار بە (والله) من نەهیم لێکردی لەم کارە، ئاگاداربە (والله) من نەهیم لێکردی لەم کارە، ئاگادار بە (والله) من نەهیم لێکردی لەم کارە، ئاگادار بە (والله) ئەوەندەی من بزانم تۆ زۆر بەڕۆژ و دەبوویت، زۆر شەونوێژت دەکرد، زۆر سیلەی ڕەحمت دەگەیاند، ئاگاداربە (والله) ئوممەتێك تۆ خراپەکەیان بیت ئەوە ئوممەتێکی چاکە، ئەمجاعبدالله ڕۆیی، ئەم وەستانەی عبدالله گەیشتەوە بە (حجاج) ناردی لە لقی قەنارەکەی دایانگرت و فرێی دایە ناو گۆڕستانی جولەکەکان. دوای ئەوە (حجاج) ناردی بە دوای دایکی عبدالله دا کە (اسماء)ی کچی (ابوبکر الصدیق)بوو (ﷺ)، نەهات بۆلای جارێکی تر ناردیەوە بە دوایدا وتی: پێی بڵێن: ئەگەر نەیەیت کەسێکت بۆ دەنێرم بە پرچەکانت ڕاتکێشن، نەهات و وتی: (والله) نایەم بۆ لات هەتا کەسێك دەنێری بە پرچەکانم ڕامکێشێ، وتی: نەعلەکانم بۆ بهێنن، نەعلەکانی لەپێکرد و بەپەلە و بەفیزەوە ڕۆیشت، تا

گەیشتە لای (اسمـاء) وتـی: چۆنـە بەلاتـەوە ئـەوەی مـن کـردم بـە دوژمنـی خـوا؟ وتـی: وادەتبینـم تـۆ دنیـات لـەو تێکـدا، ئـەویش قیامـەتی لـە تـۆ تێکـدا، هـەواڵم پێگەیشتووە کە تۆ بە (عبدالله)ت وتووە: ئەی کوڕی (ژنە دوپشتێنەکە) سوێند بەخوا منم دو پشـتێنە، یـەکێکیان خواردنەکـەی پێغەمبـەر (ﷺ) و (ابوبکـر)م پێهەڵدەگرت و {دەمپاراست لە ئاژەڵ و جرجانـەوەر}، ئـەوی دیکەیشـیان ئـەو پشتێنەیە کە ئافرەت پێویستە هەیبێ، ئاگاداربە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووین: ((لە (ثقیف)دا زۆر درۆزنێـك و فەوتێنـەرێك هەیە، زۆر درۆزنەکـەمان دی، فەوتێنەرەکـەیش وادەزانم کـەتۆیت. (حجـاج) هەسـتا ڕۆیـی و وەڵامـی نەدایەوە.

## (٥٤) بەشی چاکە و پەیوەندی خزمایەتی

### (١) چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایكدا

١٦٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: ((أُمُّكَ)). قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ((ثُمَّ أُمُّكَ)). [قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ((ثُمَّ أُمُّكَ))]. قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ((ثُمَّ أَبُوكَ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٦٢٦]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: كێ لەهەموو كەس شایستە ترە كە من چاكەكار بم لەگەڵیدا، فەرمووی: ﴿دایكت﴾. وتی: پاشان كێی تر؟ فەرمووی: ﴿پاشان دایكت﴾. وتی: پاشان كیی تر؟ فەرمووی: ﴿پاشان دایكت﴾. وتی: پاشان كێی تر؟ فەرمووی: ﴿پاشان باوكت﴾.

### (٢) چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایكدا لە عیبادەتی سوننەت لە پێشترە

١٦٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ إِلَّا ثَلَاثَةٌ: عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ، وَصَاحِبُ جُرَيْجٍ، وَكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلًا عَابِدًا، فَاتَّخَذَ صَوْمَعَةً فَكَانَ فِيهَا، فَأَتَتْهُ أُمُّهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: يَا رَبِّ، أُمِّي وَصَلَاتِي؟ فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِهِ، فَانْصَرَفَتْ. فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي، فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: يَا رَبِّ أُمِّي وَصَلَاتِي؟ فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِهِ، فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ [وَهُوَ يُصَلِّي] فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ أُمِّي وَصَلَاتِي؟ فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِهِ، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ لَا تُمِتْهُ حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى وُجُوهِ الْمُومِسَاتِ. فَتَذَاكَرَ بَنُو إِسْرَائِيلَ جُرَيْجًا وَعِبَادَتَهُ، وَكَانَتِ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بِحُسْنِهَا، فَقَالَتْ: إِنْ شِئْتُمْ لَأَفْتِنَنَّهُ لَكُمْ. قَالَ: فَتَعَرَّضَتْ لَهُ فَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهَا، فَأَتَتْ رَاعِيًا كَانَ يَأْوِي إِلَى صَوْمَعَتِهِ فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا، فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَحَمَلَتْ، فَلَمَّا وَلَدَتْ قَالَتْ: هُوَ مِنْ جُرَيْجٍ، فَأَتَوْهُ فَاسْتَنْزَلُوهُ، وَهَدَمُوا صَوْمَعَتَهُ، وَجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ. فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ؟ قَالُوا: زَنَيْتَ بِهَذِهِ الْبَغِيِّ فَوَلَدَتْ مِنْكَ. فَقَالَ: أَيْنَ الصَّبِيُّ؟ فَجَاءُوا بِهِ. فَقَالَ: دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّيَ، فَصَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَتَى الصَّبِيَّ فَطَعَنَ فِي بَطْنِهِ وَقَالَ: يَا غُلَامُ مَنْ أَبُوكَ؟ قَالَ: فُلَانٌ الرَّاعِي. قَالَ: فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ يُقَبِّلُونَهُ وَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ، وَقَالُوا: نَبْنِي لَكَ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: لَا، أَعِيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ فَفَعَلُوا. وَبَيْنَا صَبِيٌّ يَرْضَعُ مِنْ أُمِّهِ، فَمَرَّ رَجُلٌ

رَاكِبٌ عَلَى دَابَّةٍ فَارِهَةٍ، وَشَارَةٍ حَسَنَةٍ، فَقَالَتْ أُمُّهُ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هَذَا، فَتَرَكَ الثَّدْيَ وَأَقْبَلَ إِلَيْهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهِ، فَجَعَلَ يَرْتَضِعُ -قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ يَحْكِي ارْتِضَاعَهُ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ فِي فَمِهِ فَجَعَلَ يَمُصُّهَا-. قَالَ: وَمَرُّوا بِجَارِيَةٍ وَهُمْ يَضْرِبُونَهَا، وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، وَهِيَ تَقُولُ: حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، فَقَالَتْ أُمُّهُ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهَا، فَتَرَكَ الرَّضَاعَ وَنَظَرَ إِلَيْهَا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَهُنَاكَ تَرَاجَعَا الْحَدِيثَ. فَقَالَتْ: حَلْقَى، مَرَّ رَجُلٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ، فَقُلْتَ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ! وَمَرُّوا بِهَذِهِ الْأَمَةِ وَهُمْ يَضْرِبُونَهَا وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهَا، فَقُلْتَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا! قَالَ: إِنَّ ذَاكَ الرَّجُلَ كَانَ جَبَّارًا، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، وَإِنَّ هَذِهِ يَقُولُونَ لَهَا: زَنَيْتِ وَلَمْ تَزْنِ، وَسَرَقْتِ وَلَمْ تَسْرِقْ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا)).
[بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٥٣]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەناو لانکەدا کەس گفتوگۆی نەکردووە، سێ کەس نەبێ: عیسی کوڕی مریم، ئەو منداڵەی کە بەهۆی جورەیجەوە هاتە ئاخاوتن. جورەیج پیاوێکی خوا پەرست بوو، خەڵوەتگایەکی بۆ خۆی دانابوو، کە بەندایەتی تیا دەکرد، دایکی هات بۆلای — لەکاتێکدا جورەیج نوێژی دەکرد— و پێی وت: کوڕم جورەیج! ئەویش وتی: (لەدڵی خۆیدا) خوایە تیا ماووم لە نێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟. پاشان بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، دایکی گەڕایەوە، بۆ بەیانی بەهەمان شێوە، دایکی هاتەوە بۆ لای، ئەو هەر نوێژی دەکرد، دایکی وتی: ئەی جورەیج! ئەویش وتی (خوایە تیا ماوم لە نێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟ پاشان بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، بۆ بەیانی سێهەمیش هاتەوە، ئەو هەر نوێژی دەکرد، بۆیە دایکی وتی: ئەی جورەیج. ئەویش وتی: خوایە تیاماووم لە نێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟ بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی بۆیە دایکی نزای لێکردوو وتی: خوایە مەیمرێنە هەتا ڕوخساری داوێن پیسان دەبینێت! ئالێرەدا ئیسرائیلیەکان کەوتنە باسی جورەیج و عیبادەتەکەی.

ئافرەتێکی بەد ڕەوشت هەبوو، کە نموونە بوو لە جوانیدا پێی وتن: ئەگەر ئێوە بتانەوێت، ئەوا من جورەیج لە خشتە دەبەم و پاشان ئافرەتەکە چوو بۆ

لای جورەیج و، ڕێگای پێگرت، بەڵام جورەیج گوێی پێنەدا، ئافرەتەکە چوو بۆ لای شوانێك کە سەردانی خەڵوەتگای جورەیجی دەکرد، خۆی دایەدەستی و کاری داوێن پیسی لەگەڵدا ئەنجام داو، سکی پڕ بوو، کاتێك کە منداڵەکەی بوو، وتی: ئەم منداڵە لە جورەیجە. خەڵکەکە چوون بۆلای جورەیج و، خەڵوەتگاکەیان ڕووخاند و، لە خەڵوەتگاکە دایان گرت و دەستیان کرد بە لێدانی جورەیج، وتی: چیتانە! بۆ وام لێدەکەن؟ وتیان تۆ لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەدڕەوشتە کاری داوێن پیسیت ئەنجام داوە، منداڵی بووە لە تۆ، جورەیج وتی: کوا منداڵەکە منداڵەکەیان هێنا بۆلای وتی: وازم لێبێنن هەتا نوێژ دەکەم، پاشان دەستیکرد بە نوێژ کردن، کاتێك لێبوویەوە، هات بۆ لای منداڵەکە و، دەستی مالّی بە سکی منداڵەکەدا و وتی: کوڕە باوکت کێیە؟ منداڵەکە هاتە گۆ و وتی: فلان کەسی شوانە. خەڵکەکە ڕویان کردە جورەیج و، پاشان ماچیان کرد و، دەستیان بەسەردا دەهێنا، وتیان: خەڵوەتگاکەت بە زێڕ و زیو بۆ دروست دەکەینەوە، جورەیج وتی: نەخێر، بەڵکو وەکو خۆی لێبکەنەوە –کەلە گڵ و قوڕ بوو– ئەوانیش ئەو کارەیان ئەنجام دا. (سێهەم) منداڵێکیش خەریکی شیر خواردن بوو، پیاوێکی جوانخاس کە سواری ئەسپێکی خۆشڕەو بوبوو بەوێدا تێپەڕی، دایکی منداڵەکە وتی: خوایە! ئەم کوڕەم وەك ئەم سوارە لێبکەیت، منداڵەکە، وازی لە مەمکی دایکی هێنا و ڕوی کردە پیاوەکە و، سەیری کرد و وتی: خوایە وەکو ئەوم لێنەکەیت. پاشان دەستی کردەوە بە مژینی شیری دایکی. (ابو هريرة) دەڵێ: (ئەو دیمەنەم لەبەرچاوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم چیرۆکەی دەگێڕایەوە و پەنجەی شایەتمانی خستبۆوە نێو دەمیەوە و دەیمژی) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەم منداڵ و دایکە)) بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕین کە بەتوندی لێیان دەدا و، دەیان وت: داوێن پیسیت کردوە، دزیت کردووە، ئافرەتەکەش دەیوت: خوام بەسە و تەنها پشتم بەو قایمە، دایکی وتی: خوایە! ئەم کوڕەم وەك ئەم ئافرەتە لێنەکەیت. (جارێکی تر) منداڵەکە وازی لە شیرخواردن هێنا و سەیرێکی ئافرەتەکەی کرد و وتی: خوایە وەك ئەوم لێبکەیت، پاشان دایکی لەگەڵی کەوتە گفتوگۆ و بەسەرسامیەوە وتی: لاڵ بیت، پیاوێکی شەنگ و شۆخ تێپەڕی وتم: خوایە کوڕەکەم وەکو ئەو لێبکەیت؟ کەچی تۆ وتت: خوایە وەك ئەوم لێنەکەیت، پاشان هاتین بەسەر ئەو

كەنیزەكـەی كـە لێیـان دەدا و، پێیـان دەوت: داوێـن پیسـی و دزیـت كـردووە تێپەڕین و منیش وتم: خوایە كوڕەكەم وا لێنەكـەیت (كەچی تۆ بەپێچەوانـەوە) وتت: خوایە وەك ئەوم لێبكـەیت! منداڵەكە وتـی: پیاوەكە كەسێكی تـاوان بـار بوو بۆیە منیش وتم خوایە وەك ئەوم لێنەكەیت، ئافرەتەكەش كە پێیان دەوت: داوێـن پیسـی و دزیت كـردووە، نـەداوێن پیسـی كردبوو، نـەدزی، بۆیـە منیـش وتم: خوایە وەك ئەوم لێبكەیت.

## ( ٣ ) وازهێنـان لە جیهاد لە پێنـاوی دایك و بـاوك

١٦٨٢ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: أَقْبَلَ رَجُلٌ إِلَـى نَبِـيِّ اللَّـهِ (ﷺ)، فَقَالَ: أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ وَالْجِهَادِ، أَبْتَغِي الْأَجْرَ مِنَ اللَّهِ (ﷻ). قَالَ: ((فَهَلْ مِنْ وَالِدَيْكَ أَحَدٌ حَيٌّ)). قَالَ: نَعَمْ، بَلْ كِلَاهُمَا. قَالَ: ((فَتَبْتَغِي الْأَجْرَ مِنَ اللَّهِ ﷻ)). قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ((فَارْجِعْ إِلَى وَالِدَيْكَ فَأَحْسِنْ صُحْبَتَهُمَا)). [بخاري/ الجهاد/ ٢٨٤٢]

(لە (عبدالله) كوڕی (عمرو) كوڕی (عاص) (ﷺ) وتـی:پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، وتی: پەیمانی كۆچ كردن و تێكۆشانت دەدەمێ و، مەبەستیشم پاداشتـی پـەروەردگارە، پێغەمبـەر فـەرمووی: ((ئایـا دایـك و بـاوكت كەسـیان زینـدووە؟)) وتـی:بـەڵێ بـەڵكو هـەردووكیان زینـدوون، فـەرمووی: ((پاداشـتت دەوێ لای پەروەردگار؟)) وتـی بەڵێ، فەرمووی: ((كەواتە بگەڕێرەوە بۆلای باوك و دایكت و چاك خزمەتیان بكە و، بەباشی هەڵوسكەوتیان لەگەڵدا بكە)).

## ( ٤ ) خوای گەورە ئـازاردانی دایكانی قەدەغە كردووە

١٦٨٣ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّـهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ اللَّـهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَمَنْعًا وَهَاتِ، وَكَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ)). [بخاري/ الاستقراض/ ٢٢٧٧]

(مغيرة) كوڕی (شعبه) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبــەر (ﷺ) فـەرمووی: ((بەڕاسـتی خوای گـەورە قەدەغـەی كـردووە لـە ئێـوە: ئـازاردانی دایكـان و سـپڵەیی و بـێ ئەمەكی لەگەڵیاندا. هەروەها زیندەبەچاڵ كردنی كچان و ئەنجام نەدانی ئـەركی سەرشـان و وەرگرتنـی شـت بەناهـەق، خـوای گـەورە سـێ شتیشـی پێناخۆشـە، قسە هێنان و بردن و، زۆر پرسیار كردن و، ماڵ بەفیڕۆدان)).

## ( ٥ ) خزمەت کردنی دایك و باوك هۆی چوونە بەهەشتە

١٦٨٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((رَغِمَ أَنْفُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُ)). قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: ((مَنْ أَدْرَكَ أَبَوَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ: أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا، فَلَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ)).

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵــێ: پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموویــەتی: ((سەرشــۆڕبێت، پاشان سەرشۆڕبێت، پاشان سەرشۆڕبێت، پاشان سەرشۆڕبێت)) عەرزیان کرد: کێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: ((کەسێك گەشتبێت بە باوك و دایکی یان بە یەکێکیان لە کاتی پیریدا و پاشان نەچووبێتە بەهەشتەوە)). [واتە چاك نەبوبێت لەگەڵیاندا]

## ( ٦ ) چاکە کردن لەگەڵ دۆست و خۆشەویستی باوك دا

١٦٨٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ كَانَ لَهُ حِمَارٌ يَتَرَوَّحُ عَلَيْهِ إِذَا مَلَّ رُكُوبَ الرَّاحِلَةِ، وَعِمَامَةٌ يَشُدُّ بِهَا رَأْسَهُ، فَبَيْنَا هُوَ يَوْمًا عَلَى ذَلِكَ الْحِمَارِ إِذْ مَرَّ بِهِ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: أَلَسْتَ ابْنَ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ؟ قَالَ: بَلَى. فَأَعْطَاهُ الْحِمَارَ وَقَالَ: ارْكَبْ هَذَا، وَالْعِمَامَةَ قَالَ: اشْدُدْ بِهَا رَأْسَكَ. فَقَالَ لَهُ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: غَفَرَ اللهُ لَكَ، أَعْطَيْتَ هَذَا الْأَعْرَابِيَّ حِمَارًا كُنْتَ تَرَوَّحُ عَلَيْهِ، وَعِمَامَةً كُنْتَ تَشُدُّ بِهَا رَأْسَكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةَ الرَّجُلِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ)). وَإِنَّ أَبَاهُ كَانَ صَدِيقًا لِعُمَرَ (ﷺ).

(عبدالله) کوڕی (عمر) (ﷺ) گوێدرێژێکی هەبوو، کاتێك بڕۆشتایە بۆ شاری مەککە و، بێزار بوایـە لەسـواری حوشـتر، ئـەوا سـواری گوێدرێژەکـە دەبـوو، هـەروەها مێزەرێکیشـی هـەبوو دەیبەست بەسـەریەوە. ڕۆژێکیـان بەسەرپشـتی گوێدرێژەکەوە بوو، کابرایەکی دەشتەکی بەلای دا تیپەڕی وپێی وت: تۆ کوڕی فلان کەسی کوڕی فلان کەس نیت؟ (عبدالله)ش وتی: بەڵێ، {(بەم پرسیارەدا) عبدالله بۆی دەرکەوت کە ئەم پیاوە یەکێکە لە دۆستەکانی باوکی}، پاشـان عبدالله، گوێدرێژەکە و مێزەرەکەی پێبەخشی، هـەتا گوێدرێژەکە بەکاربهێنێت بۆ سواری و، مێزەرەکـەش ببەستێت بەسـەریەوە. هـەندێ لـە هـاوەڵانی عبـدالله پێیان وت: خوا لێت خۆش بێت! تۆ گوێدرێژێکت هەبوو، کە سـواری دەبوویـت و، مێزەرێکیشـت هـەبوو، دەت بەسـت بەسـەرتەوە، هـەردووکیانت بەخشـی؟ عبــدالله وتــی بەڕاســتی مــن بیســومە لــە پێغەمبــەرەوە (ﷺ) دەیفــەرموو:

((لەچاکترینی چاکەکان دۆستایەتی و ڕێزگرتن و بەخشینی مرۆڤە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە دۆستی باوکی بوون، پاش ئەوەی کە باوکی لە دونیا دەرچوو)) بەڕاستی باوکی ئەم پیاوەش هاوڕێی عمر(ی باوکم) (ﷺ) بوو.

## (٧) چاکە کردن لەگەڵ کچاندا

١٦٨٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ وَمَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا، فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا. فَأَخَذَتْهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ وَابْنَتَاهَا، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (ﷺ) فَ حَدَّثْتُهُ حَدِيثَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ، فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ، كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٣٥٠]

(عائشة) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆلام و دوو کچی لەگەڵدا بوو، داوای یارمەتی لێکردم، منیش هیچم لا نەبوو، تەنها یەك دەنك خورما نەبێت، دەنکە خورماکەم دایە و ئەویش کردی بە دوولەتەوە، دابەشی کرد لە نێوان هەردوو کچەکەیدا و، خۆی هیچی لێنەخوارد، پاشان هەستاو لەگەڵ دوو کچەکەیدا ڕۆشتە دەرەوە. کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە، ئەم بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر کەسێك خوا تاقی بکاتەوە کچی پێببەخشێت، ئەویش بە چاکیی ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، ئەوە ئەو کچانە دەبنە بەربەست بۆی لە ئاگری دوزەخ)).

١٦٨٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ)) وَضَمَّ أَصَابِعَهُ.

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەسێك دوو کچ بەخێو بکات، هەتا پێدەگەن ئەوا کە ڕۆژی قیامەت دێت من و ئەو ئاواین)). لەم کاتەدا پەنجەکانی جوت کرد بەیەکەوە.

## (٨) پەیوەندی خزمایەتی تەمەن درێژ دەکات

١٦٨٨ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ أَوْ يُنْسَأَ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ)). [بخاري/ البيوع/ ١٩٦١]

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((هەرکەسێك پێی خۆش بێت کە ڕزق و ڕۆزی زیادبکات و تەمەنی درێژبێت و شوێنەواری چاکی بمێنێ ئەوا با سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنێ)).

## ( ٩ ) پاراستنی پەیوەندی خزمایەتی

١٦٨٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي قَرَابَةً أَصِلُهُمْ وَيَقْطَعُونِي، وَأُحْسِنُ إِلَيْهِمْ وَيُسِيئُونَ إِلَيَّ، وَأَحْلُمُ عَنْهُمْ وَيَجْهَلُونَ عَلَيَّ. فَقَالَ: ((لَئِنْ كُنْتَ كَمَا قُلْتَ فَكَأَنَّمَا تُسِفُّهُمُ الْمَلَّ، وَلَا يَزَالُ مَعَكَ مِنَ اللَّهِ ظَهِيرٌ عَلَيْهِمْ مَا دُمْتَ عَلَى ذَلِكَ)).

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی من خزمم هەیە و، سەردانیان دەکەم و ئەوان پێیان لێبڕیووم، چاکەیان لەگەڵدا دەکەم، ئەوان خراپەم لەگەڵ دەکەن، من ئارامم لەگەڵیاندا و ئەوان نەفامیم لەگەڵ دەکەن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر تۆ ئاوابی، وەك خۆت دەیڵێیت، ئەوا خۆڵەمێشی گەرمیان دەرخوارد دەدەیت، بەردەوامیش پشتیوانی خوات لەگەڵە لە دژی ئەوان، هەتا لەسەر ئەم حاڵە بمێنی)).

## ( ١٠ ) پەیوەندی خزمایەتی و ئاسەواری بچڕاندنی

١٦٩٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الْخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُمْ قَامَتِ الرَّحِمُ فَقَالَتْ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَذَاكِ لَكِ)). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ. أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ. أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾ [محمد: ٢٢-٢٤]. [بخاري/ الأدب/ ٥٦٤١]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەڕاستی خوای باڵا دەست هەموو دروستکراوەکانی دروست کرد، هەتا کاتێك کە لێبوویەوە، هەستاو، وتی: ئەی خوایە؛ ئەمە پەناگای کەسێکە کە پەنادەگرێت لە پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، خوا فەرمووی بەڵێ، ئایا ڕازی نابیت بەوەی هەر کەس تۆ بەسەربکاتەوە منیش دەیگەیێنم بەڕەحمەتی خۆم، ئەوەش تۆ دابـبڕێت، ئەوا

منیش دای دەبڕم لە ڕەحمەتی خۆم؟ سیلەی ڕەحم وتی: بەڵێ، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿دەی بڕیار بێت ئەوە بۆ تۆ بێت﴾. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( ئەگەر حەز دەكەن ئەم ئایەتە بخوێنن [كە ئەمە ماناكەیەتی]: ﴿ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لە غەزادا پشت هەڵبكەن ، یاخود دەسەلاتتان كەوتە دەست، تۆوی ئاژاوە و فەسادو تاوان لە زەویدا بچێنن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیپچڕێنن و لەناوی بەرن؟! ئەو جۆرە كەسانە ئەوانەن كە خوا نەفرینی لێكردوون و كەڕی كردوون و كوێرایی هێناوە بەسەر چاویاندا، ئایا ئەوە بۆچی ئەوانە وردبینی لە قورئاندا ناكەن و گوێی بۆ ناگرن؟ ئایا ئەوەیە دڵەكان لە ئاستی ڕاستیدا قفل دراوە؟))

١٦٩١ـ عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعٌ)). قَالَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: قَالَ سُفْيَانُ: يَعْنِي قَاطِعَ رَحِمٍ. [بخاري/ الأدب/ ٥٦٣٨]

(جوبیر) كوڕی (مطعم) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( ئەو كەسەی كە سیلەی ڕەحم دەبڕێ ناچێتە بەهەشتەوە)).

## ( ١١ ) بەخێوكردنی هەتیوو

١٦٩٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ)). وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى.

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەو كەسەی كە هەتیو بەخێو بكات (كەسی خۆی بێت یان نا) من و ئەو وەكو ئەم دووانە واین)) مالك كە ڕاوی فەرموودەكەیە ئاماژەی بەپەنجەی شایەتومان و ناوەڕاست كرد.

## ( ١٢ ) پاداشتی یارمەتیدانی بێوەژن و هەژاران

١٦٩٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)) وَأَحْسِبُهُ قَالَ: ((وَكَالْقَائِمِ لَا يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لَا يُفْطِرُ)). [بخاري/ النفقات/ ٥٠٣٨]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەو كەسەی كە یارمەتی بێوەژن و هەژار دەدات، وەك ئەو كەسە وایە، كە لەپێناو خوادا جیهاد دەكات)) (ڕاوی فەرموودەكە وتی) وادەزانم فەرموویشی ((هەروەها وەك ئەو كەسە وایە كە بەردەوام خەریكی شەونوێژبێت و بێزارنەبێت لێی، هەروەها وەك ئەو كەسە وایە كە بەردەوام بە ڕۆژوبێت و نەیشكێنێت)).

## ( ١٣ ) ئەو كەسانەی كە یەكتریان خۆش دەوێت

١٦٩٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلَالِي؟ الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلِّي)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەڕاسـتی خـوای باڵادەسـت لـە ڕۆژی قیامـەتدا دەفـەرمووێت: كـوان ئەوانـەی كە یـەكتریان لەبـەر خـاتری من خـۆش دەویسـت؟ ئەمڕۆ مـن دەیانخەمـە ژێـر سـێبەری خۆمـەوە، لـە ڕۆژێكدا كە هیچ سێبەرێك نییە، بێجگە سێبەری من))

١٦٩٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): ((أَنَّ رَجُلًا زَارَ أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصَدَ اللَّهُ [لَهُ] عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكًا، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَخًا لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ، قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا؟ قَالَ: لَا، غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ: فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ، بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ)).

(ابو هريرة)(ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە كە: ((پیاوێك چوو بۆ دیدەنی برایەكی، لە دێیەكی تردا، خوای گەورە فریشتەیەكی لەسەر ڕێگاكەیدا بۆ دانا، كاتێك پیاوەكە گەیشتە لای، پێیوت: بۆكوێ دەچیت؟ پیاوەكە وتی: دەمەوێت بچم بۆ لای برایەكم لەم دێیەدا، فریشتەكە وتی: لای ئەو خێرێكت دەست دەكەوێت كەلە پێناویدا سەردانی بكەیت؟ پیاوەكە وتی:نەخێر تەنها ئەوەندەیە كە من لەبەر خاتری خوا ئەوم خۆش دەوێت، فریشتەكە وتی: بەڕاستی من نێردراوی خوای گەورەم بۆ لای تۆ كە بەڕاستی خوا تۆی خۆش دەوێت وەك چۆن تۆ ئەو پیاوەت لەبەر خاتری خوا خۆش دەوێت)).

## ( ١٤ ) مرۆڤ لەگەڵ ئەو كەسەدایە كە خۆشی دەوێت

١٦٩٦ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: ((وَمَا أَعْدَدْتَ لِلسَّاعَةِ)). قَالَ: حُبَّ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، قَالَ: ((فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)). قَالَ أَنَسٌ: فَمَا فَرِحْنَا بَعْدَ الْإِسْلَامِ فَرَحًا أَشَدَّ مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ): ((فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)). قَالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِأَعْمَالِهِمْ. [بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٨٥]

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، قیامەت کەی دێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((چیت بۆ ئامادە کردوە؟)) پیاوەکە وتی: خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((بەڕاستی تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت)) انس دەڵێ: لەدوای موسڵمان بوون، هیچ شتێك ئەوەندە خۆشحاڵی نەکردین، وەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): ((بەڕاستی تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت)) انس دەڵێ: بەڕاستی من خوا و پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەرم خۆش دەوێت و، ئومێدم وایە لەگەڵ ئەواندابم، با کردەوەکانیشم وەك ئەوان نەبێت.

## (١٥) خوا هەر کەسی خۆش بووێت لای بەندەکانیش خۆشەویستی دەکات

١٦٩٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ [(ﷺ)] فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي السَّمَاءِ فَيَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، قَالَ: ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ. وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ (ﷺ)، فَيَقُولُ: إِنِّي أُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضْهُ، قَالَ: فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضُوهُ، قَالَ: فَيُبْغِضُونَهُ، ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الْأَرْضِ)).
[بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٣٧]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەڕاستی خوای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆش ویست، ئەوا بانگی جوبرەئیل (ﷺ) دەکات و، پێی دەفەرموێت: بەڕاستی من فلانەکەسم خۆش دەوێت، دەی تۆش خۆشت بوێت. دەفەرموێت: ئیتر جوبرەئیلیش خۆشی دەوێت، پاشان لەئاسماندا جاڕدەدات و دەڵێ: بەڕاستی خوای گەورە فلانەکەسی خۆش دەوێت، دەی ئێوەش خۆشتان بوێت، ئیتر ئەوەی لە ئاسماندایە خۆشی دەوێت. دوای ئەوە لە زەویدا پەسەند دەکرێت)).

ئەگەر خوای گەورە ڕقی لەبەندەیەك بوو، ئەوا جبریل (ﷺ) بانگ دەکات و پێی دەفەرمووێت: بەڕاستی من ڕقم لە فلانە کەسە، دەی تۆش ڕقت لێی بێت، ئیتر جبریل (ﷺ) ڕقی لێی دەبێتەوە، پاشان لە ئاسماندا جاڕ دەدات و دەڵێ: بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لە فلانەکەسە، دەی ئێوەش ڕقتان لێی بێت

ئەوانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە، دوای ئەوە ڕق و خۆش نەویستنی لە زەوی دا بۆ دادەنرێت)).

## (١٦) ڕۆحەكان سەربازی ڕاهێنراون

١٦٩٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) -يَرْفَعُهُ- قَالَ: ((النَّاسُ مَعَادِنُ كَمَعَادِنِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ، خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا. وَالْأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٢١٥٨]

(ابو هریرة) (ﷺ) دەڵێ: خەڵكی كانزان، وەكو كانزای زیڕ و زیو وان، ئەوانەیان كەلە نەفامیدا چاك بوون، لە ئیسلامیشدا چاكن ئەگەر تێبگەن و دەركیان هەبێت. ڕۆحەكانیش سەربازی ڕاهێنراون، ئەوانەیان یەكتری ناناسن لەیەك دوور دەكەونەوە. ئەوانەی هاوڕەوشت و هاوبیرن پێكەوە دەگونجێن، ئەوانەشیان سروشت و بیروباوەڕیان بەیەك ناخوات، لەیەكتر دوور دەكەونەوە و جیاواز دەبن)).

## (١٧) موسڵمان بۆ موسڵمان وەك بیناوایە

١٦٩٩ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا)). [بخاري/ المساجد/ ٤٦٧]

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((موسڵمان بۆ موسڵمان وەك بینا وایە، هەندێكی هەندێكی تر بەیەكەوە دەبەستێت)).[(واتە: هەمووی تێهاڵكێشە بەیەكەوە)].

## (١٨) ئیمانداران یەك جەستەن لە سۆز و خۆشەویستیدا

١٧٠٠ـ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى)). [بخاري/ الأدب/ ٥٦٦٥]

(نعمان) كوڕی (بشیر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((نموونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی بۆ یەكتر و، هاوسۆزی و بەزەیی یەكدا وەكو یەك جەستەوان، ئەگەر ئەندامێكی ئازارێكی هەبوو ئەوا دەناڵێنێ لە تاو بێخەوی و گەرمە تا)).

## (١٩) موسڵمان برای موسڵمانه، ئەستەمی لێدەکات نه پشتی بەردەدات

١٧٠١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَلَا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، وَلَا يَحْقِرُهُ، التَّقْوَى هَاهُنَا)) وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ((بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ)). [بخاري/ النكاح/ ٤٨٤٩]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((حەسوودیی بەیەکتر مەبەن، زەم بەسەریەکتردا مەکەن {بەمەبەستی بەرز کردنەوی نرخی شتەکان}، ڕقتان لەیەکتر نەبێتەوە، پشت لەیەکتر مەکەن، مامەڵە بەسەر مامەڵەی یەکتردا مەکەن بەندەیەکی ڕاست و دروستی خوابن و، وەك برابن، موسڵمان برای موسڵمانه، ستەمی لێناکات و، پشتی بەرنادات و، بەسووك سەیری ناکات، لەخوا ترسان لێرەدایە)) پێغەمبەر (ﷺ) سیٚ جارئاماژەی کرد بۆ سنگی ((بەسە بۆ خراپ بوونی مرۆڤێك، کە بەسووك سەیری برا موسڵمانەکەی بکات، هەموو شتێکی موسڵمان لەسەر موسڵمان حەرام و قەدەغەیە؛ خوێنی و ماڵی و ناموسی))

١٧٠٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەڕاستیدا خوای گەورە تەماشای ڕوخسار و سامانتان ناکات بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەکانتان دکات))

## (٢٠) پۆشینی کەموکوڕی

١٧٠٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَسْتُرُ اللَّهُ عَلَى عَبْدٍ فِي الدُّنْيَا إِلَّا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر بەندەیەك خوا لەدنیادا گوناهەکەی بۆ بپۆشێت لە قیامەتیشدا بۆی دەپۆشێت)).

ـــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَسْتُرُ عَبْدٌ عَبْدًا فِي الدُّنْيَا إِلَّا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

(ابو هريرة) دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: ((هەر بەندەیەك کەم و کوڕی بەندەیەکیتر داپۆشێت لە دنیادا ئەوا خوای گەورە لە قیامەتدا کەموکوڕیەکانی دادەپۆشێت)).

## (٢١) تکای دانیشتوان

١٧٠٤ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَتَاهُ طَالِبُ حَاجَةٍ أَقْبَلَ عَلَى جُلَسَائِهِ فَقَالَ: ((اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا، وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا أَحَبَّ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٣٦٥]

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: هەرکاتێك خاوەن پێویستیەك بهاتایەتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی دەکردە دانیشتوانی دەوری و دەیفەرموو: ((تکای بۆ بکەن بۆئەوەی پاداشتتان دەستکەوێت، با خوای گەورەش ئەوەی پێی خۆشە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ئەنجامی بدات)).

## (٢٢) وێنەی هاونشینی چاك

١٧٠٥ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ: فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً. وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً)). [بخاري/ الذبائح والصيد/ ٥٢١٤]

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((نموونەی هاونشینی چاك و هاونشینی خراپ وەك هەڵگری میسك و کوورە دەمێن وایە، هەڵگری میسك، یا بەشت دەدات، یا لێی دەکڕیت، یا بۆنێکی خۆش دێت بەسەرتا، کورەدەمێنیش یا جلەکانت دەسوتێنێت، یا بۆنێکی ناخۆش دێت بەسەرتا)).

## (٢٣) ئامۆژگاری بەچاکە لەگەڵ دراوسێدا

١٧٠٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَيُوَرِّثُنَّهُ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٦٦٨]

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: ((بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم دەربارەی چاکە لەگەڵ دراوسێدا، هەتا وام دەزانی دراوسێ میرات لە دراوسێ دەبات)).

## (٢٤) هاوکاری دراوسێ بە چاکە

١٧٠٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: إِنَّ خَلِيلِي (ﷺ) أَوْصَانِي: ((إِذَا طَبَخْتَ مَرَقًا فَأَكْثِرْ مَاءَهُ، ثُمَّ انْظُرْ أَهْلَ بَيْتٍ مِنْ جِيرَانِكَ، فَأَصِبْهُمْ مِنْهَا بِمَعْرُوفٍ)).

(ابو ذر) (رضي الله عنه) دەڵێ: خۆشەویستم پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری کردووم: ((هەر کاتێك شۆربایەکت لێنا ئاوی زۆری تێبکە. پاشان ورد بەرەوە لە ماڵەکانی دراوسێت، بەشیان بنێرە بەچاکە))

١٧٠٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ)).

(ابو ذر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێی وتم: ((هیچ چاکەیەك بە سووك مەزانە، باهەر ئەوەش بێ کە بەڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی لە براکەت بکەیت)).

## (٢٥) لەبارەی نەرم و نیانیەوە

١٧٠٩- عَنْ جَرِيرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الْخَيْرَ)).

(جریر) (رضي الله عنه) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: ((ئەو کەسەی بێبەش کرا بێت لە نەرمونیانی بێبەش کراوە لەهەموو چاکەیەك)).

١٧١٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) -زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)- عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الرِّفْقَ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ)).

(عائشة) (رضي الله عنها) هاوسەری پێغەمبەر دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەڕاستی نەرم و نیانی لەهەر شتێکدا هەبێت جوانی دەکات، لەهەرشتێکیش هەڵبگیرێت ناشرینی دەکات))

## (٢٦) خوای گەورە نەرم و نیانی خۆش دەوێت

١٧١١- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ وَمَا لَا يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٦٧٨]

(عائشة) (رضي الله عنها) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەی عائشة، بەڕاستی خوا نەرم و نیانە و نەرم ونیانیشی خۆش دەوێت،

ئەوەی لە نەرم ونیـانیدا دەیبەخشـێت، لـە توندڕەویـدا نایبەخشـێت لـە هیـچ بارودۆخێکی تریشدا نایبەخشێت)).

## ( ٢٧ ) سزای خۆبە زل زان

١٧١٢ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ [الْخُدْرِيِّ] وَأَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْعِزُّ إِزَارُهُ، وَالْكِبْرِيَاءُ رِدَاؤُهُ، فَمَنْ يُنَازِعُنِي عَذَّبْتُهُ)).

(ابوسعيد الخدری) و (ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((بەرزیی‌و بڵندیی وەك پۆشاكە بۆ خوا، خۆ بەگەورە گرتنیش وەك عەبایە بۆی هەرکەس ململانێم لەگەڵ بکات سزای دەدەم)) [واتـە ئـەو دوو سیفەتە تـایبەتن بە خوای گەورە]

١٧١٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ -قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ- وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((سێ تاقم هەن خوای گـەورە گفتوگۆیـان لەگـەڵدا ناکـات و، پاکیـان ناکاتـەوە -ابـو معاويـە دەڵـێ: سەیریشـیان ناکـات و سـزایەکی سـەختیان دەدات: پـیرێکی شـەرواڵ پیـس، پاشایەکی درۆزن، هەژارێکی خۆبەزل زان)).

## ( ٢٨ ) سوێندخواردن بە ناوی خواوە

١٧١٤ـ عَنْ جُنْدَبٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) حَدَّثَ: ((أَنَّ رَجُلًا قَالَ: وَاللَّهِ لَا يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلَانٍ، وَإِنَّ اللَّهَ قَالَ: مَنْ ذَا الَّذِي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَنْ لَا أَغْفِرَ لِفُلَانٍ، فَإِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِفُلَانٍ، وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ)) أَوْ كَمَا قَالَ.

(جندب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((پیاوێك وتـی: سوێند بەخوا خـوای گەورە لە فڵانەکەس خۆش نابێت، خـوای گـەورەش فـەرمووی: ((ئەوە کێیەبەناوی منەوە سوێند دەخوات کەلە فڵانە کەس خۆش نابم، ئەوامن لەو فڵانەکەسە خۆش بووم و، کردەوەکانی تۆم پوچەڵ کردەوە)).

## ( ٢٩ ) خۆگونجاندن لەگەڵ پیاو خراپاندا

١٧١٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: ((ائْذَنُوا لَهُ، فَلَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ. أَوْ: بِئْسَ رَجُلُ الْعَشِيرَةِ)). فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ أَلَانَ لَهُ الْقَوْلَ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ لَهُ الَّذِي قُلْتَ ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ. قَالَ:

((يَا عَائِشَةُ، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ وَدَعَهُ -أَوْ: تَرَكَهُ- النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ)).

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد، ئەویش فەرمووی: ((مۆڵەتیبدەن، خراپترین كوڕی هۆزە، یان خراپترین پیاوی هۆزە))، كاتێك هاتە خزمەتی، بە نەرم و نیانی قسەی لەگەڵ كرد. عائشة دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەر، {پێش ئەوەی بێتە ژوورەوە} ئەوەت پێوت كە فەرمووت، كەچی دوایی بەنەرم و نیانی لەگەڵی دوایت. فەرمووی: ((ئەی عائشە، بەڕاستی خراپترین ئاكام لای خوا لە ڕۆژی دواییدا، بۆ ئەو كەسانەیە، كە خەڵكی وازی لێدێنن بۆ خۆپاراستن لە خراپەی)).

## (٣٠) باسی لێبووردن

١٧١٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلَّا عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ)).

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەخشین هیچ كاتێك سەرمایە كەم ناكاتەوە، هەر بەندەیەك لێبوردنێك بنوێنێ خوا زیاتر سەر بەرزی دەكات، هەروەها هەر كەسێكیش لەبەر خوا ملكەچی بنوێنێت خوا بەرزی دەكاتەوە)).

## (٣١) خۆگرتن لەكاتی تووڕەبووندا

١٧١٧ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا تَعُدُّونَ الرَّقُوبَ فِيكُمْ)). قَالَ: قُلْنَا: الَّذِي لَا يُولَدُ لَهُ. قَالَ: ((لَيْسَ ذَاكَ بِالرَّقُوبِ، وَلَكِنَّهُ الرَّجُلُ الَّذِي لَمْ يُقَدِّمْ مِنْ وَلَدِهِ شَيْئًا)). قَالَ: ((فَمَا تَعُدُّونَ الصُّرَعَةَ فِيكُمْ)). قَالَ: قُلْنَا: الَّذِي لَا يَصْرَعُهُ الرِّجَالُ. قَالَ: ((لَيْسَ بِذَلِكَ، وَلَكِنَّهُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ)).

(عبدالله) كوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لێقەوماو و غەمبار كێیە لە نێو ئێوەدا؟)) ئێمەش وتمان: ئەوەیە كە منداڵی نابێت. فەرمووی: ((ئەوە لێقەوماو و غەمبار نییە، بەڵكو ئەو پیاوەیە كە منداڵی پێش خۆ نەخستبێت)) {واتە لە كاتی ژیانیدا منداڵی نەمردبێت، هەتا ببێتە پارێزەری لە ئاگری دۆزەخ} {پاشان} فەرمووی: ((ئەی پاڵەوان كێیە لەناو ئێوەدا؟)) ئێمەش وتمان: پاڵەوان ئەو كەسەیە كە كەس ناتوانێت بیدات

بەزەویدا. فەرمووی: ((پاڵەوان ئەوە نییە، بەڵکو ئەوەیە لەکاتی توڕەییدا خۆی بگرێت)).

## ( ٣٢ ) پەناگرتن بەخوا لەکاتی تووڕەییدا

١٧١٨ـ عَنْ سُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ (ﷺ) قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَجَعَلَ أَحَدُهُمَا يَغْضَبُ وَيَحْمَرُّ وَجْهُهُ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: ((إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ ذَا عَنْهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)). فَقَامَ إِلَى الرَّجُلِ رَجُلٌ مِمَّنْ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: أَتَدْرِي مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) آنِفًا؟ قَالَ: ((إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ ذَا عَنْهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)). فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: أَمَجْنُونًا تَرَانِي؟ [بخاري/ الأدب/ ٥٧٦٤]

(سلمان کوڕی صرد) (ﷺ) دەڵێ: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) جنێویان بەیەکتردا، یەکێکیان زۆر توڕە دەبۆوە و دەم و چاوی سوور هەڵدەگەڕا، پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کابرای کرد و فەرمووی: ((من وشەیەك دەزانم، ئەگەر ئەم پیاوە بیڵێت ئەوا ئەو حاڵەتەی لادەچێت: اعوذ بالله من الشیطان الرجیم.. پیاوێك لەوانەی گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو، هەستا و چوو بۆلای کابرا و وتی: ئەزانی پێغەمبەر (ﷺ) پێش تۆزێك چی فەرموو؟ فەرمووی: ((من وشەیەك دەزانم ئەگەر ئەم پیاوە بیوتایە ئەوا ئەو حاڵەتەی لەسەر لادەچوو؛ أعوذ بالله من الشیطان الرجیم.. کەچی کابرا وتی: بەشێتم دەزانیت؟

## ( ٣٣ ) مرۆڤ وا دروست کراوە کە خۆنەگرە

١٧١٩ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَمَّا صَوَّرَ اللَّهُ آدَمَ فِي الْجَنَّةِ تَرَكَهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَتْرُكَهُ، فَجَعَلَ إِبْلِيسُ يُطِيفُ بِهِ، يَنْظُرُ مَا هُوَ، فَلَمَّا رَآهُ أَجْوَفَ عَرَفَ أَنَّهُ خُلِقَ خَلْقًا لَا يَتَمَالَكُ)).

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێك خوای گەورە دیمەنی ئادەمی کێشا لەبەهەشتا، وازی لێهێنا ئەوەندەی کە خوا ویستی وازی لێبێنێت، ئیبلیس بەدەوریدا دەگەڕا و سەیری دەکرد هەتا بزانێت چییە؟ کاتێك بینی کە ناوسکی بۆشە ـزانی بەشێوەیەك دروست کراوە کە خۆی ناگرێت))

## (٣٤) باسی چاكە و تاوان

١٧٢٠ـ عَنْ نَوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ (ﷺ) قَالَ: أَقَمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِالْمَدِينَةِ سَنَةً، مَا يَمْنَعُنِي مِنَ الْهِجْرَةِ إِلَّا الْمَسْأَلَةُ، كَانَ أَحَدُنَا إِذَا هَاجَرَ لَمْ يَسْأَلْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ شَيْءٍ، قَالَ: فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْبِرِّ وَالْإِثْمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالْإِثْمُ: مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ)).

(نواس) كوڕی (سمعان) (ﷺ) دەڵێ: یەك ساڵ لای پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە مامەوە، تەنها لەبەر پرسیار كردن كۆچم نەكرد، ئەگەر یەكێك لە ئێمە كۆچی بكردایە هیچ پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) نەدەكرد، من پرسیارم لێكرد دەربارەی چاكە و تاوان؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((چاكە بریتیە لە ڕەوشت جوانی، تاوان و گوناهیش ئەوەیە كە بەدڵتا دێت و پێت ناخۆشە خەڵكی پێی بزانێت)).

## (٣٥) لابردنی بەردو داری سەرەڕێ

١٧٢١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَرَّ رَجُلٌ بِغُصْنِ شَجَرَةٍ عَلَى ظَهْرِ طَرِيقٍ، فَقَالَ: وَاللَّهِ لَأُنَحِّيَنَّ هَذَا عَنِ الْمُسْلِمِينَ لَا يُؤْذِيهِمْ، فَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ)). [بخاري/ الجماعة و الإمامة/ ٦٢٤]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((پیاوێك تێپەڕی بەلای چڵە دارێكدا كە چەقی ڕێگاكەی گرتبوو وتی: سوێند بەخوا دەبێت ئەو چڵەدارە لاببەم هەتا ئازاری موسڵمانان نەدات، بەوە خرایە بەهەشتەوە)).

١٧٢٢ـ عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (ﷺ) قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، عَلِّمْنِي شَيْئًا أَنْتَفِعُ بِهِ. قَالَ: ((اعْزِلِ الْأَذَى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ)).

(أبو برزة)(ﷺ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێكم فێر بكە هەتا منیش سوودی لێوەربگرم. فەرمووی: ((ئەوەی ئازاری موسڵمانان دەدات لەسەرە ڕێگادا لای ببە)).

## (٣٦) ئەوەی توشی موسڵمان دەبێت لە درك و نارەحەتی

١٧٢٣ـ عَنِ الْأَسْوَدِ قَالَ: دَخَلَ شَبَابٌ مِنْ قُرَيْشٍ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ)، وَهِيَ بِمِنًى، وَهُمْ يَضْحَكُونَ، فَقَالَتْ: مَا يُضْحِكُكُمْ؟ قَالُوا: فُلَانٌ خَرَّ عَلَى طُنُبِ فُسْطَاطٍ، فَكَادَتْ عُنُقُهُ -أَوْ عَيْنُهُ- أَنْ تَذْهَبَ. فَقَالَتْ: لَا تَضْحَكُوا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ

(ﷺ) قَالَ: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً فَمَا فَوْقَهَا إِلَّا كُتِبَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ)). [بخاري/ المرضى/ ٥٣١٨]

(اسـود) دەڵـێ: چـەند گـەنجێکی قورەیشـی هـاتن بـۆ لای عائشـە (ﷺ) لـە کاتێکدا کە لە (مینا) بوو، پێدەکەنین. عائشـە وتـی: بەچی پێدەکەنن؟ وتیـان: فلانـە کـەس کـەوت بەسـەر پـەتی چادرێکدا و، خـەریك بـوو ملـی -یـان چـاوی- لەدەسـت بـدات. عائشـة وتـی: پێمەکـەنن، مـن بیسـتومە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) فەرموویـەتی: ((هیچ موسڵمانێك نیە کە دڕکێك بچێت بە لەشـیا یـا لـەدڕکێك زیاتر، ئەوە بەو کارە پلەیەکی بۆ دەنووسرێت و تاوانێکی لەسەرهەڵدەگیرێت)).

## ( ٣٧ ) ئەو شتانەی تووشی موسڵمان دەبێت لە ئازار و خەم

١٧٢٤ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنْ وَصَبٍ، وَلَا نَصَبٍ، وَلَا سَقَمٍ، وَلَا حَزَنٍ، حَتَّى الْهَمِّ يُهَمُّهُ إِلَّا كُفِّرَ بِهِ مِنْ سَيِّئَاتِهِ)). [بخاري/ المرضى/ ٥٣١٨]

(ابو سعید الخدري) و(ابو هریـرة) (ﷺ) دەڵێـن: بیستومانە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر شتێك تووشی موسڵمان دەبێت لە ئازاری بەردەوام، هــەروەها لــە مــاندووبوون و، نەخۆشــی و خەفــەت و غــەمباریی، هــەتا پەژارەیـەکیش کـە دڵـی دادەگرێـت، هـەموو ئەوانـە دەبـن بەمایـەی سـڕینەوەی گوناهەکان)).

١٧٢٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ﴾ [النسـاء: ١٢٣]. بَلَغَتْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مَبْلَغًا شَدِيدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، فَفِي كُلِّ مَا يُصَابُ بِهِ الْمُسْلِمُ كَفَّارَةٌ، حَتَّى النَّكْبَةِ يُنْكَبُهَا أَوِ الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا)).

(ابـو هریـرة) (ﷺ) دەڵـێ: کاتێك ئـەم ئایەتـە دابەزی کـە ئەمـە ماناکەیـەتی: ﴿هـەر کـەس خراپەیـەك بکـات سزای دەدرێت﴾. زۆر کاری کـردە موسـڵمانان و ترساندنی، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((میانەڕەو و کاردروست بن هەرچی ئەو شـتانەی توشـی موسڵمان دەبێت کەفارەتـە بـۆی هـەر ناخۆشـیەکیش کـە تووشی دەبێت، یان دڕکێك کە دەچێت بە گیانیدا)).

## (٣٨) حەسوودی و ڕق و كینە و پشت لەیەكتر كردن

١٧٢٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٧١٨]

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویوتی: ((ڕق لەیەكتری هەڵمەگرن، ئیرەیی (حەسودی) بەیەكتری مەبەن، پشت لەیەكتر مەكەن، بەندەی خوا و برابن، ڕەوانیە بۆ موسڵمان زیاد لە سێ ڕۆژ واز لە براكەی بهێنێت و قسەی لەگەڵ نەكات)).

## (٣٩) چاكترینتان دەست پێشخەرە لەسەلامدا

١٧٢٧- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ، فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٧٢٧]

(أبو أيوب الأنصاري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ڕەوانییە بۆ موسڵمان كە واز لە براكەی بهێنێت لەسەرو سێ ڕۆژەوە كە بەیەك دەگەن ئەم ڕوودەكات بەولاوە ئەویش ڕوودەكات بەولاوە، چاكترینیان ئەو كەسەیانە كە دەست پێشخەری دەكات بەسلاو)).

## (٤٠) دوژمنایەتی و قسە لەگەڵ یەك نەكردن

١٧٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا، إِلَّا رَجُلًا كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا، أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا، [أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا])).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((دەرگاكانی بەهەشت ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە دەكرێنەوە و خوای گەورە لە هەموو ئەو بەندانە خۆش دەبێت كە هیچ شەریكی بۆ بڕیارنادەن، جگە لە پیاوێك نەبێت كەلەنێوان ئەو وبراكەیدا ناكۆكیەك هەبێت، دەڵێن: ئەم دووانە بهێڵنەوە هەتا ئاشت دەبنەوە، ئەم دووانە بهێڵنەوە هەتا ئاشت دەبنەوە، ئەم دوانە بهێڵنەوە هەتا ئاشت دەبنەوە)).

## (٤١) بەرگری کردن لەسیخوڕی و ململانێ و گومانی خراپ

١٧٢٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلَا تَحَسَّسُوا وَلَا تَجَسَّسُوا، وَلَا تَنَافَسُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا)). [بخاري/ الأدب/ ٥٧١٧]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خۆتان بپارێزن لە گومانی خراپ، بەڕاستی بەدگومانی زوربەی درۆیە، بە دوای هەواڵی خەڵكدا مەڕۆن، سیخوڕی بەسەر یەكترەوە مەكەن و، ململانێی یەكتر مەكەن، ئیرەیی بەیەكتر مەبەن و، ڕقتان لەیەكتر نەبێت، پشت لەیەكتر مەكەن و، بەندەی ڕاستەقینەی خواو برای یەكتربن)).

## (٤٢) هەوڵدانی شەیتان بۆ ناكۆكی خستنە نێوان نوێژكەران

١٧٣٠ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ : سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: (( بەڕاستی شەیتان نائومێد بووە كە نوێژكەران لە دوورگەی عەرەبیدا بیپەرستن،بەڵام هەوڵ دەدات هانیان بدات دژی یەكتر)).

## (٤٣) هەموو مرۆڤێك شەیتانی لەگەڵدایە

١٧٣١ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا لَيْلًا، قَالَتْ: فَغِرْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ فَرَأَى مَا أَصْنَعُ، فَقَالَ: ((مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ أَغِرْتِ)). فَقُلْتُ: وَمَا لِي لَا يَغَارُ مِثْلِي عَلَى مِثْلِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَقَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ)). قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَوْ مَعِيَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قُلْتُ: وَمَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قُلْتُ: وَمَعَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((نَعَمْ، وَلَكِنْ رَبِّي أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ)).

(عائشة) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) شەوێك كەلەماڵی عائشەدا بوو چووە دەرێ، عائشە دەڵێ: خانە گومان بووم لێی ئەویش (ﷺ) هات و بینی من چی دەكەم، فەرمووی: ((عائشە چیتە، خانە گومان بوویت لێم؟ وتم: كەسێكی وەك من چۆن خانە گومان نابێت لەكەسێكی وەك تۆ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا شەیتانەكەت هاتووە بۆ لات؟)) وتم:ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا شەیتانم لەگەڵدایە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ)) وتم: هەموو مرۆڤێك

شەیتانی لەگەڵدایە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتم: شەیتانیش لەگەڵ تۆدا هەیە ئەی پێغەمبـەری خـوا؟ فـەرمووی: ((بـەڵێ، بـەڵام خـوا یارمـەتی منـی داوە و شەیتانەکەم موسڵمان بووە))

## (٤٤) رێگری لە غەیبەت

١٧٣٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ)). قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: ((ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ)). قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: ((إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ)).

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئایا دەزانن غەیبەت چی‌یە؟)) وتیـان: خـوا و پێغەمبەرەکـەی زانـاترن . پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((باس کردنی براکەتە بەوەی کە پێی ناخۆش بێت)). وترا: ئەگەر ئەو شتەی کە من دەیڵێم لەبراکەمدا هەبوو؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگە ئەو شتەی تیا بوو ئەوا غەیبەتت کردووە، ئەگەر تیایانەبوو ئەوا بوختانت بۆ کردووە)).

## (٤٥) دەربارەی دوو زمانی

١٧٣٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: إِنَّ مُحَمَّدًا (ﷺ) قَالَ: ((أَلَا أُنَبِّئُكُمْ مَا الْعَضْهُ؟ هِيَ النَّمِيمَةُ الْقَالَةُ بَيْنَ النَّاسِ)). وَإِنَّ مُحَمَّدًا (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الرَّجُلَ يَصْدُقُ حَتَّى يُكْتَبَ صِدِّيقًا، وَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ كَذَّابًا)).

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ئایـا ئاگادارتان بکەم کە بوختان کردن چی‌یە؟ بوختان کردن قسە هێنان و بردنـە لـە نێـوان خـەڵکیدا)) بەڕاسـتی پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بەڕاسـتی پیـاو بەردەوام ڕاسـت دەکـات هـەتا بەڕاستگۆ دەنووسرێت، هـەروەها بـەردەوام درۆ دەکات هەتا بە درۆزن دەنووسرێت)).

## (٤٦) قسەهێنەر و قسەبەر ناچنە بەهەشتەوە

١٧٣٤ـ عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ حُذَيْفَةَ (ﷺ) فِي الْمَسْجِدِ، فَجَاءَ رَجُلٌ حَتَّى جَلَسَ إِلَيْنَا، فَقِيلَ لِحُذَيْفَةَ: إِنَّ هَذَا يَرْفَعُ إِلَى السُّلْطَانِ أَشْيَاءَ. فَقَالَ حُذَيْفَةُ –إِرَادَةَ أَنْ يُسْمِعَهُ–: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ)). [بخاري/ الأدب/ ٥٧٠٩]

(هُمام) كوڕی (حارث)دەڵێ: لەگەڵ (حذيفة) (ﷺ) لە مزگەوتدا دانیشتبووین پیاوێك هاتەلامان و دانیشت. بە (حذيفة)یان وت ئەم پیاوە قسەدەبات بۆ كاربەدەستان. (حذيفة) وتی: -بەشێوەیەك كە كابرا گوێی لێبێت- بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: ((قسە هێنەر و قسە بەرناچنە بەهەشتەوە)).

## ( ٤٧ ) باسی دوو ڕوو

فيه حديث أبي هريرة (ﷺ)، وقد تقدم في أواخر الفضائل.

فەرموودەی (أبو هريرة)ی تیایە كە لە كۆتایی بابی الفضائل دا باسكرا.

## ( ٤٨ ) باسی ڕاستی و درۆ

١٧٣٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا)). [بخاري/ الأدب/ ٥٧٤٣]

(عبدالله) كوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((پێویستە لەسەرتان ڕاستگۆ بن، بەڕاستی ڕاستگۆیی مرۆڤ ڕێنمونی دەكات بۆ چاكە، چاكەش ڕێنمویی دەكات بۆ بەهەشت، بەردەوام پیاو هەیە ڕاست دەكات و بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت، هەتا لای خوا بەڕاستگۆ تۆمار دەكرێ، خۆتان بپارێزن لە درۆ بەڕاستی درۆ مرۆڤ بەرەو كاری خراپە دەبات، كاری خراپەش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات، بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەكات و بەدوای درۆدا دەڕوات هەتا لای خوا بە درۆزن لە قەڵەم دەدرێت)).

## ( ٤٩ ) درۆ لە چیدا دروستە

١٧٣٦ـ عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ (ﷺ) -وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ اللَّاتِي بَايَعْنَ النَّبِيَّ (ﷺ)- أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) [وَهُوَ] يَقُولُ: ((لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، وَيَقُولُ خَيْرًا وَيَنْمِي خَيْرًا)). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَلَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِي شَيْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ كَذِبٌ إِلَّا فِي ثَلَاثٍ: الحرب، الإصلاح بين الناس، و حديث الرجل امرأته و حديث المرأة زوجها. وفي رواية قالت: : وَلَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِي شَيْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ إِلَّا فِي ثَلَاثٍ. [بخاري/ الصلح/ ٢٥٤٦]

(أم كلثوم) كچـی (عقبـة)ی كوڕی (أبـي معیـط) (ﷺ) — ئـەم ئافرەتـە یـەكێك بووە لەو ئافرەتانەی كەلە سەرەتادا كۆچیان كردووە و، پەیمانیان بە پێغەمبـەر (ﷺ) داوە —دەڵـێ: بیستومە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) دەیفـەرموو: ((درۆزن نـیـیـە ئەوەی كە ئاشتەوایی دەخاتە نێوان خەڵكی‌یەوە و، قەسەی چاك دەكات، یـان قسەی چاك دێنێت و دەبات. (إبن شهاب) دەڵێ: نەمبیستووە ڕێگەی دابێت بە درۆ لەسێ شوێندا نەبێت: {كاتی} جەنگ، ئاشتەوایی لـە نێـوان خـەڵكی دا، كاتێك پیاو قسە لەگەڵ هاوسەریدا بكات یـان ئـافرەت قسـە لەگەڵ مێردەكەیدا بكات {بەمەبەستی پیشاندانی خۆشەویستی بۆ یـەكتری و دروست نـەبوونی كێشە}.

## (٥٠) ڕێگری لە بانگەوازی نەفامی

١٧٣٧ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: يَا لَلْأَنْصَارِ. وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا بَالُ دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ)). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ. فَقَالَ: ((دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ)). فَسَمِعَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَقَالَ: قَدْ فَعَلُوهَا؟ وَاللَّهِ: لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ. قَالَ عُمَرُ: دَعْنِي أَضْرِبُ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. فَقَالَ: ((دَعْهُ، لَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ)) [انظـر الحديـث: ١٨٣٢]. [بخاري/ المناقب/ ٣٣٣٠]

(جابر) (ﷺ) دەڵـێ: لەغەزایـەكدا لەگەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) بووین پیاوێك لـە كۆچبـەرەكان شەقێكی لە پشتیوانێك هەڵدا كابرای پشتیوان هـاواری كـرد لـە پشتیوانیەكان، كۆچبەرەكـەش هـاواری بـرد بـۆ كۆچبـەرەكان، ئینجـا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە بۆ بانگەوازی نەفامی دەگەڕێنەوە ناوتان؟)) وتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێكی كۆچبەر شەقێكی هەڵدا لە پیاوێكی پشتیوان. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((واز لەم ڕەفتارە بهێنن بەڕاستـی بۆگەنـە)) (عبـدالله) كـوڕی (أبـی) گوێـی لێبـوو وتـی: بەڕاستـی كـاری خۆیـان كـرد؟ سـوێند بـەخوا: ئەگـەر گەڕاینــەوەبۆ شـاری مەدینـە، دەسـەڵات دار و ناودارەكانمـان زەلیـل و هەژارو نەدارەكان دەردەكەن. عمر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) وازم لێ بێنە با بدەم لـە گەردنی‌ئەم دوو ڕووە. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((وازی لێبێنـە هـەتا

خەڵكی نەڵێن محمد هاوەڵەكانی خۆی دەكوژێت)).. سەیری فەرموودەی ١٨٣٢ بكە.

## ( ٥١ ) رێگری لە جوێن دان

١٧٣٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الْمُسْتَبَّانِ: مَا قَالَا فَعَلَى الْبَادِئِ، مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەو دوانەی جوێن بەیەكتری دەدەن {تاوانەكە} لەسەر ئەوەیانە كە دەستپێشخەرە، ئەگەر ستەم لێكراوەكە زیادە ڕەوی نەكات)).

## ( ٥٢ ) رێگری لە جوێندان بە زەمانە

١٧٣٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَقُولُ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَلَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنِّي أَنَا الدَّهْرُ، أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا)). [بخاري/ التفسير/ ٤٥٤٩]

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((خـوای گـەورە دەفەرموێت: ئـادەمیزاد ئازارم دەدات و دەڵێ: داخ لەدەست زەمانـە بـا هیـچ كەسێك لـە ئێـوە وانـەڵێت ، بەڕاسـتی مـن بەدیهێنـەری زەمانـەم مـن شـەو و ڕۆژەكەی بەدوای یەكدا دێنم، ئەگەر بمەوێت نایان هێڵم)).

## ( ٥٣ ) رێگری لە راكێشانی چەك لە رووی براكەیدا

١٧٤٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَال: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((لَا يُشِيرُ أَحَدُكُمْ إِلَى أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَحَدُكُمْ لَعلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ، فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ)). [بخاري/ الفتن/ ٦٦٦١]

(ابو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((باهیچ كەسێك لـە ئێوە چەك لە ڕووی براكەیدا ڕانەكێشێت، چونكە نازانێت، لەوانەیە شەیتان لە دەستی وەربگرێت و بەهۆی ئەوەوە بكەوێتە چاڵێكی دۆزەخەوە)).

## ( ٥٤ ) گرتنی سەری رم لە مزگەوتدا

١٧٤١ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِي مَجْلِسٍ أَوْ سُوقٍ وَبِيَدِهِ نَبْلٌ فَلْيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا، ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا، ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا)). قَالَ: فَقَالَ أَبُو مُوسَى: وَاللَّهِ مَا مُتْنَا حَتَّى سَدَّدْنَاهَا بَعْضُنَا فِي وُجُوهِ بَعْضٍ. [بخاري/ الفتن/ ٦٦٦٤]

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێك لە ئێوە تێپەڕی بەناو کۆڕێکدا یان بەبازاڕێکدا، تیری بەدەستەوە بوو، ئەوا باسەری تیرەکانی بگرێت، دیسانەوە با سەری تیرەکانی بگرێت)). ابو موسى دەڵێ: سوێند بەخوا نەمردین هەتا ڕووی تیرمان نەکردە یەکتری.

## ( ٥٥ ) ڕێگری لە لێدانی دەم و چاو

١٧٤٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلَا يَلْطِمَنَّ الْوَجْهَ)). [بخاري/ العتق/ ٢٤٢٠]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێك لە ئێوە شەری کرد لەگەڵ براکەیدا، با دەست لەدەم و چاوی نەوەشێنێت و لێی نەدات)).

## ( ٥٦ ) چاك نىيە پياو نەفرەت كەربێت

١٧٤٣ـ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (ﷺ): سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ اللَّعَّانِينَ لَا يَكُونُونَ شُهَدَاءَ وَلَا شُفَعَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

(ابو الدرداء) (ﷺ) دەڵێ: بیستوومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: ((بەڕاستی ئەوانەی کە نەفرەت کارن، نابنە شایەت و تکاکار لە ڕۆژی دواییدا)).

١٧٤٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ عَلَى الْمُشْرِكِينَ. قَالَ: ((إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّانًا، وَإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً)).

(ابوهريرة) (ﷺ) دەڵێ: بە پێغەمبەر (ﷺ) وترا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، نزا بکە لەسەر بێ بڕواکان. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((بەڕاستی من بە نەفرینکار نەنێردراوم، بەڵکو بە ڕەحمەت و میهرەبانی نێردراوم)).

## ( ٥٧ ) توندڕەوەکان لەناو چوون

١٧٤٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ)). قَالَهَا ثَلَاثًا.

(عبدالله) کوڕی (مسعود)(ﷺ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((توندڕەوەکان لەناو چوون)).

## ( ٥٨ ) دۆعا کردنی پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆ ئیمانداران دەبێتە سۆز و بەزەیی بۆیان

١٧٤٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلَانِ، فَكَلَّمَاهُ بِشَيْءٍ لَا أَدْرِي مَا هُوَ؟ فَأَغْضَبَاهُ، فَلَعَنَهُمَا وَسَبَّهُمَا، فَلَمَّا خَرَجَا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَصَابَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئًا مَا أَصَابَهُ هَذَانِ. قَالَ: ((وَمَا ذَاكِ)). قَالَتْ: قُلْتُ: لَعَنْتَهُمَا وَسَبَبْتَهُمَا. قَالَ: ((أَوَ مَا عَلِمْتِ مَا شَارَطْتُ عَلَيْهِ رَبِّي؟ قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، فَأَيُّ الْمُسْلِمِينَ لَعَنْتُهُ أَوْ سَبَبْتُهُ فَاجْعَلْهُ لَهُ زَكَاةً وَأَجْرًا)).

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: دوو پیاو هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) قسەیەکیان لەگەڵدا کرد، نازانم چیبوو؟ تورە بوو، ئەویش نەفرینی لێکردن و جوێنی دانێ، کاتێك چونە دەرەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر کەسێك تووشی خێرێ بووبێت، ئەمانە هیچیان دەست نەکەوت فەرمووی: ((بۆچی؟)) عائشە وتی: وتم تۆ نەفرینت لێکردن، جوێنت پێدان. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا نازانیت من مەرجێکم لەسەر خوای خۆم داناوە؟ کەوتوومە: خوایە! من مرۆڤم هەر موسڵمانێك من نەفرینم لێکرد و جوێنم دایە تۆ بیکە بە هۆی پاداشت و پاککردنەوەی ئەو)).

١٧٤٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَتْ عِنْدَ أُمِّ سُلَيْمٍ (رضي الله عنها) يَتِيمَةٌ، وَهِيَ أُمُّ أَنَسٍ، فَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْيَتِيمَةَ، فَقَالَ: ((آنْتِ هِيَهْ؟ لَقَدْ كَبِرْتِ لَا كَبِرَ سِنُّكِ)). فَرَجَعَتِ الْيَتِيمَةُ إِلَى أُمِّ سُلَيْمٍ تَبْكِي، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: مَا لَكِ يَا بُنَيَّةُ؟ قَالَتِ الْجَارِيَةُ: دَعَا عَلَيَّ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ لَا يَكْبَرَ سِنِّي، فَالْآنَ لَا يَكْبَرُ سِنِّي أَبَدًا، أَوْ قَالَتْ: قَرْنِي. فَخَرَجَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ مُسْتَعْجِلَةً تَلُوثُ خِمَارَهَا حَتَّى لَقِيَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا لَكِ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ)). فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَدَعَوْتَ عَلَى يَتِيمَتِي؟ قَالَ: ((وَمَا ذَاكِ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ)). قَالَتْ: زَعَمَتْ أَنَّكَ دَعَوْتَ أَنْ لَا يَكْبَرَ سِنُّهَا، وَلَا يَكْبَرَ قَرْنُهَا. قَالَ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ قَالَ: ((يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، أَمَا تَعْلَمِينَ أَنَّ شَرْطِي عَلَى رَبِّي؟ أَنِّي اشْتَرَطْتُ عَلَى رَبِّي فَقُلْتُ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَرْضَى كَمَا يَرْضَى الْبَشَرُ، وَأَغْضَبُ كَمَا يَغْضَبُ الْبَشَرُ، فَأَيُّمَا أَحَدٍ دَعَوْتُ عَلَيْهِ مِنْ أُمَّتِي بِدَعْوَةٍ -لَيْسَ لَهَا بِأَهْلٍ- أَنْ يَجْعَلَهَا لَهُ طَهُورًا وَزَكَاةً، وَقُرْبَةً يُقَرِّبُهُ بِهَا مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵـێ: كچێكـی هـەتيوو لای (أم سليم) (ﷺ) بـوو ئـەويش دايكـی (انـس) بـوو، پێغەمبـەر (ﷺ) چـاوی بـەم كچـە هـەتيوە كـەوت فەرمووی: ((ئەوە تۆيت؟! بەڕاستی گەورە بوويت، پیرنەگەيت!)) كچە هەتيوەكە بەگريانەوە گەڕايەوە بۆ لای أم سليم، أم سليم وتـی: كچـم چيتـە؟ كچەكـە وتـی: پێغەمبەر (ﷺ) دۆعای لێكردووم كە گەورە نەبم، ئيتر قەت گەورە نابم، يان وتی تەمـەنم گـەورە نـابێت، أم سليم بەپەلـە چووە دەرەوە و لەچكەكەی دابەسـەريدا هەتا گەيشت بە پێغەمبەر (ﷺ) پاشان پێغەمبـەر (ﷺ) پێـی فـەرموو: ((أم سليم چيتـە)) ئـەويش وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئايـا دۆعـات لـەو كچـە هـەتيوە كردووە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((دۆعاكە چييە؟)). أم سليم وتی: وا دەزانیّ كە تۆ دۆعات لێكردووە گەورە نەبێت يـان تەمـەنی گـەورە نـەبێت. پێغەمبـەر زەردەخەنە گرتی پاشان فەرمووی: أم سليم ئەی تۆ مەرجەكەی من لەسـەر خـوا نازانيت؟ من بەڕاستی مەرجم كردووە لەگەڵ خـوای خۆمـدا و وتومـە: بەڕاسـتی من مرۆڤم ڕازی دەبم وەك خەڵكی ڕازی دەبن، و تورە دەبم وەك ئەوان تورە دەبن هەركەسێك من دۆعام لێكرد لە ئۆمەتی من بە دۆعايەك -كەشايەنی نەبێت- ئەوە بۆی بكە بە پاككردنەوەی گوناهی و لێی خۆش ببـە و بيكـە بەهۆی نزيك خستنەوەی ئەو لەخۆتەوە لە دواڕۆژدا)).

١٧٤٨ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ أَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَتَوَارَيْتُ خَلْفَ بَابٍ، قَالَ: فَجَاءَ فَحَطَأَنِي حَطْأَةً، وَقَالَ: ((اذْهَبْ وَادْعُ لِي مُعَاوِيَةَ)). قَالَ: فَجِئْتُ فَقُلْتُ: هُوَ يَأْكُلُ. قَالَ: ثُمَّ قَالَ لِيَ: ((اذْهَبْ فَادْعُ لِي مُعَاوِيَةَ)). قَالَ: فَجِئْتُ فَقُلْتُ: هُوَ يَأْكُلُ. فَقَالَ: ((لَا أَشْبَعَ اللَّهُ بَطْنَهُ)). قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: قُلْتُ لِأُمَيَّةَ: مَا (حَطَأَنِي)؟ قَالَ: قَفَدَنِي قَفْدَةً.

(ابـن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: لەگـەڵ مندالاّنـدا يـاريم دەكـرد، پێغەمبـەر (ﷺ) تەشـريفی هـات منيش خۆمم شاردەوە لـە پشـت دەرگايەكـەوە، پێغەمبـەر (ﷺ) دەستی ماڵی بە پشت ملمدا و فەرمووی: ((بـڕۆ معاويـەم بـۆ بـانگ بكـە)) وتـی: منيش چووم وتم: نان دەخوات پاشان فەرمووی: ((بـڕۆ بـۆم بـانگ بكـە)) وتـی: منيش چومەوە وتم: نان دەخوات. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((خـوا سكی تێر نەكات)).

# (٥٥) بەشی ستەم

## (١) حەرام کردنی ستەم و فرمان بەداوای لێخۆشبوون و تەوبەکردن

١٧٤٩ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) -فِيمَا رَوَى عَنِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى- أَنَّهُ قَالَ: ((يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلَا تَظَالَمُوا يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلَّا مَنْ هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ. يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلَّا مَنْ أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ. يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ عَارٍ إِلَّا مَنْ كَسَوْتُهُ، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ. يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ. يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي. يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ [منكم] مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلَّا كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ. يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ (ﷻ)، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نفسه)).

لە (ابو ذر)ەوە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا لە خوای پەروەردگارەوە کە فەرموویەتی: ((ئەی بەندەکانم! من ستەمم لەسەرخۆم حەرام کردووە و، لە نێوان ئێوەشدا حەرامم کردووە، ستەم لەیەکتر مەکەن، ئەی بەندەکانم! هەمووتان گومڕان مەگەر ئەوانەتان نەبێت کەمن ڕێنموییم کردوون، داوای ڕێنموییم لێبکەن، ڕێنموییتان دەکەم. ئەی بەندەکانم! هەمووتان برسین مەگەر ئەوانەتان نەبێت کە من خواردنم پێداون، داوای خواردنم لێبکەن، خۆراکتان دەدەمێ، ئەی بەندەکانم! هەمووتان ڕووتن مەگەر ئەوانەتان نەبێت کە من پۆشتەم کردوون، داوای پۆشاکم لێبکەن پۆشتەتان دەکەم ئەی بەندەکانم! ئێوە شەو ورۆژ هەڵە دەکەن منیش لە هەموو تاوان و هەڵەکانتان خۆش دەبم، داوای لێخۆشبونم لێبکەن ئەی بەندەکانم ئێوە بەڕاستی ناتوانن بگەن بەو ئاستەی کە زەرەر لەمن بدەن، هەروەها ناتوانن بگەن بەو ئاستەی کە سوودم پێببەخشن، ئەی بەندەکانم! ئەگەر سەرەتا و کۆتاییتان بە

مرۆڤ و جنۆكەكانەوە دڵیان وەك دڵی لەخوا ترسترین كەستان بێت، ئەوە هیچ لە موڵكی من زیاد ناكات، ئەی بەندەكانم! ئەگەر كۆتاییتان بە مرۆڤ و جنۆكەتانەوە دڵیان وەك دڵی خراپترین كەستان بێت، ئەوە هیچ لە موڵكی من كەم ناكات. ئەی بەندەكانم! ئەگەر سەرەتا و كۆتایتان بە مرۆڤ و جنۆكەتانەوە تێكڕا لە گۆڕەپانێكدا بوەستن و داوام لێبكەن، هەموو مرۆڤێك ئەوەی كە داوای دەكات پێی ببەخشم، ئەوە هیچ لەوەی لەلای منە كەم ناكات، مەگەر ئەوەندەی دەرزییەك لە ئاوی دەریا كەمی دەكاتەوە. ئەی بەندەكانم! بەڕاستی ئەمە كردەوەكانی خۆتانە و من بۆتانی دەژمێرم و تۆماری دەكەم و پاشان پاداشتان دەدەمەوە. هەركەسێك چاكەی دەست كەوت باسوپاسی خوای گەورە بكات و هەركەسیش شتێكی تریشی دەست كەوت، ئەوە با تەنها سەرزەنشتی خۆی بكات)) سەعید دەڵێ: (ابو ادریس الخولانی) ئەگەر ئەم فەرموودەیەی بگێڕایەتەوە بەچۆكەوە دادەنیشت.

١٧٥٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَاتَّقُوا الشُّحَّ، فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ)).

(جابری) كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خۆتان لەستەم بپارێزن، بەڕاستی ستەم تاریكاییە لە ڕۆژی قیامەتدا، خۆتان لە ڕژدی و چروكی بپارێزن، بەڕاستی ڕژدی و چروكی خەڵكانی پێش ئێوەی لەناو بردووە، وای لێكردووە كە خوێنی یەكتر بڕێژن و، حەرامی یەكتر حەلاڵ بكەن)).

١٧٥١- عَنْ ابن عمر (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ، مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). [بخاري/ المظالم/ ٢٣١٠]

لە (ابن عمر)ەوە (ﷺ) كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لێناكات و، وازی لێناهێنێت كەستەمی لێبكرێت، ئەوەی پێویستی براكەی جێبەجێ بكات، خوای گەورە پێویستییەكانی جێبەجێ دەكات. هەر كەسێكیش یارمەتی موسڵمانێك بدات و ناڕەحەتیەكی بۆ سوك

بكات، ئەوە خـوای گـەورە نارەحەتیـەك لـە نارەحەتیەكانی ڕۆژی دوایـی لەسـەر سووك دەكات. هەر كەسێك كەم و كوڕی موسڵمانێك بشارێتەوە و دەری نەخات ئەوە خوای گەورە كەم و كوڕیەكانی لە ڕۆژی دواییدا دەشارێتەوە)).

## (٢) مۆڵەتدانی ستەمكار

١٧٥٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُمْلِي لِلظَّالِمِ، فَإِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ)). ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ [الهود: ١٠٢]. [بخاري/ التفسير/ ٤٤٠٩]

(ابو موسـی) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بەڕاسـتی خـوای گەورە مۆڵەتیستەمكار دەدات، هەركاتێك گرتـی ئیتر بەری نادات. پاشان ئەم ئایەتـەی خوێنـدەوە كـە ئەمـە ماناكەیـەتی: ﴿ئابـەو شـێوەیە تۆڵەسـەندنی پەروەردگاری تۆ كاتێك تۆڵە دەسێنێت لە خەڵكی شار و دێهاتەكان لە حاڵێكدا كـە یـاخی و سـتەم پیشـەبوون، بەڕاسـتی تۆڵەسـەندنەكەی زۆر بـە ئێـش و سەختە﴾. ﴿وكذلك اخذ ربك إذا أخذ القرى و هي ظالمة ان اخذه أليم شديد﴾ هود١٠٢

## (٣) باهەمووكەسێك یارمەتی براكەی بدات جا، ستەمكاربێت یا ستەم لێكراو

١٧٥٣- عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: اقْتَتَلَ غُلَامَانِ: غُلَامٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَغُلَامٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَنَادَى الْمُهَاجِرُ أَوِ الْمُهَاجِرُونَ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. وَنَادَى الْأَنْصَارِيُّ: يَا لَلْأَنْصَارِ. فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((مَا هَذَا؟ دَعْوَى أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ)). قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِلَّا أَنَّ غُلَامَيْنِ اقْتَتَلَا، فَكَسَعَ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ. قَالَ: ((فَلَا بَأْسَ، وَلْيَنْصُرِ الرَّجُلُ أَخَاهُ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا، إِنْ كَانَ ظَالِمًا فَلْيَنْهَهُ فَإِنَّهُ لَهُ نَصْرٌ، وَإِنْ كَانَ مَظْلُومًا فَلْيَنْصُرْهُ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: دوو مێرد منداڵ بووبەشەڕیان، یەكێكیان لە كۆچبەران بوو، ئەوی تریش لە یارمەتیدەران، هەریەكەیان هاواری برد بـۆ كۆمەڵەكـەی خـۆی كـە بچـن بەهانایـەوە پێغەمبـەر (ﷺ) چـوە دەرەوە و فـەرمووی: ((ئـەوە چییە؟ بانگەوازی نەفامیە)). وتیـان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خـوا، بەڵكو دوو مـێرد منـداڵ بـوون شـەڕیان دەكـرد، یـەكێكیان شـەقی لـەوی تریـان هـەڵدا. فـەرمووی: ((قـەیدی نییـە، باهـەموو پیـاوێك یارمـەتی براكـەی بـدات جـا

ستەمكاربێت یا ستەم لێكـراو، ئەگـەر سـتەمكار بـوو بابـەرگری بكـات، ئـەوە یارمەتی‌یە بۆی، ئەگەر ستەم لێكراویش بوو ئەوە یارمەتی بدات)).

## ( ٤ ) ئەوانەی كە ئازاری خەڵكی دەدەن

١٧٥٤ـ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ هِشَامِ بْنِ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (ﷺ) قَالَ: مَرَّ بِالشَّامِ عَلَى أُنَاسٍ وَقَدْ أُقِيمُوا فِي الشَّمْسِ، وَصُبَّ عَلَى رُءُوسِهِمُ الزَّيْتُ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قِيلَ: يُعَذَّبُونَ فِي الْخَرَاجِ. فَقَالَ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ اللَّهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ فِي الدُّنْيَا)).

لە (عروة) كوڕی زبـیر ئـەویش لـە هشـام كـوڕی حكیـم كـوڕی حـزام (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە لەوڵاتی شام دا بەسەر كۆمەڵێكدا تێپەڕی لەبەر خۆر ڕاگیرابوون و، ڕۆن كرابوو بەسەریاندا، وتی: ئەوە چی‌یە؟ وترا: لەبەر ئەوەی خەراج نەدەن ئاوایان لێدەكەن. پاشـان وتـی: بەڕاسـتی مـن بیسـتومە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) دەیفـەرموو: ((بەڕاسـتی خـوای گـەورە تۆڵـە لەوانـە دەسـتێنێت كـە ئـازار و ئەشكەنجەی خەڵكی دەدەن لە دونیادا)).

## ( ٥ ) ئەوانەی كە ستەمیان كردووە، نابێت سەردانی ش وێنەكانیان بكەین مەگەر بەگریانەوە

١٧٥٥ـ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، وَهُوَ يَذْكُرُ الْحِجْرَ مَسَاكِنَ ثَمُودَ، قَالَ: سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: مَرَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى الْحِجْرِ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ إِلَّا أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ، حَذَرًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ)). ثُمَّ زَجَرَ فَأَسْرَعَ حَتَّى خَلَّفَهَا. [بخاري/ الأنبياء/ ٣١٩٨]

لە (ابن شهاب)ەوە لەكاتێكدا كە باسی شوێنی حجری دەكرد كە هەوارگەی ثموود بوو وتی (سالم بن عبدالله) دەڵێ: بەڕاستی عبدالله كوڕی عمر (ﷺ) وتی: كـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) بەسـەر حجردا تێپـەڕین پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((مەچنـە جێگـا و ڕێگـای ئەوانـەی كـە سـتەمیان لـەخۆیان كـردووە مەگـەر بەگریانـەوە نـەبێت)) نـەوەكو ئـەوەی توشـی ئـەوان بـوو توشـی ئێـوەش بێـت. پاشان خۆیشی لە حوشترەكەی ئەدا هەتا بەپەلە ئەوێیان بەجێ‌هێشت.

## ( ٦ ) ئاوهێنان لە بیری سزادراوان

١٧٥٦ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ النَّاسَ نَزَلُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى الْحِجْرِ أَرْضِ ثَمُودَ، فَاسْتَقَوْا مِنْ آبَارِهَا وَعَجَنُوا بِهِ الْعَجِينَ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يُهَرِيقُوا مَا اسْتَقَوْا وَيَعْلِفُوا الْإِبِلَ الْعَجِينَ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْتَقُوا مِنَ الْبِئْرِ الَّتِي كَانَتْ تَرِدُهَا النَّاقَةُ. [بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٠١]

(عبدالله بن عمر) (ﷺ) دەڵێ: بەڕاستی خەڵکی لەگەڵ پێغەمبەردا لە زەوی حجر دابەزین و ئاویان لەبیرەکانی دەرهێنا و هەویریان پێشێلا، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی دا کە ئاوەکان بڕێژن و هەویرەکانیش بدەن بە حوشترەکان هەروەها فرمانی دا کەلەو ئاوە بهێنن کە حوشترەکە دەچێتە سەری.

## ( ٧ ) تۆڵەسەندنەوە و دانەوەی مافەکان لە ڕۆژی دواییدا

١٧٥٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ)). قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لَا دِرْهَمَ لَهُ وَلَا مَتَاعَ. فَقَالَ: ((إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي [مَنْ] يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلَاةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا، وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هَذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا، فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ، فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ)).

لە (أبو هريرة)وە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا دەزانن "مفلس" کێیە؟)) وتیان "مفلس" لەناو ئێمەدا ئەوانەن کە درهەم [پارە] و کەلوپەل نەبێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((بەڕاستی "مفلس" لە ئۆمەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن کە دێت بەنوێژ و ڕۆژ و زەکات، بەڵام لەکاتێکدا کە جوێنی داوە بەو و، تۆمەتی خستووەتە پاڵ ئەو، ماڵی ئەوی خواردووە و، خوێنی ئەوی ڕێژاوە و، لەوی داوە. چاکەچاکەکانی ئەم دەدرێت بەم وبەو، ئەگەر چاکەکانی تەواو بوو پێش ئەوەی قەرزەکانی بداتەوە، ئەوا لە تاوانەکانی ئەوان وەردەگیرێ و فڕێ دەدرێتە سەر ئەم و پاشان فڕی دەدرێتە ناو دۆزەخەوە))

١٧٥٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ)).

لە (أبو هريرة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سوێند بەخوا هەموو مافەکان دەدەنەوە بەخاوەنەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا،هەتا حەقی مەڕی بێشاخ لەمەڕی شاخ دار دەسێنرێتەوە)).

# (٥٦) القدر: بەشی قەزا و قەدەر

## ( ١ ) باسی ئایەتی ﴿انا كل شيء خلقناه بقدر﴾

١٧٥٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْقَدَرِ، فَنَزَلَتْ: ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ. إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ [القمر: ٤٨,٤٩].

لە (أبو هريرە)ەوە (ﷺ) دەڵێ: کۆمەڵێ لە بێباوەڕەکانی قورەیش هاتن و لەگەڵ پێغەمبەردا کردیان بەهەرا و هوریا (مخاصمة) لەسەر قەدەر، پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يوم يسحبون في النار على وجوههم ذوقوا مس سقر. انا كل شيء خلقناه بقدر﴾ القمر ٤٨-٤٩ کە ئەمە ماناکەیەت: ﴿ڕۆژێك دێت کەلەسەر ڕوویان ڕادەکێشرێن لەناوئاگری دۆزەخ دا پێیان دەوترێت دەبچێژن تاڵاوی دۆزەخ. بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاری کراو دروست کردووە﴾.

## ( ٢ ) هەموو شتێك بەقەزا و قەدەرە

١٧٦٠ـ عَنْ طَاوُسٍ أَنَّهُ قَالَ: أَدْرَكْتُ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُونَ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ. قَالَ: وَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ، حَتَّى الْعَجْزِ وَالْكَيْسِ)) أَوِ: ((الْكَيْسِ وَالْعَجْزِ)).

(طاوس) (ﷺ) دەڵێ: بەخزمەت چەند کەس لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووم، دەیانووت: هەموو شتێك بەقەزا و قەدەرە، هەروەها دەڵێ: بیستوومە لە (عبدالله)ی کوڕی (عمر) (ﷺ) دەیوت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەموو شتێك بەقەزا و قەدەرە، تەنانەت کەودەنی و هۆشمەندی و ژیریش یا بەپێچەوانەوە)).

## ( ٣ ) فرمان بەهێز و وازهێنان لەتەمەڵی و نەتوانین

١٧٦١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ. احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلَا تَعْجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلَا تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ)).

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـیٚ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بـڕوا داری بـەهێز چاکترە و خۆشەویست ترە لای خوای گەورە،لـە بـڕواداری لاواز هەمووشیان چاکن، سووربە لەسەر ئەوەی کە سوودت پێدەگەیەنێت داوای یارمەتیش تەنها لە خوای گەورە بکە و، دەستەپاچە مەبە و، ئەگەر شتێکت تووش بوو مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە وادەبوو، بەڵکو بڵێ:ئەمە قەدەری خوایە و ئەوەی ویستی کردی، چونکە: ئەگەر وابوایە "لو" کاری شەیتان دەکاتەوە)).

## ( ٤ ) هەموو کاروبارەکان پێش دروست بوونیان نووسراون

١٧٦٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ)).

لـە (عبـدالله) کـوڕی (عمـر) کـوڕی (عـاص) (ﷺ) دەڵـیٚ: بیسـتومە لـە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: ((خـوای گـەورە پـەنجا هـەزار سـاڵ پێش ئەوەی ئاسمانـەکان و زەوی دروسـت بکـات، هـەموو کاروبـاری دروسـت کراوەکـانی نووسیووە)) فەرمووی: ((هەروەها عەرشی پەروەردگار لەسەر ئاو بوو)).

## ( ٥ ) باسی قەدەر و گفتوگۆی ئادەم و موسی ( ﷺ )

١٧٦٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلَام عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى. قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلَائِكَتَهُ، وَأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِهِ، ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الْأَرْضِ؟ فَقَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلَامِهِ، وَأَعْطَاكَ الْأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَيْءٍ، وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا، فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللَّهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ عَامًا. قَالَ آدَمُ: فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا: ﴿وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى﴾ [طه: ١٢١]. قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلًا كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً)). قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى)). [بخاري/ القدر/ ٦٢٤٠]

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـیٚ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ئـادەم و موسـا کەوتنە گفتوگۆ لـەنێوان خۆیانو لەبەردەم پـەروەردگاریاندا و، ئـادەم زاڵ بـوو بەسەر موسادا موسا وتی: تۆ ئەو ئادەمەیت کە خوا بەدەستی توانای خۆی دروستی کـردووی و، لـەڕۆحی خـۆی فـووی کـرد بـە بـەرتاو کڕنووشـی بـە

فریشتەکان برد بۆت و، لەبەهەشتدا جێگیری کردی و، پاشان بەهۆی هەڵە و تاوانتەوە، خەڵکت دابەزان بۆ سەر زەوی؟ ئادەم وتی: تۆ ئەو موسایەیت کە خوا بە هۆی پەیام و وشەکانی خۆیەوە هەڵیبژاردویت و، ئەلواحی پێ‌بەخشیت کە ڕۆشنکەرەوەی هەموو شتێکی تیایە و، نزیکی کردیتەوە و ڕزگاری کردی. بوونی تەورات چەندە پێش دروست کردنی من بووە؟ موسا وتی: بەچل ساڵ، ئادەم وتی: ئەم ئایەتەی تیابووە ﴿وعصی آدم ربه فغوی﴾ طه ١٢١ موسی وتی: بەڵێ، ئادەم وتی: باشە ئایا سەرزەنشتی من دەکەی لەسەر کردەوەیەك کە پێش چل ساڵ لە دروست بوونم خوای گەورە نووسیویەتی)). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئادەم سەرکەوت بەسەر موسادا)).

## ( ٦ ) باسی قەدەر و یاخی‌بوون و خۆش بەختی

١٧٦٤ـ عَنْ عَلِيّ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ، فَنَكَسَ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: ((مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ، مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلَّا وَقَدْ كَتَبَ اللهُ مَكَانَهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَإِلَّا وَقَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً)). قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلَا نَمْكُثُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ؟ فَقَالَ: ((مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ. فَقَالَ: اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ. أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ ثُمَّ قَرَأَ ( فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٩٦]

(علي) (ﷺ) دەڵێ: لەبەجێهێنانی کاری جەنازەیەك بووین لە (بقیع ی غەرقەدا) پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هێنا و دانیشت و ئێمەش لەچوار دەوری دانیشتین، پێغەمبەر (ﷺ) گۆچانێکی پێبوو، سەری داخست وبە گۆچانەکەی هێڵی دەکێشا لەسەر زەوی‌یەکە و، پاشان فەرمووی: ((هیچ کەسێك لە ئێوە نی‌یە و، هیچ نەفسێکی دروست کراو نی‌یە، مەگەر خوای گەورە شوێنی لە بەهەشت و دۆزەخدا دیاری کردووە و، نوسراوە ئەگەر یاخی بێت یان خۆشبەخت بێت)) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دەکرێت پشت ببەستین بەوەی کە بۆمان نووسراوە و واز لە کاروکردەوە بهێنین؟ پێغەمبەر

(ﷺ) فەرمووی: ((ئەو کەسەی لە دەستەی خۆشبەختان بێت، ئەوا بەرەو کاری خۆشبەختان دەڕوات، ئەوەش دەستەی یاخی بووان بێت، ئەوا بەرەو کاری یاخی بووان دەڕوات و، فەرمووی: ((کار و کردەوە بکەن، هەموو کەس خوا هۆکاری بۆ ئاسان کردووە کە بەرەو ئەو ڕێگایە بڕوات کە خۆی هەڵیبژاردووە، ئەوە لە تاقمی خۆشبەختان بێت ئەوا بەرەو ئەو ئاقارە دەبرێت و وای لێدەکرێ کە کاری چاکە خوازی بکات، تاقمی خراپە کارانیش وایان لێدەکرێ کە کاری خراپەکاریی ئەنجام بدەن. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿فأما من أعطى..﴾ کە ئەمە ماناکەیەتی: ﴿جا ئەوەی {ماڵ و سامان و زانستی} دەبەخشێت و پارێزکار و لەخوا ترسە، بڕوای پتەوی بە پاداشتی چاك و بەنرخی خوایی هەیە، ئەوە ڕێگەی چاکە و چاکەکاری بۆ ئاسان دەکەین و، سەرەنجام دەیخەینە خێر و خۆشییەوە، بەڵام ئەوەی کە ڕەزیل و دەست نوقاو بێت و خۆی بێنیاز بزانێت، بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاکی خوایی و بەدرۆی بزانێت، ئەوە ئێمە ڕێبازی تەنگانە و ناخۆشی بۆ ئاسان دەکەین و سەرەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین﴾.

## ( ٧ ) کۆتایی کردەوەکان

١٧٦٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ. ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((پیاوی وا هەیە ماوەیەکی زۆر کاروکردەوی بەهەشتیی دەکات، پاشان کۆتایی کردەوەکەی بە کردەوەی دۆزەخیی دێت. پیاوی وایش هەیە ماوەیەکی زۆر کاروکردەوەی دۆزەخیی دەکات، پاشان کۆتایی کردەوەکەی بە کردەوەی بەهەشتیی دێت)).

## ( ٨ ) باسی کۆتایی تەمەن و دابەش کردنی ڕزق و ڕۆزی

١٧٦٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ (ﷺ): اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِزَوْجِي رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَبِأَبِي أَبِي سُفْيَانَ، وَبِأَخِي مُعَاوِيَةَ. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّكِ سَأَلْتِ اللَّهَ لِآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَآثَارٍ مَوْطُوءَةٍ، وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لَا يُعَجِّلُ شَيْئًا مِنْهَا قَبْلَ حِلِّهِ، وَلَا يُؤَخِّرُ مِنْهَا شَيْئًا بَعْدَ حِلِّهِ، وَلَوْ سَأَلْتِ اللَّهَ أَنْ

يُعَافِيكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ، لَكَانَ خَيْرًا لَكِ)). قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: الْقِرَدَةُ وَالْخَنَازِيرُ هِيَ مِمَّا مُسِخَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يُهْلِكْ قَوْمًا -أَوْ يُعَذِّبْ قَوْمًا- فَيَجْعَلَ لَهُمْ نَسْلًا، وَإِنَّ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ)).

(عبـدالله) كـوڕی (مسـعود) (ﷺ) دەڵـێ: ام حبيبـة (ﷺ) وتـی: خوايـە! بەهاوسەرم پێغەمبەر (ﷺ) و بەابو سـفيان و بەمعاويـەی بـرام شـادم كـەرەوە. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((تـۆ لـەخوا داوای چـەند ئەجـەل و كۆتايیيـەكت كردووە كە نووسراوە، هەروەها داوای ڕێڕەوی دياری كردنت كردووە و، داوای ڕزق و ڕۆزی ديـاری كـراوت كـردووە، ئەمانـەی كـە تـۆ داوات كـردوون هيچيـان پێش ناكـەون پێش كاتەكـەی خۆی، هـەروەها دواش ناكـەون دوای ئەو كاتـەی بۆی دياری كراوە. ئەگە داوات بكردايە لەخوای گەورە كە لە ئاگری دۆزەخ و ئازاری قەبر بتپارێزێت چاكتر بوو بۆت)) پياوێك وتـی: ئەی پێغەمبـەری خوا؛ ئايا مەيمون و بەرازەكان لەوانەن كە مەسخ كراون و گۆڕاوون؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((خوای گەورە هيچ ميللـەتێكی لـەناو نـەبردووە كـە پـاش خۆيـان وەچەيان هەبێت، مەيمون و بەرازەكان پێش ئەوە بوون)).

## ( ٩ ) سەبارەت بە چارەنووس و بژێوی

١٧٦٧. عَنْ عَبْدُالله بـن مَسْـعُود (ﷺ) قَـالَ : حَدَّثَنَـا رَسُـولُ الله (ﷺ) وَهُـوَ الصَادِقِ المَصْدُوق: ((اِنَّ احَدكُم يُجْمَعُ خَلْقَهُ فِي بَطْنِ امه ارْبَعِينَ يوماً ، ثُمَّ يَكونُ فِي ذَلِكَ عَلَقَةً مثْلَ ذَلِـكَ ، ثُمَّ يَكونَ فِي ذَلِكَ مُضْغَةً مثْلَ ذَلِـكَ ، ثُـمَّ يُرْسَلُ الله عَزَّوَجَلَّ المَلَك فَيُنْفَخُ فِيهِ الروح وَيُؤمَر بَاربَع كَلمَاتٍ : بِكَتْب رِزْقه ، وَاجَله وَعَمله، وَشَقِيٌّ او سَعِيد . فَوَالذيٌ لاَ الَهَ غَيْرَهُ ،اِنَّ احَدكُم لَيعْمَلُ بِعَمَلِ اهْلِ الجَنَّة حَتَى مَا يَكُونُ بِينَهُ وَبِيْنَهَا الاَّ ذرَاع ، فَيَسْـبِقُ عَلَيـهِ الكِتَـاب ، فَيَعْمَـلُ بِعَمَـلِ اهْـلِ النَّـارِ فَيَدْخلَهَا . وَاِنَّ احَدكُمْ لَيعمَل بِعَمَل أهل النَّار ، حَتَى مَـايَكونُ بَيْنَـهُ وَبَيْنَـها الاَّ ذرَاع،فَيَسْبِقُ عَلَيه الكِتَاب ، فَيَعْمَلَ بِعَمَل اهْلِ الجَنَّة فَيدْخلَهَا))

(عبـدالله)ی كـوڕی (مسـعود) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) كەڕاسـتگۆترين ڕاستگۆيە فەرموويەتی: ((هەريەكێ لەئێوە لەماوەی چل ڕۆژدا لەسكی دايكيدا خەلق دەكرێت، لەماوەی چل ڕۆژدا دەبێتـە پارچەيەك گۆشت و خوێـن، پـاش مـاوەی چـل ڕۆژيـش دەبێتـە پارچـە گۆشـتێك ، پـاش ئـەوە خـوای گـەورە

فریشــتەیەك دەنــێرێت ڕۆح دەكــات بەبــەریداو فــەرمانی بــەچوارو شــەش پێدەكرێت: بەنووسینی ڕۆزیـی، درێژیـی ژیانیی (ئەجەل)و كاریی، بەدبەختە یان بەختەوەر، سوێند بەوەی جگە لەو خوایەكیتر نییە، كەسـی واتـان هەیە كاروكردەوەی بەهەشتیی دەكات هەتا لەنێوان ئەو بەهەشتا ئەندازەی گەزێكی دەمێنـێ ، كـەچی نووسـراوەكە پێشـی دەكـەوێتو كـاروكردەوەی دۆزەخیـی دەكاتو دەچێتە دۆزەخ، هەروەها كەسی واشـتان هەیە كاروكرداری دۆزەخیی دەكات ، هـەتا بەئەندازەی گەزێكی دەمێنـێو نووسراوەكە پێشـی دەكـەوێتو كاروكردەوەی بەهەشتیی دەكاتو دەچێتە بەهەشتەوە)).

١٧٦٨. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِأسِيدٍ (ﷺ) ـ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ـ قَالَ : ((يَدْخُلُ المَلَكُ عَلَى النُّطْفَةَ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرِ فِي الرَّحِمِ بِأرْبَعِينَ او خَمسَةٍ وَأرْبَعِينَ لَيْلَةً فَيَقُولُ: يَا رَبِّ اشَقِيٌّ اوْ سَعِيدٌ ؟ فَيُكْتَبَانِ ، فَيَقُولُ : ايُّ رَبِّ اذكَرٌ اوْأنْثَى ؟ فَيَكْتُبَانِ ، وَيُكْتَبُ عَمَلَهُ ، وَاجَلَهُ ، وَرِزْقَهُ ، ثُمَّ تُطْوَى الصُّحُفُ ، فَلاَ يَزَاد فِيهَا وَلاَ يُنْقَصْ)).

(حذیفــە)ی كــوڕی (اســید) دەیگەیەنێتــە پێغەمبــەر(ﷺ) كەفەرموویــەتی: ((فریشتەكە دەچێتە لای تۆوەكە پاش ئەوەی دوای چل ڕۆژ یـاچو پێنـج ڕۆژ لـەرەحمدا جێگـیر دەبێـت، دەڵێـت: ئـەی پـەروەردگار ئایـا بەدبەختــە یــان بەختەوەرە؟ دەنووسرێت دەڵێ: ئەی پەروەردگار: نێرە یا مێ؟ دەنووسـرێتو كردەوەكــانی دەنووســرێت ، شــوێنەوارەكانی ئەجــەلی ، ڕۆزیــی ، پاشــان دەفتەردادەخرێت ، نەلێی زیاد دەكرێتو نەلێی كەمدەكرێت)).

١٧٦٩ ـ عَنْ عَامِرِ بنُ وَائِلَة حَدَّثَهُ: انَّهُ سَمِعَ عَبْدُالله بنُ مَسْعُودٍ (ﷺ) يَقُولُ: الشَقِيُّ مَنْ شَقِيَّ فِي بَطْنِ أمه ، وَالسَعِيدُ مَنْ وُعِظَ بِغَيرِه. فَاتَى رَجُلاً مِنْ اصْحَابِ رَسُولِ الله (ﷺ) يُقَالُ لَهُ حُذَيْفَة بنُ اسِيدِ الغَفَارِيِّ فَحَدَّثَهُ بِذَلِكَ مِنْ قَولِ ابْنِ مَسْعُودٍ ، فَقَالَ: وَكَيْفَ يَشْقِي رَجُلٌ بِغَيرِ عَمَلٍ ؟ فَقَالَ لَهُ الرَّجُل: اتَعْجَبُ مِنْ ذَلك ؟ فَأنِي سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: ((اذَا مَرَّ بِالنُطْفَة ثِنْتَان وَارْبَعُونَ لَيْلَةً ، بَعَثَ اللهُ الَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَهَا وَخَلَقَ سَمْعَهَا وبَصرَهَا وَجِلْدَهَا وَلَحْمَهَا وَعِظَامَهَا ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ اذكَرٌ امْ أُنْثى ؟ فَيَقْضِي رَبُكَ مَاشَاءَ وَيَكْتُبُ المَلَك. ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ اجلُهُ ؟ فَيَقُولُ رَبُّكَ مَاشَاءَ وَيُكْتَبُ المَلَكُ ، ثُمَّ يَقُولُ : يَا رَبِّ رِزْقَهُ ؟ فَيَقْضِي رَبُكَمَا شَاءَ وَيَكْتُبُ المَلَكُ ، ثُمَّ يُخْرَجُ المَلَكُ بِالصَحِيفَةِ فِي يَدِهِ فَلاَ يَزِيدُ عَلَى امْرٍ وَلاَ

يَنْقُـصُ)) وَزَادَ فِـي رِوَايَـةٍ: ((اسَـوِيٌّ اوْغَـيْرَ سَـوِيّ ؟ فَيَجْعَلَـهُ اللهُ سَـوِيّاً او غَـيْرَ سَوِيٍّ)).

(عامر)ی کوڕی (وائله) دەڵێ: لـە(عبـدالله)ی کـوڕی (مسعود)(ﷺ) بیسـتووە دەیـوت: بەدبەخت ئەوەیـە لەسـکی دایکیـدا بەدبـەخت دەبێـت، بەختـەوەریش ئەوەیە کەئامۆژگاری لەخەڵکیتر وەردەگرێت، یەکێ لەهاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) کەپێیان دەوت (حذیفه)ی کوڕی (اسید الغفاری) قسەکەی (ابن مسعود)ی بۆ گێڕایەوە ، وتی: چۆن پیاوێك بەبێکردار بەدبەخت دەبێت؟ پیاوەکە پێی وت: ئایـا سـەرت لـەوە سـوڕدەمێنێ؟ مـن لەپێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیسـتووە دەیفـەرموو: ((ئەگـەر چل و دوو ڕۆژ بەسـەر تۆوەکـەدا تێپـەڕی خـوای گـەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت، وێنەی دەکێشێت گوێ و چاوو پێسـت و گۆشـت و ئێسقانی بۆ دروست دەکات، پاشان وتی: ئەی پەروەردگار نێر یا مێ؟ خوای گەورەش چی بوێت بڕیاری دەداو فریشتەکە دەینووسێت، پاشان دەڵێ: ئەی پەوەردگار ئەجەلەکەی؟ پەروەردگارت چـی بوێـت دەیفـەرمووێت و فریشـتەکە دەینووسێت. پاشان دەڵێ: ئەی پـەروەردگار ڕۆزیەکـەی؟ پـەروەردگارت چـی بووێت دەیفـەرمووێت و فریشتەکە دەینووسێت، پاشـان فریشـتەکە لاپەڕەکـەی بەدەستەوەیە دەچێتە دەرەوە نەلێی کەمدەکات و نەلێی زیاد دەکات)).

## ( ١٠ )سەبارەت بە چۆنیەتی دروستکردنی بوون و دروستکردنی هاوکات لەگەڵ بەدبەختی و خۆشحاڵی

١٧٧٠ . عَنْ عَبْدُاللهَ بـنُ عَمْـروٌ بـنُ العَـاصِ (ﷺ): انَّـهُ سَـمِعَ رَسُـولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((انَّ قلُوُبَ بَنِي ادَمَ كُلَّهَا بَيْنَ اصْبَعَيْنِ مِن اصَابِعِ الرَحْمَن كَقَلْبٍ وَاحِدٍ ، يُصَرِفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ ))ثُـمَّ قَـالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) :: (اللهُمَّ مُصَرِفَ القُلُوبِ صَرِّف قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ )).

(عبدالله) کوڕی (عمرو) لەپێغەمبـەری خوای بیسـتووە فەرموویـەتی: ((دڵـی ئەوەی ئادەم هەمووی لەنێوان دووپەنجە لەپەنجەکانی خوای میهرەباندایە وەکو یـەك دڵ ، چۆنـی بـوێ وایلێدەکـات) پاشـان پێغەمبـەر (ص) فـەرمووی: ((ئـەی خوای بێگێڕی دڵەکان دڵمان بگێڕە بۆ گوێڕایەڵی و پەرستنی تۆ)).

## ( ١١ )لەسەر نەوەی ئادەم پشکی زینا تۆمارکراوە

١٧٧١ـ عَن ابِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) انَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : ((مَا مِنْ مَولُودٍ الاّ وَيُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ ، فَأبَوَاهُ يُهَوِدَانَهُ وَيُنَصِرَانِهِ وَيُمَجِسَانِه ، كَمَا تُنْتَجِ البَهِيمَة بَهِيمَةً جَمْعَاءَ ، هَلْ تُحسُوُنَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ)).ثُمَّ يَقُولُ ابُو هُرَيْرَةَ: وَاقرَؤُوا انْ شِئْتُم: ﴿فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾

(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر منداڵێك کەلەدایك دەبێت لەسەر فیترەو سروشتی پاك لـەدایك دەبێت، پاشان دایكوباوكی یا دەیكەن بەجوولەكە یان مەسیحی یان مەجوس، هەروەكو ئاژەڵێك بەجكەیەكی تێرو تەواوی دەبێت..

پاشان (ابو هريره) دەڵێت: ئەگەر دەتانەوێت ئەم ئایەتە بخوێنن، كەئەمە ماناكەیەتی ﴿ ئەو فیترەتەپاكەی خوا خەڵكی لەسەر دروست كردووە، دروستكراوەكانی خوا ناگۆڕێت هەر ئەوەیە ئایینی تەواو، بەڵام زۆربەی خەڵكی نایزانن).

## ( ١٢ )پەروەردگار دڵان وەردەچەرخێنێ بەویستی خۆی

١٧٧٢ ـ عَنْ ابْنِ عَبَاسٍ (ﷺ) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ الله (ﷺ) عَنْ اطْفَال المُشْرِكِين؟ قَالَ :((اللهُ اعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِين اذْ خَلَقَهُم)).

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پرسیاركرا لەپێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی منداڵی موشریكەكانەوە ، فەرمووی: ((خوا خۆی دەزانێ چیان كردووە ئەو خۆی دروستی كردوون)).

# (٥٧) باسی عیلم و زانیاری

## ( ١ ) هەلگرتنی عیلم و زانیاری و دەرکەوتنی نەزانین

١٧٧٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لَا يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي سَمِعَهُ مِنْهُ: ((إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَا، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَذْهَبَ الرِّجَالُ وَتَبْقَى النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمٌ وَاحِدٌ)). [بخاري/ العلم/ ٨١]

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: ئایا فەرموودەیەکتان بۆ باس نەکەم کەلە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە و کەس دوای من بۆتان باس ناکات کەلەوی بیستبێت. ((بەڕاستی لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەت ئەوەیە: علم و زانیاری بەرزدەبێتەوەو، نەزانین دەردەکەوێت، زینا و شەرواڵ پیسی بڵاودەبێتەوە، عەرەق دەخورێتەوە پیاوان دەڕۆن و ژنان دەمێننەوە، هەتاوای لێدێت پەنجا ژن یەك سەپەرشتکاریان دەبێت)).

## ( ٢ ) نەمانی عیلم

١٧٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ، وَيُقْبَضُ الْعِلْمُ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، وَيُلْقَى الشُّحُّ، وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ)). قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: ((الْقَتْلُ)). [بخاري/ الفتن/ ٦٦٥٢]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((زەمان نزیك دەبێتەوە و عیلم وزانیاری هەڵدەگیرێ، فتنە و ئاشوب دەردەکەوێت، بەخیلی و ڕژدی بڵاودەکات، هەرج زۆر دەبێت)) وترا هەرج چییە؟. فەرمووی: ((کوشتن)).

## ( ٣ ) نەمانی علم بەهۆی نەمانی زاناکان

١٧٧٥- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَتْرُكْ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا)).

(عبدالله) کوڕی (عمر) کوڕی (عاص) (ﷺ) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: ((بەڕاستی خوای گەورە علم و زانیاری لەخەڵکی

وەرناگرێتەوە بەوەرگرتنەوە، بەڵکو علم و زانیاری وەردەگرێتەوە بەوەرگرتنی زانایان، {واتە بە مراندنیان} ئەگەر زانا نەما ئەوا خەڵکی چەند سەرۆکێکی نەزان هەڵدەبژێرن بۆ خۆیان، پرسیاریان لێدەکەن ئەوانیش فتوا دەدەن بەبێ عیلم و زانیاری، خۆیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن)).

## ( ٤ ) ئەو کەسەی کە کردەوەیەکی خراپ یان چاك دادەهێنێت

١٧٧٦ـ عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنَ الْأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَيْهِمُ الصُّوفُ، فَرَأَى سُوءَ حَالِهِمْ قَدْ أَصَابَتْهُمْ حَاجَةٌ، فَحَثَّ النَّاسَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَأَبْطَئُوا عَنْهُ حَتَّى رُئِيَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ، قَالَ: ثُمَّ إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ جَاءَ بِصُرَّةٍ مِنْ وَرِقٍ، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ، ثُمَّ تَتَابَعُوا حَتَّى عُرِفَ السُّرُورُ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، كُتِبَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ. وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، كُتِبَ عَلَيْهِ مِثْلُ وِزْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ)).

(جریر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) وتی: چەند کەسێك لە عەرەبە بیابان نشینەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە جلی خوری‌یان لەبەردابوو، پێغەمبەر (ﷺ) بینی کە حاڵیان باش نی‌یە و هەژار کەوتوون، هانی خەڵکی‌دا لەسەر خێر کردن، خەڵکەکە سستی‌یان کردو، زوو کارەکەیان ئەنجام نەدا هەتا لە ڕوخساری پێغەمبەردا (ﷺ) بێزاری دەبینرا، پاشان پیاوێکی ئەنصاری تورەکەیەکی هێنا کە زیوی تیابوو، پاشان پیاوێکی تر هات پاشان بەدوای یەکدا هاتن هەتا خۆشحاڵی لەناوچاوانیدا دەبینرا و فەرمووی: ((هەر کەسێك لە ئیسلامدا شتێکی باش دابهێنێت و لە دوای خۆی پەیڕەوی بکرێت، ئەوا پاداشتی ئەوانەی دەست دەکەوێت کە پەیڕەوی دەکەن، بێ‌ئەوەی پاداشتی ئەوان کەم ببێتەوە، هەرکەسێکیش کارێکی خراپ دابهێنێت و، پاش خۆی پەیڕەوی بکرێت ئەوا تاوانی هەموو ئەوانەی لەسەرە کە پەیڕەوی دەکەن بێ‌ئەوەی لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە)).

## ( ٥ ) ئەوەی خەڵکی بانگ دەکات بۆ ڕێگای هیدایەت یان گومڕایی

١٧٧٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا. وَمَنْ دَعَا

إلَى ضَلَالَةٍ، كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا)).

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر کەسێك بانگی خەڵکی بکات بۆ ڕێگای هدایەت، ئەوە بە ئەندازەی پاداشتی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون پاداشتی دەستدەکەوێت ، هیچ لەپاداشتی ئەوان کەم ناکات، هەر کەسێکیش بانگی خەڵکی بکات بۆ گومڕایی، ئەوا تاوانی لەسەرە وەك ئەوانەی کە شوێنی دەکەون و هیچ لە تاوانی ئەوان کەم ناکات)).

## ( ٦ ) ئەوانەی کە بێجگە لە قورئان شتی تر دەنووسن و ترساندن لە درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە ( ﷺ )

١٧٧٨ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَكْتُبُوا عَنِّي، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ، وَحَدِّثُوا عَنِّي وَلَا حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ -قَالَ هَمَّامٌ: أَحْسِبُهُ قَالَ- مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ)).

(ابو سعيد الخدري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هیچ شتێك لەمنەوە مەنووسنەوە، هەر کەسێك شتێك بنوسێت لەمنەوە بێجگە لە قورئان با بیسڕێتەوە، قسەی من بگێڕنەوە و قەیناکا، هەر کەسێکیش بەزمانی منەوە درۆ بکات))، همام دەڵێ: وابزانم فەرمووی: ((بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا ئامادەبکات)).

١٧٧٩ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٩]

(مغيرة) کوڕی (شعبة)(ﷺ) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: ((بەڕاستی درۆ بەدەم منەوە وەك درۆ بەدەم کەسەوە نییە، هەرکەسێك درۆ بەدەم منەوە بە ئەنقەست بکات، ئەوە با جێگا بۆ خۆی لە ئاگری دۆزەخدا ئامادەبکات)).

١٧٨٠ـ عَنْ سمرة بن جندب وعَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ حَدَّثَ عَنِّي بِحَدِيثٍ يُرَى أَنَّهُ كَذِبٌ فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبِينَ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٩]

(سمرة)کوڕی (جندب) (ﷺ) و (مغيرة) کوڕی (شعبة)(ﷺ) دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەسێك قسەیەك بەزمانی منەوە بگێڕێتەوە و بیش زانێ کە درۆیە، ئەوە خۆیشی یەکێکە لە درۆزنەکان)).

# (٥٨) بەشی دۆعا و نزا

## (١) ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە

١٧٨١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لِلَّهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ اسْمًا، مَنْ حَفِظَهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ)). [بخاري/ الدعوات/ ٦٠٤٧]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوای گەورە نەوەد و نۆ ناوی هەیە، هەرکەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشتەوە، بەڕاستی خوای گەورە تاکە و حەزی لە تاکە)).

## (٢) دۆعا و نزای پێغەمبەر (ﷺ)

١٧٨٢ـ عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ الْأَشْجَعِيِّ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَمَّا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَدْعُو بِهِ اللَّهَ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ)).

فروە کوڕی نوفل أشجعی (ﷺ) دەڵێ: پرسیارم لە عائشە کرد دەربارەی دۆعا و نزای پێغەمبەر (ﷺ)، عائشە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((خوایە بەڕاستی من پەنا دەگرم بەتۆ لە شەڕ و خراپەی ئەوەی کردوومە و ئەوەش کە نەم کردووە)).

١٧٨٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِي لَا يَمُوتُ، وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوتُونَ)). [بخاري/ التوحيد/ ٦٩٤٨]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((خوایە! خۆم تەسلیمی تۆ کردووە و، بڕوام تەنها بەتۆیە و، تەنها پشت بەتۆ دەبەستم و، بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە و، بەتۆ سەردەکەوم بەسەر دوژمنداندا، خوایە! بەڕاستی من پەنا دەگرم بەگەورەیی تۆ ، هیچ خوایەك نیە تەنها تۆ نەبێت، داوات لێدەکەم کە گومڕام نەکەیت، تۆ ئەو زیندووەیت کە هەرگیز نامرێت، جنۆکە و مرۆڤەکان هەموویان دەمرن)).

١٧٨٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ وَأَسْحَرَ يَقُولُ: ((سَمِعَ سَامِعٌ بِحَمْدِ اللَّهِ وَحُسْنِ بَلَائِهِ عَلَيْنَا، رَبَّنَا صَاحِبْنَا وَأَفْضِلْ عَلَيْنَا. عَائِذًا بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵـێ: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەردا بوایە و کۆتایی شەو هەڵسایە، دەیفەرموو: (( گوێبیستێك بیستی کە ئێمە سوپاسی خوا دەکەین و ناز و نیعمەتی زۆری پێبەخشیوین، پەروەردگارا هاورێ و کۆمەکمان بەو، فەزڵ و خێر برژینە بەسەرماندا، پەنا گرتووین بەخوا لە ئاگری دۆزەخ)).

١٧٨٥ـ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي جِدِّي وَهَزْلِي، وَخَطَئِي وَعَمْدِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)). [بخاري/ الدعوات/ ٦٠٣٥]

(ابو موسى‌ى اشعري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دۆعایەی دەفەرموو: ((خوایە! لەتاوانەکان و نەزانیم خۆش ببە، هەروەها لە زیادەرەویشم لەکارەکانمدا و، ئەوەش کە تۆ پێی زاناتریت لەمن.. خوایە! لەڕاست و گاڵتەکانم خۆش ببە، لە هەڵە و ئەنقەستەکانم لەوەش کەلای منە، خوایە لەوەی کە لەمەو پێش کردومە و لەوەی لەوەودواش خۆش ببە، لەوەی کە بەنهێنی و ئاشکرا کردومن و لەوەی کە لەمن زاناتری پێی، تۆ پێش خەر و دواخەری و تۆ بەسەرهەموو شتێکدا دەسەڵاتت هەیە)).

١٧٨٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ)).

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((خوایە ئاینداریەکی چاکم پێببەخشە کە کاروکردەوەم لەهەڵە بپارێزێت. دونیاشم بۆچاك بکە کە ژیانمی تێدایە. قیامەتیشم بۆ چاك بکە چونکە گەڕانەوەم بۆ ئەوێیە. ژیانم بۆ بکە بەهۆکاری زۆر کردنی هەموو خێرو چاکەیەك مردنیشم بۆ بکە بەهۆی حەسانەوە لەگشت خراپەیەك)).

١٧٨٧ـ عَنْ عَبْدِ اللّهِ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ، وَالْغِنَى)).

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((خوایە من داوای هدایەت و تەقواو پاك داوێنی و دەوڵەمەندیت لێدەکەم)).

١٧٨٨ـ عَنْ زَيْدِ ابْنِ أَرْقَمَ -(ﷺ)- قَالَ: لَا أَقُولُ لَكُمْ إِلَّا كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ، كَانَ يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ. اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا)).

(زید کوڕی أرقم) (ﷺ) دەڵێ: ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نەیفەرموو بێت پێتان ناڵێم پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((خوایە من پەنا دەگرم بەتۆ لەپەککەوتەیی و تەمەڵی، لە ترس و ڕژدی -بەخیلی- و پیری، لە سزاو ئازاری ناو گۆڕ. خوایە بەنەفسم تەقوا و خواپەرستی ببەخشە و، خاوێنی بکەرەوە، تۆ چاکترین خاوێنکاری، تۆ پشتیوان و خاوەنی ئەویت، خوایە من پەنا دەگرم بەتۆ لە زانستێك کە سوودی نەبێت، دڵێك کە ملکەچ نەبێت، لەنەفسێك کە تێرنەبێت، لەدۆعا و نزایەك کە گیرا نەبێت)).

## ( ٣ ) نزایەك

١٧٨٩ـ عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْجَعِي، عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَقُولُ حِينَ أَسْأَلُ رَبِّي (ﷻ)؟ قَالَ: ((قُلِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَعَافِنِي وَارْزُقْنِي -وَيَجْمَعُ أَصَابِعَهُ إِلَّا الإِبْهَامَ- فَإِنَّ هَؤُلَاءِ تَجْمَعُ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتَكَ)).

(أبو مالك الأشجعي)(ﷺ) لەباوکیەوە (ﷺ) کە لە پێغەمبەری‌یەوە بیستووە،کە پیاوێك هاتوەتە خزمەتی داوای لێکردووە: چی‌بڵێم کاتێك لەخوا دەپاڕێمەوە؟ فەرمووی: ((بڵێ: خوایە لێم خۆشببە و بەزەیت پێما بێتەوە و لێم ببورە و ڕزق و ڕۆزیم پێ‌ببەخشە، (پەنجەکانی کۆکردەوە تەنها پەنجە گەورە نەبێت)بەڕاستی ئەوانە دونیا و ئاخیرەتت بۆ کۆدەکاتەوە)).

## ( ٤ ) نزايەكی تر

١٧٩٠ـ عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ –وَهُوَ ابْنُ صُهَيْبٍ– قَالَ: سَأَلَ قَتَادَةُ أَنَسًا (ﷺ): أَيُّ دَعْوَةٍ كَانَ يَدْعُو بِهَا النَّبِيُّ (ﷺ) أَكْثَرَ؟ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دَعْوَةٍ يَدْعُو بِهَا يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)). قَالَ: وَكَانَ أَنَسٌ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ بِدَعْوَةٍ دَعَا بِهَا، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ بِدُعَاءٍ دَعَا بِهَا فِيهِ. [بخاري/ الدعوات/ ٦٠٢٦]

لە (عبدالعزيز) (ﷺ) كە كوڕی (صهيب)ە وتی: قەتادە پرسياری كرد لە ئەنەس (ﷺ) كە پێغەمبەر (ﷺ) چ دوٚعايەكی زوٚرتر دەكرد، ئەويش وتی: زوٚرترين دوٚعا و نزای ئەمە بوو: ((خوايە لەدنيادا چاكەمان پێ ببەخشە، لەقيامەتيشدا هەر چاكەمان پێ ببەخشەو لەئاگری دوٚزەخيش بمانپارێزە)). انس ئەگەر بيويستايە يەك دوٚعا بكات ئەوا بەم دوٚعايە دوٚعای دەكرد، هەروەها دوٚعای زوٚريشی هەر بەمەدەكرد .

## ( ٥ ) نزا بوٚ هدايەت

١٧٩١ـ عَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قُلِ اللَّهُمَّ اهْدِنِي، وَسَدِّدْنِي. وَاذْكُرْ بِالْهُدَى هِدَايَتَكَ الطَّرِيقَ، وَالسَّدَادِ سَدَادَ السَّهْمِ)).

(علی)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێم: ((بڵێ: خوايە هيدايەت و ڕێنمونيم بكەو، يارمەتيم بدە بوٚ پێكاندن))، مەبەست لە هيدايەت، هيدايەتی ڕێگايە و پێكاندنيش پێكاندنی تيرە.

## ( ٦ ) دوٚعا بەوكردەوە چاكانەی بوٚ خواكراوە

١٧٩٢– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((بَيْنَمَا ثَلَاثَةُ نَفَرٍ يَتَمَشَّوْنَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ فِي جَبَلٍ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ، فَانْطَبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالًا عَمِلْتُمُوهَا صَالِحَةً لِلَّهِ، فَادْعُوا اللَّهَ تَعَالَى بِهَا لَعَلَّ اللَّهَ يَفْرُجُهَا عَنْكُمْ. فَقَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ وَامْرَأَتِي، وَلِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ، أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا أَرَحْتُ عَلَيْهِمْ، حَلَبْتُ فَبَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ فَسَقَيْتُهُمَا قَبْلَ بَنِيَّ، وَأَنَّهُ نَأَى بِي ذَاتَ يَوْمٍ الشَّجَرُ، فَلَمْ آتِ حَتَّى أَمْسَيْتُ، فَوَجَدْتُهُمَا قَدْ نَامَا، فَحَلَبْتُ كَمَا كُنْتُ أَحْلُبُ، فَجِئْتُ بِالْحِلَابِ فَقُمْتُ عِنْدَ رُءُوسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا مِنْ نَوْمِهِمَا، وَأَكْرَهُ أَنْ أَسْقِيَ الصِّبْيَةَ قَبْلَهُمَا، وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ

دَأْبِي وَدَأْبَهُمْ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ. فَفَرَجَ اللَّهُ مِنْهَا فُرْجَةً فَرَأَوْا مِنْهَا السَّمَاءَ. وَقَالَ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَتْ لِيَ ابْنَةُ عَمٍ أَحْبَبْتُهَا كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، وَطَلَبْتُ إِلَيْهَا نَفْسَهَا، فَأَبَتْ حَتَّى آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَتَعِبْتُ حَتَّى جَمَعْتُ مِائَةَ دِينَارٍ، فَجِئْتُهَا بِهَا، فَلَمَّا وَقَعْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تَفْتَحِ الْخَاتَمَ إِلَّا بِحَقِّهِ. فَقُمْتُ عَنْهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً. فَفَرَجَ لَهُمْ. وَقَالَ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي كُنْتُ اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا. بِفَرَقِ أَرُزٍ، فَلَمَّا قَضَى عَمَلَهُ قَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ فَرَقَهُ فَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَرًا وَرِعَاءَهَا، فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تَظْلِمْنِي حَقِّي. قُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ وَرِعَائِهَا، فَخُذْهَا، فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تَسْتَهْزِئْ بِي، فَقُلْتُ: إِنِّي لَا أَسْتَهْزِئُ بِكَ، خُذْ ذَلِكَ الْبَقَرَ وَرِعَاءَهَا. فَأَخَذَهُ فَذَهَبَ بِهِ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ [لَنَا] مَا بَقِيَ. فَفَرَجَ اللَّهُ مَا بَقِيَ)).
[بخاري/ البيوع/ ٢١٠٢]

لـە (عبـدالله)ی کـوڕی (عمـر)ەوە (رضي الله عنه) ئـەویش لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: ((لەکاتێکدا سێ کەس کۆچبەر بوون بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشتن. باران لێداکردن و ناچاری کردن بەوەی کە پەنا بەرنە بەر ئەشکەوتێك لە شاخێکدا. کەچی بەردێك لە شاخەکەوە بەر دەبێتەوە و دەمی ئەشکەوتەکەیان لێدەگرێت. لەناو خۆیاندا بەیەکتری دەڵێن: تێفکرن بزانن و کارێکی چاکتان لەبەرخوا ئەنجامداوە لەمەوبەر، بانگی خوای گەورەی پێبکەن. سابەڵکو خوا دەرووەمان لێبکاتەوە. یەکێکیان وتی: خوایە [خۆت ئەنزانی] کە باوك و دایکێکی پیر و بەساڵاچووم هەبوو لەگەڵ ژنەکەمدا. هەروەك چەندمنداڵێکی بچوکم هەبوو شوانیم بۆ ئەکردن. کاتێ ئێواران دەهاتمەوە بۆلایان کەشیرەکەم ئەدۆشی پێش ئەوەی بیدەم بە منداڵەکانم بەوانم نۆش ئەکرد. ڕۆژێکیان ئێوارە درەنگ هاتمەوە ئەویش بەهۆی دوورکەوتنەوەم بە گەلا وەراندن بۆئاژەڵەکانم. نەگەڕامەوە تا درەنگ کەوتم. کاتێ گەڕامەوە دەبینم هەردوکیان نوستون. منیش ئاژەڵەکانم دەدۆشی هەروەك لەوەپێش دەمدۆشی. بەکاسە شیرەکەوە بەسەر سەریانەوە ڕاوەستام. حەزم نەئەکرد لە خەو خەبەریان کەمەوە. حەزیشم نەئەکرد پێش ئەوان بیدەم بە منداڵەکان. لەگەڵ ئەوەیشدا منداڵەکان هەر زاق و

زوقیان بوو لەبرسا لەبەرپێمدا. ئەمە حاڵی من و منداڵەکانم بوو تا فەردای بەیانی. جا ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری ڕەزامەندی تۆ ئەنجامداوە. دەرومان لێبکەرەوە بەڕادەیەك ئاسمانی لێوە دیاربێت.. خوا کەلێنێکی بۆ کردنەوە ئاسمانیان لێوەی دەبینی. یەکێکی ترایان وتی: خوایە خۆت ئەزانی کە من کچێکی ئامۆزام هەبوو حەزم لێ بوو زۆرم خۆش ئەویست زیاد لە هەموو کەسێك کە ئافرەتی خۆش بوێت. داوام لێکرد کە بێ شەرعیم لەگەڵ بکات بەڵام ڕازی نەبوو هەتا صەد دیناری نەدەمێ. منیش ماندوو بووم هەتا صەد دینارم کۆکردەوە و بۆم هێنا و کەوتمە نێوان دەردوو قاچیەوە [واتە ویستم کارەکە ئەنجام بدەم] وتی: ئەی بەندەی خوا لە خوا بترسە و مۆری کچێنیم مەشکێنە بە حەقی خۆی نەبێ. منیش وازم لێهێنا. جا ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری تۆ ئەنجام داوە. کەلێنێکی ترمان بۆ بکەرەوە. ئیتر [بەردەکە جولاّ] و کەلێنێکی تریان بۆ کرایەوە. ئەوی تریان وتی: خوایە خۆت ئاگاداری کە من کرێکارێکم گرتبوو بە حەوت مەن. کاتێ ئیشەکەی تەواو کرد، وتی: حەقەکەمم بەرێ. منیش حەوت مەنەکەم پێداو ڕازی نەبوو. منیش بەردەوام هەر بۆم تۆو ئەکرد تا چەند سەر گاو شوانێکم بۆ لێگرت بۆیان. لەدوایدا هاتەوە بۆلام و وتی: لەخوا بترسە حەقم مەخۆ. وتم: بڕۆ هەموو ئەو گاگەلانە بە شوانەکانیشیانەوە هی تۆن. وتی: لەخوا بترسە و گاڵتەم پێمەکە. وتم: من گاڵتەت پێناکەم. بڕۆ ئەو گاگەلانە هەمووی بەرە بۆ خۆت بە شوانەکانیشیانەوە. ئیتر بردی و ڕۆیشت. جا خوایە ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری ڕەزامەندی تۆ کردووە ئەو دەرووەی کە ماوە بۆمان بکەرەوە. ئیتر ئەو دەرووەیشی لێکردنەوە)).

### ( ٧ ) دوعا لەکاتی نارەحەتیدا

١٧٩٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ)). [بخاري/ الدعوات/ ٥٩٨٦]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی نارەحەتیدا دەیفەرموو: ((لاالـه الا الله العظيم الحكيم لا الـه الا الله رب السماوات و رب الأرض، رب العرش الكريم)).

## ( ٨ ) دۆعا گیرایە ئەگەر پەلە نەکەیت

١٧٩٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((لَا يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ، مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ)). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا الِاسْتِعْجَالُ؟ قَالَ: ((يَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ وَقَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذَلِكَ وَيَدَعُ الدُّعَاءَ)). [بخاري/ الدعوات/ ٥٩٨١]

(ابی هریرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەردەوام دۆعا و نزای مرۆڤ وەردەگیرێت، مادام دوعایەکی گوناە، یان برینی پەیوەندی خزمایەتی یان پەلەنەکات)) وترا بە پێغەمبەر (ﷺ) پەلە کردن چی‌یە؟ فەرمووی: ((دەڵێ: دۆعام کرد و دۆعام کرد و لێم وەرنەگیرا، ئەو کاتە واز لە دوعا دەهێنێ و داوا لەخوا ناکات)).

## ( ٩ ) پشت بەخوا بەستن لە دوعادا

١٧٩٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ، اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ، لِيَعْزِمْ فِي الدُّعَاءِ، فَإِنَّ اللَّهَ صَانِعٌ مَا شَاءَ، لَا مُكْرِهَ لَهُ)).

(ابو هریرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((باکەستان نەڵێت؛خوایە ئەگەر ئارەزووت لێیە لێم خۆشببەو، بەزەیت پێمدابێتەوە، بەورەو قەناعەتەوە داوا بکات و بەردەوام بێت، چونکە خوای گەورە ئەوەی بیەوێت دەیکات و کەس زۆری لێناکات)).

## ( ١٠ ) کاتی وەرگرتنی دۆعا و نزا

١٧٩٦ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً، لَا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: ((بەڕاستی لەشەودا کاتێکی دیاری کراو هەیە، هەر موسڵمانێك تووشی ئەو کاتە ببێت و، لەوکاتەدا داوا لەخوای گەورە بکات بۆ کاروباری دنیا و قیامەت، بێگومان خوای گەورە داواکەی ناگەڕێنێتەوە پێی دەبەخشێت. ئەمەش هەموو شەوێك)).

## ( ١١ ) دوعا و نزا لە کۆتـایی شەودا

١٧٩٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ وَمَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ وَمَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ)).
[بخاري/ التهجد/ ١٠٩٤]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە و بالادەست هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، کاتێك کۆتایی سێیەکی شەوی دەمێنێت، دەفەرمووێت؛ کێ بانگم دەکات و نزام لا دەکات، هەتا بێم بەهانایەوە و نزاکەی گیرابکەم، کێ داوای شتم لێدەکات، هەتا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکات هەتا لێی خۆش ببم)).

## ( ١٢ ) دوعاکردن لەکاتی خوێندنی کەڵەشێردا

١٧٩٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا. وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا)). [بخ بدء الخلق/ ٣١٢٧]

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکاتێك گوێتان لە خوێندنی کەڵەشێر بوو، ئەوا داوای خێر وبەرەکەت لە خوا بکەن، چونکە ئەو فریشتەی بینیوە. هەرکاتێکیش گوێتان لە زەڕینی گوێدرێژ بوو ئەوا پەنا بگرن بە خوای گەورە لە خراپە و شەڕی شەیتان، چونکە ئەوە چاوی بەشەیتان کەوتووە)).

## ( ١٣ ) دوعا و نزا بۆ موسڵمان بە پەنهانی

١٧٩٩ـ عَنْ صَفْوَانَ -وَهُوَ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ- وَكَانَتْ تَحْتَهُ الدَّرْدَاءُ، قَالَ: قَدِمْتُ الشَّامَ، فَأَتَيْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فِي مَنْزِلِهِ فَلَمْ أَجِدْهُ، وَوَجَدْتُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ، فَقَالَتْ: أَتُرِيدُ الْحَجَّ الْعَامَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ. قَالَتْ: فَادْعُ [اللَّهَ] لَنَا بِخَيْرٍ، فَإِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: ((دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ، عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ، كُلَّمَا دَعَا لِأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ)). قَالَ: فَخَرَجْتُ إِلَى السُّوقِ فَلَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَقَالَ لِي مِثْلَ ذَلِكَ، يَرْوِيهِ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ).

(صفوان ابن عبدالله بن صفوان)–هاوسەری خاتوو درداء– (ﷺ) دەڵێ: هاتم بۆ شام و چووم بۆ لای باوکی دەرداء، بـەلاّم لەماڵـەوە نـەبوو، دایکـی دەرداء لەماڵەوە بوو وتی: دەتەوێت ئەمساڵ بچیت بۆ حەج؟ وتم: بەڵێ، وتـی: دۆعای خێرمان بۆ بکە؟ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((دوعـای موسـڵمان بـۆ بـرای موسـڵمان بەپەنـهانی، گـیرادەبێت)) بەڕاسـەریەوە فریشـتەیەك هەیـە کـە ئەمەی پێسپێردراوە کـە هـەرکاتێك دوعا بکات بۆ براکەی بەچاکە، فریشـتەکە دەڵێ: ئامین و، بۆتۆش بەوێنەی ئەو. دەڵێ: چووم بۆ بازاڕ و گەیشتم بە باوکی دەرداء ئەویش هـەمان شتـی پـێوتم هـەمان فـەرموودەی لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) گێڕایەوە.

### ( ١٤ ) داوای تۆڵە پێش خستن لەدونیادا باش نیی‌یە

١٨٠٠ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَادَ رَجُلًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَدْ خَفَتَ فَصَارَ مِثْلَ الْفَرْخِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَلْ كُنْتَ تَدْعُو بِشَيْءٍ أَوْ تَسْأَلُهُ إِيَّاهُ)). قَالَ: نَعَمْ، كُنْتُ أَقُولُ: اللَّهُمَّ مَا كُنْتَ مُعَاقِبِي بِهِ فِي الْآخِرَةِ فَعَجِّلْهُ لِي فِي الدُّنْيَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((سُبْحَانَ اللَّهِ، لَا تُطِيقُهُ –أَوْ: لَا تَسْتَطِيعُهُ– أَفَلَا قُلْتَ: اللَّهُمَّ ( آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)) قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ لَهُ فَشَفَاهُ.

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ لای موسڵمانێك کەنەخۆش بوو، زۆر لاواز بوبـوو بچـوك بوبـووەوە، وەك بەچکـەی بـاڵندە، پێغەمبـــەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە هیچ دوعات دەکرد یا داوای هیچت دەکرد؟ پیاوە نەخۆشەکە وتـی: دەمووت خوایە ئەو تۆڵەی لە قیامـەت لێم دەستێنی بۆم پێش بخە بـۆ دونیـا، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((سـبحان الله تـۆ بەرگـە نـاگریت، ئـەی بـۆ نـەتووت: خوایـە لـە دونیـا چاکـەمان پێببەخشـە لـە قیامەتیشـدا هـەر بەچاکـە لەئاگری دۆزەخ بمانپارێزە)) پیاوەکە ئەم دۆعایەی کرد و چاك بووەوە.

### ( ١٥ ) ئاوات خواستنی مردن بەهۆی بەلاّ چاك نیی‌یە

١٨٠١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي)). [بخاري/ الدعوات/ ٥٩٩٠]

(انس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((باهیچ کەسێك لەئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت لەبەر ئەوەی تووشی بەڵایەك بووە، ئەگەر زۆر پێویست بوو ئاوات بخوازێت، ئەوا بابڵێت؛ خوایە! ئەگەر ژیان چاکترە بۆم ئەوا بمژێنە، ئەگەر مردنیش چاکترە بۆم بممرێنە)).

١٨٠٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ، وَلَا يَدْعُ بِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُ، إِنَّهُ إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ، وَإِنَّهُ لَا يَزِيدُ الْمُؤْمِنَ عُمْرُهُ إِلَّا خَيْرًا)).

(ابو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((باهیچ کەسێك لە ئێوە خۆزگە بەمردن نەخوازێت و دوعایشی بۆ نەکات پێش ئەوەی یەخەی پێ‌بگرێت چونکە ئەگەر یەکێك لە ئێوە مرد ئەوا کردەوەکانی کۆتایی پێ‌دێت، تەمەن زیادی بۆ موسڵمان هەر خێری زیاد دەکات)).

# (٥٩) باسی ذكر و یادی خوایگەورە

## ( ١ ) هاندان بۆ یادی خواو، نزیك بوونەوە لەخوا بە بەردەوامی یادكردنی

١٨٠٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي، إِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ هُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً)). [بخاري/ التوحيد/ ٦٩٧٠]

(ابــو هریــرة)(ﷺ) دەڵــێ: پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموویــەتی: ((خــوای گــەورە دەفەرموێت: مـن لەگەڵ گومـانی بـەندەی خۆمـم، مـن لەگـەڵیدام كـاتێك یـادم دەكات، ئەگەر لە دەروون و نەفسی خۆیدا یادم بكات، ئەوامنیش لـەدەروون و نەفسی خۆمدا یـادی دەكـەم، ئەگـەر لـەناو كـۆڕ و كۆمـەڵدا یـادم بكـات، ئـەوام منیش یادی دەكەم لەناو كۆڕ و كۆمـەڵێكدا لـەوەی خـۆی چاكتربن، ئەگـەر یـەك بست لەمن نزیك ببێتەوە ئەوا من یەك باڵ لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر یەك باڵ لە من نزیك ببێتەوە ئەوا من یەك گەز لێی نزیـك دەبمـەوە، ئەگـەر بە ئاسـایی بێـت بۆلام ، ئەوا من بەڕاكردن بەرەو ڕووی دەچم)).

## ( ٢ ) بەردەوامی لەسەر زیكر و یادی خوا و واز نەهێنان لێی

١٨٠٤ـ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ حَنْظَلَةَ الْأُسَيِّدِيِّ (ﷺ) -قَالَ: وَكَانَ مِنْ كُتَّابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)- قَالَ: لَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ الصديق (ﷺ) فَقَالَ: كَيْفَ أَنْتَ يَا حَنْظَلَةُ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! مَا تَقُولُ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَكُونُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ حَتَّى كَأَنَّا رَأْيُ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَافَسْنَا الْأَزْوَاجَ وَالْأَوْلَادَ وَالضَّيْعَاتِ فَنَسِينَا كَثِيرًا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَوَاللَّهِ إِنَّا لَنَلْقَى مِثْلَ هَذَا، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ (ﷺ) حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَمَا ذَاكَ)). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَكُونُ عِنْدَكَ تُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ [حَتَّى] كَأَنَّا رَأْيُ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِكَ عَافَسْنَا الْأَزْوَاجَ وَالْأَوْلَادَ وَالضَّيْعَاتِ نَسِينَا كَثِيرًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنْ لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ

عِنْدِي وَفِي الذِّكْرِ، لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلَائِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ وَفِي طُرُقِكُمْ، وَلَكِنْ يَا حَنْظَلَةُ سَاعَةً وَسَاعَةً)). ثَلَاثَ مَرَّاتٍ.

(ابو عثمان الهندي) (ﷺ) ئەويش لە (حنظلة الأسيدي)يـەوە (ﷺ) –ئـەم پياوە لە نووسەرانى سروشت بوو– دەڵێ: (ابو بكرى صديقم) پێگەيشت (ﷺ) فەرمووى: حنظلة چۆنى؟ وتم: حنظلة بووە بە دوو ڕوو. وتى: پاكى هەر بۆ خوايە ئەوە چى دەڵێيت؟ دەڵێ: وتم: كاتێك لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دەبين دۆزەخ وبەهەشتمان دەخاتەوە ياد وەك ئـەوەى بـەچاوى خۆمـان بينيبێتمـان، كـاتێك لاى پێغەمبـەر (ﷺ) دەرچووين، ژن و منـاڵ و ئيـش و كـار سـەرقاڵمان دەكەن و، هەموو شتێكمان لەبير دەچێتەوە، ابو بكريش وتى: سوێند بەخوا ئێمەيش هەر بەو شێوەيەين هەمان حاڵەتمان هەيە. حنظلة دەڵێ: من و ابوبكر چووين بۆ خزمەت پێغەمبـەر (ﷺ) وتم: ئـەى پێغەمبـەر ، حنظلـة دوو ڕوويـى كردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: ((ئەوە چىيە؟ (ئەو دووڕوويىيە چىيە؟))) وتم:ئـەى پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) كـاتێك لاى تۆيـين بەهەشـت و دۆزەخمـان دەخەيتەوە ياد، وەك ئـەوەى بـەچاوى خۆمـان بينيبێتمـان كـاتێكيش لاى تـۆ دەرچووين ئەوا ژن و ماڵ و مناڵ سەرقاڵمان دەكات. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووى: ((سوێند بەوكەسـەى نەفسـى منـى بەدەستە ئەگەر بـەردەوام بـن لـە سـەر ئـەو حاڵەتەى كەلاى منن يا لە يادكردنەوەداين، ئەوا فريشتەكان لەگەڵتاندا دەبوون و تەوقەيان لەگەڵ دەكردن لە جێگەكانتاندا و لەڕێگا و بانـەكاندا، بەڵام حنظلة كات كاتە..)) سێ جار دووبارەى كردەوە.

## ( ٣ ) باسى كۆبوونەوە لەسەر قورئان خوێندن

١٨٠٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ. وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ. وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ. وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ. وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ. وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ)).

لە (أبو هریرة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەسێك یارمەتی موسڵمانێك بدات بۆ ئەوەی ناڕەحەتییەکی دونیایی لەکۆڵ بکەوێت، ئەوە بێگومان خوای گەورە ناڕەحەتی دواڕۆژی لەکۆڵ دەخات، هەرکەسێك یارمەتی نەدار و هەژارێك بدات و کارەکەی بۆ ئاسان بکات، ئەوا خوای گەورە کاریش بۆ ئەو ئاسان دەکات و یارمەتی دەدات. خوای گەورە لە کۆمەکی بەندەی خۆیدایە مادام ئەو بەندەیە لەکۆمەکی براکەیدابێت. هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ ئەوەی علم و زانینێك بەدەست بهێنێت، ئەوا خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، هەر کۆمەڵێك کۆببنەوە لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا و قورئان بخوێننەوە و موتالای بکەن، ئەوا بێگومان دڵئارامی دادەبەزێتو بەسەریانداو، ڕەحمەت و بەزەیی دایان دەپۆشێت و، فریشتەکان چواردەوریان دەگرن و، خوایگەورەش باسیان دەکات لای ئەوانەی کەلای ئەون، هەرکەسێك کاروکردەوەی ناتەواو بێت ئەوا بێگومان نەسەب و بنەماڵە و ڕەچەڵەك فریای ناکەوێت)).

## ( ٤ ) ئەو کەسەی دابنیشێ و یادی خوا بکات و سوپاسی بکات ئەوە بێگومان خوای گەورە شانازی پێوەدەکات بەسەر فریشتەکاندا

١٨٠٦ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ (ﷺ) عَلَى حَلْقَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ مَا أَجْلَسَكُمْ؟ قَالُوا:جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ (ﷻ). قَالَ: آللَّه مَا أَجْلَسَكُمْ إِلَّا ذَاكَ؟ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلَّا ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَمَا كَانَ أَحَدٌ بِمَنْزِلَتِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَقَلَّ عَنْهُ حَدِيثًا مِنِّي، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: ((مَا أَجْلَسَكُمْ)). قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِلْإِسْلَامِ وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا. قَالَ: ((آللَّه مَا أَجْلَسَكُمْ إِلَّا ذَاكَ)). [قَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلَّا ذَاكَ] قَالَ: ((أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي: أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلَائِكَةَ)).

(أبي سعيد الخدري)(ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێك معاویە چووە لای کۆمەڵێك لە مزگەوتدا، وتی: چیدەکەن لێرە وبۆ دانیشتوون؟ وتیان: دانیشتووین و یادی خوای گەورە دەکەین، معاویە وتی: سوێندتان دەدەم ئایا تەنها بۆئەوە دانیشتون؟ وتیان: سوێند بەخوا تەنها بۆ ئەوە دانیشتوین. معاویە وتی: من کە سوێندمدان وەنەبێ تۆمەت بخەمە پاڵتان کەس بەئەندازەی من لە پێغەمبەرەوە

نزیك نەبوو، بەلاّم فـەرمووده‌م کـەم لێـوە گێڕاوەتـەوە. پێغەمبـەر (ﷺ) ڕۆژێـك کۆمەڵێك لەیارانی بینی، فـەرمووی: ((بۆچـی دانیشـتوون)) وتیـان: دانیشتوین یادی خوا دەکەین و سوپاسـی دەکـەین لەسـەر ئـەوەی کە هیدایـەتی داوین بۆ ئیسـلام بە هۆی ئـەوەوە منـەتی کـردووە بەسەرماندا. فـەرمووی: ((سـوێندتان دەدەم ئایا تەنها لەبەرئەوە دانیشتون؟)) وتیان: سوێند بەخوا تەنها لەبەر ئـەوە دانیشـتوین، فـەرمووی: ((مـن تۆمـەت ناخـەمـەپاڵتان ولەبـەر ئـەوەش سـوێندم نەدان، بەلاّم جبریل (ﷺ) هاتە لام و هەواڵی پێدام کە:بەڕاستی خـوای گـەورە شانازی دەکات بە ئێوەوە لەسەر فریشتەکان)).

## ( ٥ ) خێری کۆڕی زیکری خوا

١٨٠٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ لِلَّه تَبَارَكَ وَتَعَـالَى مَلَائِكَةً سَيَّارَةً فُضُلًا، يَتَتَبَّعُونَ مَجَالِسَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وَجَدُوا مَجْلِسًا فِيهِ ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ وَحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِأَجْنِحَتِهِمْ، حَتَّى يَمْلَئُوا مَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَإِذَا تَفَرَّقُوا عَرَجُوا وَصَعِدُوا إِلَى السَّمَاءِ. قَالَ: فَيَسْأَلُهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: مِنْ أَيْنَ جِئْتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: جِئْنَا مِنْ عِنْدِ عِبَادٍ لَكَ فِي الْأَرْضِ يُسَبِّحُونَكَ، وَيُكَبِّرُونَكَ، وَيُهَلِّلُونَكَ، وَيَحْمَدُونَكَ، وَيَسْأَلُونَكَ. قَالَ: وَمَاذَا يَسْأَلُونِي؟ قَالُوا: يَسْأَلُونَكَ جَنَّتَكَ. قَالَ: وَهَلْ رَأَوْا جَنَّتِي؟ قَالُوا: لَا أَيْ رَبِّ. قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا جَنَّتِي؟ قَالُوا: وَيَسْتَجِيرُونَكَ. قَالَ: وَمِمَّ يَسْتَجِيرُونَنِي؟ قَالُوا: مِنْ نَارِكَ يَا رَبِّ. قَالَ: وَهَلْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: لَا. قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: وَيَسْتَغْفِرُونَكَ. قَالَ: فَيَقُولُ: قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ فَأَعْطَيْتُهُمْ مَا سَأَلُوا، وَأَجَرْتُهُمْ مِمَّا اسْتَجَارُوا. قَالَ: فَيَقُولُونَ: رَبِّ فِيهِمْ فُلَانٌ عَبْدٌ خَطَّاءٌ، إِنَّمَا مَرَّ فَجَلَسَ مَعَهُمْ. قَالَ: فَيَقُولُ: وَلَهُ غَفَرْتُ، هُمُ الْقَوْمُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ)). [بخاري/ الدعوات/ ٦٠٤٥]

(ابـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((خـوای بـەرز و بـاڵا چەندفریشـتەیەکی گەڕۆکی زیـادەی هەیـە، بەشـوێن کـۆڕی زیکـردا دەگـەڕێن، کاتێ کۆڕێکیان بینی یادی خوا دەکەن لەگەڵیان دادەنیشن بەباڵەکانیان یەکتری پەرژین دەکەن، تا وەکو نێوان خۆیان و نێوان ئاسمانی دونیا پڕدەکەن ، کاتـێ ئەو کۆڕە بڵاوەی لێدەکەن ئـەوانیش سـەردەکەونەوە بـۆ ئاسمـان. دەڵـێ: ئینجا خوای باڵا دەست لێیان دەپرسێت لەکاتێکدا ئەو خۆی لەوان چاکتر دەزانێ؛ لە کوێوە هاتن؟ دەڵێن لای چـەند بەندەیەکی خۆتـەوە هاتینـەوە لەسـەر زەوی‌یـەوە

هەمیشە (سبحان الله، الله اكبر، لااله الاالله و، الحمد لله)یان دەكرد و. لەتۆیش دەپاڕانـەوە، فـەرمووی: ((داوای چیـم لێدەكــەن! دەڵێــن: داوای بەهەشــتەكەت دەكــەن. دەفــەرمووێت: جـا بەهەشــتی منیــان دیــوە؟ دەڵێــن: نــەخێر ئــەی پەروەردگار. دەفەرموویێت: جا ئەوە چۆن دەبوو ئەگەر بەهەشتەكەیان ببینایە؟ دەڵێن: پەنایشت پێدەگرن. دەفەرموویێت: لەچی پەنام پێ دەگرن؟ دەڵێن: لە ئاگرەكەت ئـەی پـەروەردگار. دەفـەرموویێت: ئایـا! ئاگرەكـەیان دیـوم، دەڵێـن: نەخێر. دەفەرموویێت: جا چۆن دەبوو ئەگەر ئاگرەكەیان ببینایەم؟ دەڵێن: داوای لێخۆشبونیشت لێدەكەن. ئەویش دەفەرمویێت: ئەوا منیش لێیان خۆش بووم و، داوای چیشــیان كــردووە پێیــان دەدەم و، پەنایشــیان دەدەم لــەوەی پــەنام پێدەگرن لێی، ئـەوانیش دەڵێن: ئـەی پـەروەردگار فلان كەسـیان تێدایـە زۆر گوناهبارە و، هەر ڕابووردووە بەلایاندا، دانیشتووە لەگەڵیان. دەفـەرموویێت: وا لەویش خۆش بووم، ئەوانە كۆمەڵێكن دانیشتوو لەگەڵیان بەدبەخت نابێت)).

## ( ٦ ) ئەو پیاو و ژنانەی یادی خوا دەكەن

١٨٠٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَسِيرُ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، فَمَرَّ عَلَى جَبَلٍ يُقَالُ لَهُ جُمْدَانُ، فَقَالَ: ((سِيرُوا، هَذَا جُمْدَانُ، سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ)). قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ)). [بخاري/ المغازي/ ٣٨٨٤]

(أبوهريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبــەر (ﷺ) بـەڕێی مەككەدادەڕۆیشـت ڕابــورد بـەلای كێوێكـدا پێــی دەوتـرا (جُمـران) فـەرمووی: ((بـڕۆن، ئەمــە (جُمــران)ە، یەكتاپەرستەكان پێشكەوتن))، وتیـان: یەكتاپەرستەكان كێن ئـەی پێغەمبـەری خوا، فەرمووی: ((ئەو پیاوو ژنانەی كە یادی خوا زۆر دەكەن))

## ( ٧ ) ( لااله الا الله ) كردن

١٨٠٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ، أَعَزَّ جُنْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَغَلَبَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، فَلَا شَيْءَ بَعْدَهُ)).

(ابوهریـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەیفـەرموو: ((هیـچ خوایــەك نیـە جگـە لـە (الله)ی تـاك وتەنـها سـەباز و لەشـكری خـۆی سـەربەرز كـردو، بەندەكـەی خـۆی سـەركەوتووكردوو، هەربەتەنـها خۆی كۆڕ وكۆمەڵـەكانی تێـك شكاندو هیچ شتێك لەدوای ئەو نیە)).

## ( ٨ ) دەنگ بەرزکردنەوە بە زیکرکردن

١٨١٠ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَجْهَرُونَ بِالتَّكْبِيرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، إِنَّكُمْ لَيْسَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا، إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعًا قَرِيبًا وَهُوَ مَعَكُمْ)). قَالَ: وَأَنَا خَلْفَهُ، وَأَنَا أَقُولُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، فَقَالَ: ((يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ، أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ)). فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((قُلْ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)). [بخاري/ المغازي/ ٣٩٦٨]

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا بووین (ﷺ) لەسەفەرێکا، خەڵکی بەدەنگی بەرزەوە (الله اكبر)یان دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((خەڵکینە لە سەرخۆبن، خۆ ئێوە بانگی کەسێ ناکەن کەڕ و نادیاربێت. ئێوە بانگی کەسێ دەکەن بیسەر و نزیکە هەمیشە لەگەڵتانە)). دەڵێ: منیش لە دوایەوە بووم، دەموت: (لا حول ولاقوة الاّ بالله) فەرمووی: ((ئەی (عبدالله)ی کوڕی (قیس)، ئایا گەنجینەیەك لە گەنجینەکانی بەهەشتت پیشان نەدەم؟)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((بڵێ: لاحول ولاقوه الاّ بالله)) واتا: هیچ هێز و دەسەڵاتێك نییە تەنها خوا نەبێت.

## ( ٩ ) ئەوەی لە ئێواراندا دەوترێت

١٨١١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَمْسَى قَالَ: ((أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرِ مَا فِيهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ وَسُوءِ الْكِبَرِ، وَفِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْقَبْرِ)). قَالَ الْحَسَنُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ: وَزَادَنِي فِيهِ زُبَيْدٌ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ –رَفَعَهُ– أَنَّهُ قَالَ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)). [وفي رواية: إِذَا أَصْبَحَ قَالَ ذَلِكَ أَيْضًا: ((أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ))].

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ ئێوارەی لێدەهات دەیفەرموو: ((وا ئێوارەمان لێهات. هەموو موڵك و دەسەڵاتێکیش بۆخوایە، سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە، هیچ خوایەك نیە تەنها (الله) نەبێت، هەر ئەو خوایە هاوبەشی نییە، خوایە من داوات لێدەکەم خێری ئەم

شەوە و خێری ئەوەی تێیدایە، پەنایشت پێدەگرم لە زیانی ئەم شەوە و زیانی ئەوەی تێیدایە، خوایە من پەنات پێدەگرم لە تەمەڵی و پیری و پەك کەوتن و خراپی لێکەوتەیی و گرفتار بوونی دنیا و سزای گۆڕ)) (حسن) کوڕی (عبدالله) دەڵێ: (زبید) لە (ابراهیم)ی کوڕی (سُوید) ەوە ئەمەیشی بۆ زیادکردووم، ئەویش لە (عبدالرحمن)ی کوڕی (یزید)ەوە، ئەویش لە (عبدالله)- کەلە دەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە- کە فەرموویەتی: ((هیچ خوایەك نی‌یە تەنها (الله) نەبێت، تاك و تەنهایە هاوبەشی نییە، هەموو موڵك و دەسەڵات وسوپاس و ستایشێك هەر بۆ ئەوە، ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە)) {لە ریوایەتێکی تردا} پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ بەیانی لێدەهات دیسانەوە دەیفەرموو: ((بەیانیمان کردەوە و هەموو شتێکیش هەر هی خوایە)).

## ( ١٠ ) ئەوەی لەکاتی خەوتندا دەوترێت

١٨١٢- عَنْ عَلِي بن أبي طالب (رضي الله عنه): أَنَّ فَاطمَةَ (رضي الله عنها) اشْتَكَتْ مَا تَلْقى مِنَ الرَّحَى فِي يَدهَا، وأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) سَبْيٌ، فَانْطَلَقَتْ فَلَمْ تَجِدْهُ، وَلَقِيَتْ عَائشَةَ (رضي الله عنها) فَأَخْبَرَتْهَا، فلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ بِمَجِيء فَاطمَةَ (رضي الله عنها) إِلَيْهَا. فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيْنَا وقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا نَقُومُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((عَلَى مَكَانِكُمَا)). فقَعَد بَيْننا، حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قدمه عَلَى صَدْرِي، ثُمَّ قَالَ: ((أَلا أُعَلِّمُكُمَا خَيْرًا ممَّا سَأَلْتُمَا؟ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا: أَنْ تُكَبِّرَا اللَّه أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ، وَتُسَبِّحَاهُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وتحْمَدَاهُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَهْوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ)). [وزَاد فِي أخرى: قَالَ عليٌّ: ما تركْتُهُ مُنْذُ سَمِعْتُهُ منَ النَّبِيِّ (ﷺ). قِيلَ لَهُ: وَلَا لَيْلَة صِفِّينَ؟ قَالَ: وَلَا لَيْلَةَ صِفِّين]. [بخاري/ الخمس/ ٢٩٤٥]

(علي)ی کوڕی (أبو طالب) (رضي الله عنه) دەڵێ: (فاطمة) (رضي الله عنها) دادوبێداد دەکات لەدەست ئەوەی کە تووشی دەست و پلی دێت لە زۆری دەستاڕ کردن، پێغەمبەریش (ﷺ) چەند دیلێکی دەست کەوت دەبێت، ئەویش دەچێت بۆ خزمەتی و نایدۆزێتەوە، دەگات بە عائشة (رضي الله عنها)، و باسەکەی لا دەکاتەوە، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دێتەوە (عائشە) (رضي الله عنها) باسی هاتنی (فاطمة)(رضي الله عنها)ی بۆ دەکات، پێغەمبەریش (ﷺ) هات بۆلامان لەکاتێکدا ئێمە چووبووینە ناو جێگاوە، ویستمان هەستین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لە شوێنی خۆتان بن)) لە نێوانماندا دانیشت، تاوەکو هەستم بە ساردی پێی کرد لەسەر سینگم،

فەرمووی: ((ئەرێ شتێكتان فێرنەكەم باشتر بێت لەوەی كە داواتان كردبوو؟ كاتێ چوونە ناو نوێنەوە: سیوچوار جار (الله اكبر)و، سیوسێ جار (سبحان الله) و سیوسێجار (الحمد لله) بكەن، ئەوە لە خزمەتگوزار باشترە بۆتان. {لەڕیوایەتێكی تردا، علی وتی: لەوساوە لە پێغەمبەرم بیستوە ئەمانەم تەرك نەكردووە، پێی وترا: شەوی (صفین)یش؟ وتی: شەوی (صفین)یش}.

١٨١٣ـ عَنْ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ (﵁): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ. وَاجْعَلْهُنَّ مِنْ آخِرِ كَلَامِكَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ مُتَّ وَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ)). قَالَ: فَرَدَّدْتُهُنَّ لِأَسْتَذْكِرَهُنَّ، فَقُلْتُ: آمَنْتُ بِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، قَالَ: ((قُلْ: آمَنْتُ بِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ)). [بخاري/ الوضوء/ ٢٤٤]

(البراء)ی كوڕی (عازب) (﵁) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((كاتێ ویستت بچیتە سەر جێگە دەست نوێژبگرە وەك چۆن دەست نوێژ دەگریت بۆ نوێژ، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕاكشێ، پاشان بڵێ: خوایە من ڕووی ڕووخسارم كەچ كرد بەرەولای تۆو، كاروباری خۆم حەواڵەی تۆ كرد و، پشت و پەنام دابەتۆو، بەئومێدی {بەزەیی}تۆو، {ترسان} لە سزای تۆ، هیچ پەناو داڵدەیەك نییە لە تۆ مەگەر بەرەو لای تۆ نەبێت، باوەڕم هەیە بەو قورئانەی كە داتبەزاندووە و بەو پێغەمبەرەیش كە ڕەوانەت كردووە. با ئەمانە دواهەمین قسەبێت، ئەگەر لەو شەوەتدا بمریت لەسەر سروشتی پاك دەمریت)). دەڵێ: منیش دوبارەم كردنەوە تا لەبەریان كەم، وتم: باوەڕم هێنابەو (نێردراوە)ی كەناردووتە، فەرمووی: ((بڵێ: باوەڕم هێنا بەو پێغەمبەرەی كە ناردووتە)).

١٨١٤ـ عَنِ الْبَرَاءِ (﵁): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ قَالَ: ((اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَحْيَا وَبِاسْمِكَ أَمُوتُ)). وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)).

لە (براء)ی كوڕی (عازب)ەوە دەگێڕنەوە (﵁) كە پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ دەچووە ناو جێگەوە دەیفەرموو: ((خوایە بەناوی تۆوە زیندوو دەبمەوە و

بەناوی تۆیشەوە دەمرم)) کاتێکیش لەخەو هەڵدەستا دەیفەرموو: ((سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینـەوە، پـاش ئـەوەی مراندینـی، گەڕانەوەشمان هـەر بۆلای ئەوە)).

١٨١٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّهُ أَمَرَ رَجُلًا إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ قَالَ: ((اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا، لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا، إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا، وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ)). فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَسَمِعْتَ هَذَا مِنْ عُمَرَ؟ فَقَالَ: مِنْ خَيْرٍ مِنْ عُمَرَ، مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).

(عبدالله) کوڕی (عمر) (ﷺ) فەرمانیدا بەپیاوێك کاتێك چووە سـەر جێگـای نووسـتن، بڵێـت: ((خوایـە، تـۆ گیـانی منـت دروسـت کـردووە و هـەر خۆیشـت دەیمرێنی، مردن و ژیان هەر بەدەست تۆیە، ئەگەر زیندووت کردەوە بیپارێزە، ئەگـەر مراندیشـت لێـی خـۆش بـە، خوایـە مـن داوای بـێوەیی و سـەلامەتیت لێدەکەم)) پیاوێك پێی وت: ئایا ئەمەت لە (عمر) بیستووە؟ وتی: لـە چاکتر لـە (عمر)م بیستووە، لە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

١٨١٦ـ عَنْ سُهَيْلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو صَالِحٍ يَأْمُرُنَا إِذَا أَرَادَ أَحَدُنَا أَنْ يَنَامَ: أَنْ يَضْطَجِعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ ثُمَّ يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ وَرَبَّ الْأَرْضِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ، وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ)). وَكَانَ يَرْوِي ذَلِكَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ).

(سـهیل) دەڵـێ: (ابـو صـالح) فـەرمانی پێدەکردیـن هـەرکاتێ یـەکێکمان بیویسـتایە بخـەوێت، لەسـەر لای ڕاسـتی ڕاکشـێت و پاشـان بڵێـت: ((خوایـە پـەروەردگاری ئاسمانـەکان و پـەروەردگاری زەمـین و پـەروەردگاری عەرشـی مەزن، پەوەردگاری ئێمە و، پەروەردگاری هەموو شتێکی تر، پشکوێنەری تۆمە و ناوکەکان، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پـەنات پـێدەگرم لـەزیانی هەر شتێك کە جڵەوو دەسـەڵاتی بەدەست تۆیە، خوایـە هـەر تۆ یەکەمینیت و هیچ شتێکت لە پێشتەوە نییە و،هەر تۆیش دواهەمینیت و هیچ شتێك لە دوای تـۆوە نـیـە، هـەر تۆ بالادەستیت، هیچ شتێك لەسەرووی تـۆوە نییە، هـەر تـۆ

پەنهان و ئاگاداری نهێنیەكانی خەڵكیت هیچ لەتۆ شاراوە نییە، قەرز و قوڵەمان لەسەر لابەرە و، لە دەست هەژاری ڕزگارمان بكە)) ئەم فەرموودەیەی لە (ابو هريرة)ەوە ڕیوایەت دەكرد، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ).

١٨١٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَأْخُذْ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ فَلْيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ، وَلْيُسَمِّ اللَّهَ، فَإِنَّهُ لَا يَعْلَمُ مَا خَلَفَهُ بَعْدَهُ عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَضْطَجِعَ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، وَلْيَقُلْ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبِّي، بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ)). [بخاري/ الدعوات/ ٥٩٦١]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((كاتێ یەكێكتان چووە ناو جێگای نووستنەوە، با چمكێكی كراسەكەی بگرێت و، جێگاكەی پێ بتەكێنێ و ناوی خوا ببات، چونكە خۆ ئەو نازانێ پاش خۆی چی هاتۆتە ناو جێگاكەی، هەر كاتێ ویستی بنوێت بالەسەرلای ڕاستی ڕاكشێت و بڵێت: پەروەردگارم خوایە گیان پاك و بێگەری بۆ تۆ، بە پشتیوان تۆ لاتەنیشتم دادەنێم، بەپشتیوانی تۆیش بەرزی دەكەمەوە، ئەگەر گیانی منت گرتە لای خۆت لێی خۆش بە، ئەگەر بەریشت دا بیپارێزە بەوەی كە بەندە باشەكانی خۆتی پێ دەپارێزی)).

١٨١٨ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا، وَكَفَانَا وَآوَانَا، فَكَمْ مِمَّنْ لَا كَافِيَ لَهُ وَلَا مُؤْوِيَ)).

(انس) (ﷺ) دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەچووە سەر جێگا بۆ نووستن دەیفەرموو: ((سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە نان و ئاوی دەرخوارد داین و، بێنیازی كردین و، داڵدەی داین، ئاخۆ چەندەها كەس هەبێت كە كەس نییە بێنیازیان بكات و، داڵدەیان بدات)).

## ( ١١ ) ویردی دوای نوێژی بەیانی

١٨١٩ـ عَنْ جُوَيْرِيَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ، وَهِيَ فِي مَسْجِدِهَا، ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى وَهِيَ جَالِسَةٌ، فَقَالَ: ((مَا زِلْتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِي فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا)) قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ

أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ)). وفي رواية أخرى عنها قَالَ: ((سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ)).

(جويرية)(ﵝ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەیانی زوو، دوای ئەوەی نوێژی کرد، لەلای جویریەوە چووە دەرەوە هێشتا ئەو لەجێ‌نوێژەکەیدا بوو، لەکاتی چێشتەنگاودا گەڕایەوە، هێشتا جوەیریە لەسەر جێ‌نوێژەکەی مابوو، فەرمووی: ((هێشتا هەر لەسەر ئەو حاڵە ماوی کە من بەجێم هێشتی))، وتی: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((پاش ئەوەی تۆم بەجێهێشت چوار ووشەم سێ‌جار دوبارە کردۆتەوە، ئەگەر بکێشرێت لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە تۆ ئەمڕۆ لەبەیانیەوە وتووتە هاوسەنگی هەمووی دەبێت، پاك وبێ‌گەردی وسوپاس و ستایش بۆ خوا بە ئەندازەی ژمارەی دروست کراوەکانی و، ڕەزامەندی خۆی و، کێشی عەرشەکەی و مەرەکەبی وشەکان)) {لەڕیوایەتێکی تردا لەوەوە فەرمووی: ((پاك و بێگەردی بۆ خوا بە ژمارەی دروست کراوەکانی، پاك وبێگەردی بۆ خوا ئەوەندەی کە خۆی ڕازی دەبێت، پاك و بێگەردی بۆ خوا بەئەندازەی کێشی عەرشەکەی، پاك وبێگەردی بۆخوا بە ئەندازەی مەرەکەبی ووشەکانی))}.

١٨٢٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلَّا أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ: أَوْ زَادَ عَلَيْهِ)).

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەکەسێك سەرلەبەیانی، یا سەرلەئێوارە ، صەد جار بڵێت: پاك و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ خوا، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ کەس ناتوانێت باشتر بێنێت لەوەی کە ئەو هێناویەتی، مەگەر کەسێك وەك ئەوەی ئەوی وتبێت یا زیاتری وتبێت)).

## ( ١٢ ) خێری ( سبحان الله ) کردن

١٨٢١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ (ﷻ) : سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)). [بخاري/ الدعوات/ ٦٠٤٣]

(أبي هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((دوو وشە هەن سوکن لەسەر زمان قورسن لە شایان، خۆشەویستن لەلای خوای گەورە و میهرەبان: پاك و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ خوا، پاك و بێگەردی بۆ خواوەندی مەزن)).

١٨٢٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَأَنْ أَقُولَ سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ)).

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر بڵێم پاك و بێگەردی بۆ خوا، و سوپاس و ستایش بۆ خوا و، هیچ خواوەندێك نی‌یە شایانی پەرستن بێت جگە لە (الله)و، خوا لە هەموو گەورەیەك گەورەترە، لە هەموو ئەوەی کە خۆری لێ‌هەڵدێت لام خۆشەویستترە)).

## ( ١٣ ) دەربارەی ( لا اله الا الله ) کردن و ( الحمد لله ) و ( الله أكبر ) کردن

١٨٢٣ـ عَنْ مُوسَى الْجُهَنِيُّ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: عَلِّمْنِي كَلَامًا أَقُولُهُ. قَالَ: ((قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ)). قَالَ: فَهَؤُلَاءِ لِرَبِّي، فَمَا لِي؟ قَالَ: ((قُلْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي)). قَالَ مُوسَى: أَمَّا ((عَافِنِي)) فَأَنَا أَتَوَهَّمُ، وَمَا أَدْرِي.

(موسی)ی (الجهنی)، لە (مصعب) کوڕی (سعد)ەوە ئەویش لە باوکیەوە، دەڵێ: دەشتەکیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: شتێکم فێرکە کە بیڵێم. فەرمووی: ((بڵێ: هیچ شتێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە (الله) تەنها و بێ‌هاوەڵە، خوا لە هەموو گەورەیەك گەورەترە، گەورەیی هەر شایستەی ئەوە. سوپاس و ستایشی زۆر بۆ خوا، پاك و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، هیچ هێز و پێز و دەسەڵاتێك نی‌یە تەنها بۆخواوەندی دەسەڵاتدار و

دێنــە گــۆ شــایەتی لەســەر دەدەن لەســەرکردەوەکانی، ئەمــەیش بــۆ ئــەوەی بڕوبیانووی نەمێنێت، ئەمەیش دووڕووە، ئەو کەسەیە کە خوا خەشم و قینی لێهەڵدەگرێت.

## ( ١٦ ) شایەتیدانی ئەندامەکان

١٨٥٠ـ عَنْ أنس بْن مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رسُول اللَّه (ﷺ) فضَحك، فقال: ((هَلْ تَدْرُونَ ممَّ أَضْحَكُ)). قَالَ: قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ، يَقُولُ: يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ؟ قَالَ: يَقُولُ: بَلَى. قَالَ: فَيَقُولُ: فَإِنِّي لَا أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلَّا شَاهِدًا مِنِّي. قَالَ: فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيدًا، وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُودًا. قَالَ: فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ، فَيُقَالُ لِأَرْكَانِهِ: انْطِقِي. قَالَ: فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ. قَالَ: ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلَامِ، قَالَ: فَيَقُولُ: بُعْدًا لَكُنَّ وَسُحْقًا، فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ)).

(أنس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین (ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: ((دەزانن بەچی پێدەکەنم)) وتمان: خوا و پێغەمبەری خــوا زانــاترن. فــەرمووی: ((لــە وتووێــژی بــەندە لــە خزمــەت، پــەروەردگاریدا. دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئەی تۆمنت پــەنا نەداوە لەستەم؟ دەفەرمووێ: بەڵێ، دەڵێت: من ڕێگا نادەم بە شایەت بەسەرمەوە مەگەر لەخۆم بێت. دەفەرموێ: ئەمڕۆ خۆت بەسی کــە شــایەت بیــت بەسەرخۆتەوە، هــاورێ لەگــەڵ فریشــتە بەڕێزە نووسەرەکان)). ئیتر مۆر دەنرێت بەسەر دەمیدا، ئینجا بەئەندامەکانی دەوترێت: بێنە گۆ. ئینجا هــەموو دێنە گۆ بــەو کردەوانــەی کــە کردوویــەتی: دەفەرمووێ: پاشــان ڕێی پێدەدەن کــە قســە بکــات. دەڵــێ: تــەریك بــن و بچــن، خۆمن بۆ ئێوە تێدەکۆشام)).

## ( ١٧ ) ترسان لەخوای بالادەست و سزای سەختی

١٨٥١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ حَسَنَةً قَطُّ لِأَهْلِهِ، إِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ، ثُمَّ اذْرُوا نِصْفَهُ فِي الْبَرِّ وَنِصْفَهُ فِي الْبَحْرِ. فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لَا يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ. فَلَمَّا مَاتَ الرَّجُلُ فَعَلُوا مَا أَمَرَهُمْ، فَأَمَرَ اللَّهُ الْبَرَّ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، وَأَمَرَ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ. ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ يَا رَبِّ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ. فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٩٤]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((پیـاوێك کـە هەرگیز چاکەی لێنەوەشاوەتەوە بۆ خێزان و کەسوکارەکەی وتی: ئەگـەر مردم بمسوتێنن، پاشان خۆڵەمێشەکەم پرش و بڵاوبکەنەوە، نیوەی بەوشکانیدا و، نیوەکەی تریش بەناو دەریـادا، سوێند بە خـوا ئەگـەر خـوا تـەقدیری کردبێـت لەسەری، ئەوا سزایەکی ئەوتۆی دەدات کە هیچ کەس لەخەڵکی جیهانیانی ئاوا سزا نەدابێت. کاتێك پیاوەکە مرد ئەوەی فەرمانی پێکردبوون بۆیان کرد. خوا فـەرمانی کـرد بەوشـکانی چیتیـابوو [لـە ئـەندامانی ئـەو] کـۆی کـردەوە و، فەرمانی کرد بە دەریا چی تیابوو ئەویش کۆی کردەوە، پاشان فەرمووی: ((بۆ ئەوەت کرد؟ وتی: لەترسی تۆ ئەی پەروەردگار. خۆیشت زاناتری. خوایش لێی خۆشبوو)).

## ( ١٨ ) کەسێ گوناە بکات و پاشان داوای لێخۆش بوون بکات

١٨٥٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) -فِيما يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجلَّ- قَالَ: ((أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارك وَتعَالى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فقالَ تبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا، فعلمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ ربِّ، اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فقالَ تبارك وَتعالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ ويَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ)). قَالَ عَبْدُ الْأَعْلَى: لَا أَدْرِي أَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: ((اعْمَلْ مَا شِئْتَ)). [بخاري/ التوحيد/ ٧٠٦٨]

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) -لەوشتانەی کەلە پەروەردگاریەوە دەیگێرێتەوە- دەفەرمووێ: بەندەیەك گوناهێکی کرد ئینجا وتی: خوایـە لـە گوناهەکەم خۆش ببە، خوای بالادەست فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کـرد زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و، لەسەر گونـاه سزا دەدات. پاشان هەمدیسان گوناهێکی تری کردەوە وتی: ئەی پـەروەردگار لـە گوناهەکەم خۆش ببە، خوای بالادەست فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد، زانی پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و، سزادەدات لەسەر گوناه، پاشان سەر لەنوێ گوناهێکی تری کردەوە. هەمدیسان وتی: پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆش ببە. خوای بالادەستیش فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و سزای دەدات لەسەر گوناه، پاشان سەرلەنوێ گوناهێکی تری کردووە، هەمدیسان وتی: پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆشببە. خوای بالادەستیش فەرمووی: ((بەندکەم گونـاهێکی

کرد زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و سزا دەدات لەسەر گوناه چیدەکەیت بیکە ئەوا من لێت خۆشبووم)) (عبدالأعلی) دەڵێ: نازانم داخۆ لە جاری سێهەمدا یاچوارەمدا فەرمووی: ((چی دەکەیت بیکە)).

## (١٩) کەسێ تووشی گوناه ببێت و دەست نوێژ بگرێت و نوێژی فەرز بکات

١٨٥٣ـ عَنْ أَبي أُمَامَةَ (ﷺ) قالَ: بيْنَمَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) في المسْجد ونحْنُ قُعُودٌ مَعَهُ، إذْ جَاءَ رَجُلٌ فقال: يَا رَسُولَ اللَّه، إنِّي أَصَبْتُ حدًّا فأقمْهُ عليَّ. فَسَكت عَنْهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، ثُمَّ أَعادَ فقال: يا رَسُول الله، إنِّي أَصبْتُ حدًّا فأقمْهُ عليَّ، فَسَكَتَ عنْهُ، وأُقيمَت الصَّلاةُ، فلمَّا انْصرَفَ نَبيُّ اللَّه (ﷺ)، قالَ أَبُو أُمامةَ: فاتَّبع الرَّجُلُ رَسُولَ الله (ﷺ) حينَ انْصَرَفَ، واتَّبَعْتُ رسُولَ اللَّه (ﷺ) أنْظُرُ ما يَرُدُّ عَلى الرَّجُل، فَلَحقَ الرَّجُل رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فقالَ: يَا رَسُولَ اللَّه إنِّي أصبْتُ حدًّا فأقمْهُ عَلَيَّ. قالَ أَبُو أُمامةَ: فقالَ لهُ رسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أرأيْت حينَ خرجْتَ منْ بيْتك أليْسَ قَدْ تَوَضَّأْتَ فَأَحْسَنْتَ الْوُضُوءَ)). قال: بلَى يا رسُولَ اللَّه، قالَ: ((ثُمَّ شهدْتَ الصَّلَاةَ معَنَا)). فقالَ: نعمْ يا رَسُول اللَّه، قال: فقالَ لهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((فإنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لكَ حدَّكَ. أوْ قالَ: ذَنْبَكَ)).

(أبو أمامة) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمزگەوتا بوو، ئێمەیش لە خزمەتیدا دانیشتبووین، پیاوێك هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من شایستەی سزای گوناهێك بووم لەسەرمی جێبەجێ بکە، پێغەمبەریش (ﷺ) لێی، بێدەنگ بوو. پاشان دووبارەی کردەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من شایستەی سزای گوناهێك بووم جێبەجێی بکە لەسەرم، هەر لێی بێدەنگ بوو، نوێژ دابەسترا، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێبوویەوە و ڕۆیشت، پیاوەکە شوێنی کەوت. منیش شوێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتم تا بزانم چ وەڵامێکی پیاوەکە دەداتەوە، پیاوەکە گەیشت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شایستەی سزای گوناهێك بووم، جێبەجێی بکە لەسەرم. (أبو امامە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((باشە کاتێك لەماڵەکەت دەرچوویت بەجوانی دەست نوێژت نەگرت)). وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((لەدوایدا ئامادەی نوێژ بوویت لەگەڵمان)) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((دە خوا لە سزای گوناهەکەت خۆش بوو)) یا فەرمووی: ((لە گوناهەکەت)).

# (٦٢) بەشی دووڕووەکان (المنافقين)

## (١) دەربارەی فەرموودەی خوا (إذا جاء المنافقون)

١٨٥٤ـ عَنْ زَيْدَ ابْنَ أَرْقَمَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فِي سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيّ لِأَصْحَابِهِ: ﴿لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا﴾ مِنْ حَوْلِهِ. قَالَ زُهَيْرٌ: وَهِيَ قِرَاءَةُ مَنْ خَفَضَ حَوْلَهُ. وَقَالَ: ﴿لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾ قَالَ :فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ بِذَلِكَ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيّ فَسَأَلَهُ، فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ مَا فَعَلَ، فَقَالَ: كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللَّه (ﷺ). قَالَ: فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِمَّا قَالُوهُ شِدَّةٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ تَصْدِيقِي ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ﴾ قَالَ: ثُمَّ دَعَاهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ. قَالَ: فَلَوَّوْا رُءُوسَهُمْ، و قَوْلِهِ: ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾. وَقَالَ: كَانُوا رِجَالًا أَجْمَلَ شَيْءٍ. [بخاري/ التفسير/ ٤٦١٧، ٤٦٢١]

(زيد)ی کوڕی (ارقم) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دەرچووین بۆ جەنگێك کە تێیدا تووشی سەختی و فەلاکەت هاتن (عبدالله)ی کوڕی (ابي) بەهاوەڵەکانی وت: (لا تنفقوا على من عند رسول الله حتى ينفضوا) واتە: سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کەلەدەوری پێغەمبەری خوادان هەتا بلاوەی لێبکەن. هەروەها وتی: (لئن رجعنا الى المدينة ليخرجن الاعز منها الاذل) واتە: گەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێت ئەوەی بەڕێز و پیاوماقوڵە بێڕێز و بێدەسەلات لەشار دەربکەن، دەڵێ: منیش هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) خەبەرم دایە بەوەی کە (عبدالله) وتی: ئەویش ناردی بە شوێن (عبدالله)ی کوڕی (ابی)دا پرسیاری لێکرد، ئەویش سوێندی قوورسی خوارد کە نەیوتووە. وترا (زید) درۆی لەگەڵ پێغەمبەر کرد (ﷺ) دەڵێ: توشی زەحمەت بووم لەوەی خەڵکی وتیان. تاوەکو خوای بالادەست ڕاست گۆیی منی سەلماند. (إذا جاءك المنافقون) دەڵێ: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردن تا داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکا، ئەوانیش سەربادەدەن و لوت بەرزی دەکەن، هەروەك لەبارەی ئایەتی ﴿كأنهم خشب مسندة﴾ واتە: ﴿ هەر دەڵێی داری بەدیوارا هەڵپەسێراون ﴾. زيد وتی: ئەوانە پیاوانێکی بە ڕواڵەت قۆز و پێکەوتوبوون.

## ( ٢ ) دوڕووەكان پشت لە پێغەمبەر (ﷺ) دەكەن

١٨٥٥ـ عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قالَ: قالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ يَصْعَدُ الثَّنِيَّةَ ثَنِيَّةَ الْمُرارِ؟ فَإِنَّهُ يُحَطُّ عَنْهُ ما حُطَّ عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ)). قَالَ: فكان أوَّلَ مَنْ صَعِدَهَا خَيْلُنَا خَيْلُ بَنِي الْخَزْرَجِ، ثُمَّ تَتَامَّ النَّاسُ، فقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَكُلُّكُمْ مَغْفُورٌ لهُ إِلَّا صَاحِبَ الْجَمَلِ الْأَحْمَرِ)). فأتَيْنَاهُ فقُلْنَا: لهُ تعالَ يَسْتَغْفِرْ لكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: وَاللَّهِ لأَنْ أَجِدَ ضَالَّتِي أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لِي صَاحِبُكُمْ. قَالَ: وَكَانَ رَجُلٌ يَنْشُدُ ضَالَّةً لَهُ.

(جابر)ی كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((كێ دەتوانێ سەركەوێتە سەر دەربەندەكە، دەربەندی مورار؟ ئەوە ئەو كەسە گوناهی لێهەڵدەوەرێت وەك چۆن لە نەوەی ئیسرائیل هەڵدەوەرێ)). دەڵێ: یەكەمین كەسێك سەركەوتەسەری ئەسپەكانی ئێمە بوون، ئەسپی تیرەی خەزرەج، پاشان خەڵكی بەشوێنماندا هاتن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هەمووتان لێخۆشبوون مەگەر خاوەنی وشترە سورەكە[1])) ئێمەیش هاتین بۆ لای وتمان: وەرە با پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێخۆش بونت بۆ بكات، وتی: بەخوا ئەگەر ئەوەی لێم ون بووە بیدۆزمەوە لام خۆشترە لەوەی كە هاوەڵەكەتان داوای لێخۆشبونم بۆ بكات. دەڵێ: ئەو پیاوە بەدوای شتێكی ونبوویدا دەگەڕا.

## ( ٣ ) دەربارەی ناونیشانی دووڕووەكان

١٨٥٦ـ عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: قُلْنَا لِعَمَّارٍ: أَرَأَيْتَ قِتَالَكُمْ، أَرَأْيًا رَأَيْتُمُوهُ فَإِنَّ الرَّأْيَ يُخْطِئُ وَيُصِيبُ، أَوْ عَهْدًا عَهِدَهُ إِلَيْكُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فقالَ: مَا عَهِدَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) شَيْئًا لَمْ يَعْهَدْهُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً. وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ فِي أُمَّتِي...)). قَالَ شُعْبَةُ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: حَدَّثَنِي حُذَيْفَةُ. وَقَالَ غُنْدَرٌ: أُرَاهُ قَالَ: ((فِي أُمَّتِي اثْنَا عَشَرَ مُنَافِقًا لَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، وَلَا يَجِدُونَ رِيحَهَا حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ، ثَمَانِيَةٌ مِنْهُمْ تَكْفِيكَهُمُ الدُّبَيْلَةُ: سِرَاجٌ مِنَ النَّارِ يَظْهَرُ فِي أَكْتَافِهِمْ حَتَّى يَنْجُمَ مِنْ صُدُورِهِمْ)).

(قیس)ی كوڕی (عباد) دەڵێ: بە (عمار)م وت: باشە پێم بڵێ ئەم جەنگەی دەستان داوەتێ ، ئایا لەسەر ڕاو بۆچوونی خۆتانە، چونكە ڕاوبۆچوون

---

[1] كەناوی جدی كوڕی قەیس بووە و دوو ڕوو بووە.

(إجتهاد) جاریوا هەیە بەهەڵەدا دەچێت و، جاری وایش هەیە دەیپێكێت، یاخود ئەمە لەسەر وەسیەتێكە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی بەجێهێشتوون؟ وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ وەسیەتێكی بۆ نەكردووین كە بۆ خەڵكی بەگشتی نەكردبێت، ئینجا وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بێگومان لەناو ئوممەتەكەمدا..)) (شعبە) دەڵێ: وابزانم وتی: (حذیفة) قسەی بۆ كردم، (غندر)یش وتی: لام وایە، فەرمووی: ((لەناو ئومەتەكەمدا دوانزە دووڕوو هەیە ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناكەن تاوەكو حووشتر دەچێت بەكونی دەرزیدا، هەشت لەوان {دوبەیلەت} بەسە بۆ یان {دوبەیلەت: گرێكی ئاگرە لە شانیانەوە دەست پێدەكات لە سنگیانەوە دێتە دەروە}.

## ( ٤ ) دەربارەی دووڕووەكان لە شەوی ( عەقەبە * ) دا و ژمارەیان

١٨٥٧ـ عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: كَانَ بَيْنَ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْعَقَبَةِ وَبَيْنَ حُذَيْفَةَ بَعْضُ مَا يَكُونُ بَيْنَ النَّاسِ، فَقَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، كَمْ كَانَ أَصْحَابُ الْعَقَبَةِ؟ قَالَ: فَقَالَ لَهُ الْقَوْمُ: أَخْبِرْهُ إِذْ سَأَلَكَ. قَالَ: كُنَّا نُخْبَرُ أَنَّهُمْ أَرْبَعَةَ عَشَرَ، فَإِنْ كُنْتَ مِنْهُمْ فَقَدْ كَانَ الْقَوْمُ خَمْسَةَ عَشَرَ، وَأَشْهَدُ بِاللَّهِ أَنَّ اثْنَيْ عَشَرَ مِنْهُمْ حَرْبٌ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ، وَعَذَرَ ثَلَاثَةً، قَالُوا: مَا سَمِعْنَا مُنَادِيَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَلَا عَلِمْنَا بِمَا أَرَادَ الْقَوْمُ، وَقَدْ كَانَ فِي حَرَّةٍ فَمَشَى فَقَالَ: ((إِنَّ الْمَاءَ قَلِيلٌ، فَلَا يَسْبِقْنِي إِلَيْهِ أَحَدٌ)). فَوَجَدَ قَوْمًا قَدْ سَبَقُوهُ فَلَعَنَهُمْ يَوْمَئِذٍ.

(أبي طفیل) دەڵێ: لەنێوان پیاوێك لەبەشداربووانی (عەقەبە) و (حذیفة)دا هەندێك ناكۆكی هەبوو كەلەنێوان كەسانی تردا ڕوودەدات، (حذیفة) وتی: تو خوا ڕاست پێم بڵێ، هاوەڵانی شەوی (عەقەبە) چەند كەس بوون؟ دەڵێ: هەندێ لە ئامادەبوان پێیان وت: كە پرسیاری لێكردووی وەڵامی بدەرەوە، ئەویش وتی: ئێمە خەبەرمان واپێدراوە كە چواردەكەس بوون، ئەگەر تۆیش لەوانی ئەوا دەبنە پانزە، شایەتی دەدەم بەخوا كە دوانزەیان دوژمنی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بوون لە ژیانی دونیا و، لەوڕۆژەیشدا كە پێغەمبەران شایەتی دەدەن

* مەبەست لە (عەقەبە) عەقەبەی ڕێگای تەبووكە كە كۆمەڵێك لە منافقەكان. كۆبوونەوە و نیازیان خراپ بوو بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) خوا پاراستی لێیان ئەو سێ كەسەیش كە عەفوی كردن بەنەزانی كەوتبوونە ناویان.

لەسەر ئومەتەکانیان، پێغەمبەر (ﷺ) بیانووی سیانیانی وەرگرت کەوتیان ئێمە گوێمان لە جارچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبووە و، نەیشمان زانی ئەم کۆمەڵە نیازیان چیبووە، لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) لەبەردەلانێکدا بوو فەرمووی: ((ئاوەکە کەمە کەس پێش من نەچێتە سەری)) کەچی بینی کۆمەڵێك پێشی کەوتبوون، بۆیە نەفرینی لێکردن لەو ڕۆژەدا.

## ( ٥ ) نموونەی دوڕوو وەك مەڕی وێڵ وایە لەنێوان دوو ڕاندا

١٨٥٨ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: مثَلُ الْمُنافِقِ كمثلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ، تَعِيرُ إِلَى هذهِ مرَّةً وإلى هذه مرَّة)).

(ابن عمر) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((وێنەی دووڕوو وەك وێنەی مەڕی وێڵی نێوان دووڕانە مەڕ وەهایە، جارێك هاوگەلەی ئەم لادەبێت و جارێك هاوگەلەی ئەولا)).

## ( ٦ ) ناردنی گێژەڵووکە بۆ لەناوبردنی دووڕوو

١٨٥٩ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللّه (ﷺ) قَدِمَ مِنْ سفرٍ، فلمّا كان قُرْبَ الْمَدِينَةِ هَاجَتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ تَكَادُ أَنْ تَدْفِنَ الرَّاكِبَ، فزعمَ أَنَّ رَسُولَ اللّه (ﷺ) قَالَ: ((بُعِثَتْ هَذِهِ الرِّيحُ لِمَوْتِ مُنَافِقٍ)). فَلَمَّا قَدِمَ الْمدينَـةَ فإذا مُنافِقٌ عظيمٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ قَدْ مَاتَ.

(جابر) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەفەرێك هاتەوە، کاتێ نزیکی (مەدینە) بوویەوە گێژەڵووکەیەکی سەخت هەڵی کرد. لەوانەبوو کە سوار سەرنگوم بکات، (جابر) وا گومانی برد لەوکاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەم بایە بۆ لەناوبردنی دووڕوویەك نێرراوە)) کاتێ هاتەوە مەدینە سەیردەکات وا گەورە پیاوێك لە دووڕووەکان مردووە.

## ( ٧ ) سەختیی سزای دووڕوو لە ڕۆژی قیامەتدا

١٨٦٠ـ عَنْ سلمة بن الأكوع (ﷺ) قَالَ: عُدْنَا مَعَ رَسُولِ اللّه (ﷺ) رجُلًا مَوْعُوكًا، قَالَ: فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَيْهِ فَقُلْتُ: وَاللّه ما رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ رَجُلًا أشدّ حرًا. فَقَالَ نَبِيُّ اللّه (ﷺ): ((أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَشَدَّ حَرًّا مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامةِ؟ هَذَيْنك الرَّجُلَيْنِ الرَّاكِبَيْنِ الْمُقَفِّيَيْنِ)) لِرَجُلَيْنِ حِينَئِذٍ مِنْ أَصْحَابِهِ.

(سلمة)ی کوڕی (الأكوع)(ﷺ) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) سەردانی پیاوێکی تادارمان کرد، دەڵێ: منیش دەستم لەسەری دانا و وتم:

بەخوا كەسم نەدیووە گەرمتر بێت لەم پیاوەی ئەمڕۆ. پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا ئاگادارتـان بكـەم كـێ گـەرمترە لـەو لـە ڕۆژی قیامـەتدا؟ ئـەو دووپیـــاوە ســـوارەی كەپشـــتیان هـــەڵكرد)). دوو پیـــاوبوون لـــە ڕیـــزی هاوەڵاندابوون.

## ( ٨ ) زەوی دووڕوو فڕێ دەدات

١٨٦١ـ عنْ أنس بْن مالك (ﭬ) قال: كان منّا رجُلٌ منْ بني النّجّار، قدْ قرأ الْبقرة وآل عمْران، وكان يكْتُبُ لرسُول اللّه (ﷺ)، فانْطلق هاربا حتّى لحق بأهْل الْكتاب، قال: فرفعُوهُ. قالُوا: هذا قدْ كان يكْتُبُ لمُحمّد (ﷺ)، فأُعْجبُوا به، فما لبث أنْ قصم اللّهُ عُنُقهُ فيهمْ، فحفرُوا لهُ فواروْهُ، فأصْبحت الْأرْضُ قدْ نبذتْهُ على وجْهها، ثُمّ عادُوا فحفرُوا لهُ فواروْهُ، فأصْبحت الْأرْضُ قدْ نبذتْهُ على وجْهها، ثُمّ عادُوا فحفرُوا لهُ فواروْهُ، فأصْبحت الْـأرْضُ قـدْ نبذتْـهُ علـى وجْهـها، فـتركُوهُ منْبُوذا. [بخاري المناقب ٣٤٢١]

(أنــس)ی كـوڕی (مـالك) دەڵـێ: پیاوێكمـان تیـابوو لـە تـیرەی (النجـار) و {سورەتی} ی (البقرة) و (آل‌عمـران)ی خوێنـد بـوو، نووسـەری پێغەمبـەری خـوا بوو (ﷺ) ، كەچی ڕایكردوو بۆی دەرچوو، تا خۆی گەیاندە گاور و جولەكەكان، دەڵێ: {ئـەوانیش ڕێزیـان لێگـرت وتیـان: ئەمـە نووسـەری (محمـد) بـووە و زۆر سەرسام بوون پێی، كەچی ئەمەندەی پێنەچوو خوا ملی شكاند} چاڵیـان بۆ هەڵكەند و شاردیانەوە، كەچی بۆ بەیانی زەوی دەمەوڕوو فڕێی دابووە دەرێ. دیسـان سەرلەنوێ چاڵیان بۆ هەڵكەند وشاردیانەوە، كەچی بۆ بـەیانی زەوی دەمـەو ڕوو فڕێی‌دابوویـەوە دەرێ. پاشان هەمدیسان چاڵیـان بـۆ هەڵكـەندەوە، كەچی بۆ بەیانی زەوی هەمدیسان دەمەو ڕوو فـڕێی دابوویـەوە دەرێ، ئیـتر بە فڕێدراوی وازیان لێهێنا.

## (٦٣) ڕۆژی قیامەت

### (١) خوا زەوی دەپێچێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا

### ﴿والسموات مطويات بيمينه﴾

١٨٦٢. عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنُ عُمَرَ (ﷺ) قال: قَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((يطْوِي اللّهُ عزّ وجلّ السّماوَاتِ يَوْمَ الْقِيامَةِ، ثُمّ يَأْخُذُهُنّ بيَدِهِ الْيُمْنَى، ثُمّ يَقُولُ: أنا الْمَلِكُ، أيْنَ الْجَبّارُونَ؟ أيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟ ثُمّ يَطْوِي الْأَرَضِينَ بِشِمَالِهِ ثُمّ يَقُولُ: أنَا الْمَلِكُ، أيْنَ الْجَبّارُونَ؟ أيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ)). [بخاري/ التوحيد/ ٦٩٧٧]

(ابن عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوای بالا دەست لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان دەپێچێتەوە، پاشان بەدەستی ڕاستی ڕایان دەگرێت، ئینجا دەفەرمووێ: منم پادشا، دەسەلاتدارە بەزەبرەکان لە کوێن؟ خۆبەزلزانەکان لە کوێن؟ پاشان زەویش بەدەستی چەپی دەپێچێتەوە و، دەفەرمووێ: منم پادشا، دەسەلاتدارە بەزەبرەکان لە کوێن؟ خۆ بەزلزانەکان لەکوێن؟.

### (٢) شێوەی زەوی لە ڕۆژی قیامەتدا

١٨٦٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيامَةِ عَلى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ، كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ، لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لِأَحَدٍ)). [بخاري الرقاق. ٦١٥٦]

(سهل)ی کوڕی (سعد) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوە لەسەر زەوییەکی سپی خاکیی، وەك کولێرەیەکی دروست کراو لە ئاردێکی بێژراوە نیشان کردی تێدا نییە بۆ هیچ کەسێك)).

### (٣) هەموو کەس لەسەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەکرێتەوە کە لەسەری مردووە

١٨٦٤- عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قال: سَمِعْتُ النَّبِيّ (ﷺ) يقُولُ: ((يُبْعَثُ كُلّ عَبْدٍ عَلى مَا مَاتَ عَلَيْهِ)).

(جابر)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست کە دەیفەرموو: ((هەموو کەس لەسەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەکرێتەوە کەلە سەری مردووە)).

## (٤) زیندوو بوونەوە لەسەر کاروکردەوەکان

١٨٦٥ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ)). [بخاري/ الفتن/ ٦٦٩١]

(عبدالله)ی کوڕی (عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست، کەدەیفەرموو: ((هەر کاتێك خوا ویستی سزای هۆزێك بدات، سزاکە تووشی ئەو پیاوە چاکانەش دەبێت کەلەنێوانیاندان، پاشان خوا هەریەکەیان لەسەر کاروکردەوەی خۆیان زیندوو دەکاتەوە)).

## (٥) خەڵکی بە پێی پەتی و ڕووت و قووتی و خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن

١٨٦٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا)). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، النِّسَاءُ وَالرِّجَالُ جَمِيعًا يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَ (ﷺ): ((يَا عَائِشَةُ، الْأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٦٢]

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست کە دەیفەرموو: ((خەڵکی لە رۆژی قیامەتدا بەپێی پەتی و ڕووت و قووتی و خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ژنان و پیاوان هەموو لەناویەکدا هەندێکیان تەماشای هەندێکیان دەکەن؟ ئەویش (ﷺ) فەرمووی: ((کارەکە لەوە سەختترە کە هەندێکیان تەماشای هەندێکیان بکەن)).

## (٦) خەڵکی لەسەر چەند حاڵەتێك کۆدەکرێنەوە[1]

١٨٦٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلَاثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ، رَاهِبِينَ، وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلَاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ. وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا: وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٥٧٤]

[1] مەبەست کۆکردنەوەی دنیایە پێش فووکردنی یەکەم بە کەڕەنادا.

(ابي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خەڵکی لەسەر سێ حاڵەت کۆدەکرێتەوە: هەیانە لە دڵ خۆشە، هەیانە لە ترسولەرزدایە، دووان لە سەر وشترێك و، سیان لەسەر وشترێك و، چوار لەسەر وشترێك، و دەلەسەر وشترێك، ئینجا ئەوانی تریان ئاگر کۆیاندەکاتەوە، شەویان لەگەڵ دەکاتەوە لە هەر کوێ شەو بکەنەوەو، نیوەڕۆ خەویان لەگەڵ دەکات لە هەرکوێ نیوەڕۆ خەوبکەن و، ڕۆژیان لەگەڵ دەکاتەوە لەهەر کوێ ڕۆژ بکەنەوە، ئێوارەیان لەگەڵ دەکاتەوە لەهەر کوێ ئێوارە بکەنەوە)).

## ( ٧ ) کافر لەسەر ڕوومەتی کۆدەکرێتەوە

١٨٦٨- عَنْ أَنَسُ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: ((أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى رِجْلَيْهِ فِي الدُّنْيَا قَادِرًا [عَلَى] أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا. [بخاري/ الرقاق/ ٦١٥٨]

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بێ باوەڕ چۆن لەسەر ڕوومەتی کۆدەکرێتەوە؟ فەرمووی: ((ئەی ئەو کەسەی لە دونیادا لەسەر هەردوو قاچی توانای ڕۆشتنی پێداوە، ناتوانێت توانای ڕۆشتنی پێ بدات لەسەر ڕوومەتی لە ڕۆژی قیامەتدا)). (قتادە)) وتی: بەڵێ سوێند بە بەرز و بڵندی پەروەردگار.

## ( ٨ ) نزیك بوونەوەی خۆر لە خەڵك لە ڕۆژی قیامەتدا

١٨٦٩- عَنْ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي الْمِقْدَادُ بْنُ الْأَسْوَدِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْخَلْقِ، حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ)). قَالَ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ: فَوَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا يَعْنِي بِالْمِيلِ، أَمَسَافَةَ الْأَرْضِ أَمِ الْمِيلَ الَّذِي تُكْتَحَلُ بِهِ الْعَيْنُ. قَالَ: ((فَيَكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ فِي الْعَرَقِ: فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى كَعْبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى حَقْوَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ الْعَرَقُ إِلْجَامًا)). قَالَ: وَأَشَارَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ.

(سلیم)ی کوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: (مقداد) ی کوڕی (اسود) بۆی گێڕاینەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((لە ڕۆژی قیامەتدا خۆر لە خەڵکی نزیك دەبێتەوە تا بەئەندازەی میلێکی دەمێنێ بۆیان)) (سلیم)ی

کوڕی (عامر) دەڵێ: بەخوا نازانم مەبەستی لە (میل)چیەو، ئایا پێوەری زەوییە یا خود ئەو میلەیەکە چاوی پێ دەرێژێت. دەڵێ: ((خەڵکی [هەریەکەیان] بەپێی کار و کردەوەیان دەچەقن لەناو ئارەقدا، هەیانە تا قوولەپێی دەبێت و، هەشیانە تا هەردوو ئەژنۆی و، هەشیانە تا پشتێنەی و، هەشیانە عەرەق تەواو لغاوی دەکات)) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەدەست ئاماژەی کرد بۆ دەمی.

## (٩) لەبارەی زۆریی عەرەق کردنەوە لە رۆژی قیامەتدا

١٨٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الْعَرَقَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيَذْهَبُ فِي الْأَرْضِ سَبْعِينَ بَاعًا، وَإِنَّهُ لَيَبْلُغُ إِلَى أَفْوَاهِ النَّاسِ. أَوْ: إِلَى آذَانِهِمْ)). يَشُكُّ ثَوْرٌ أَيَّهُمَا قَالَ. [بخاري/ الرقاق/ ٦١٦٧]

(ابو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لە رۆژی قیامەتدا ئارەق حەفتا باڵ رۆدەچێت بەزەویدا و تا دەمی خەڵکیش دێت. یاخود تا گوێچکەیان)) (ثور) دودڵە کامیانی فەرموو.

## (١٠) بێباوەڕ (فدیە) بدات بۆ رزگار بوون لە رۆژی قیامەتدا

١٨٧١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا: لَوْ كَانَتْ لَكَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، أَكُنْتَ مُفْتَدِيًا بِهَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هَذَا وَأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ: أَنْ لَا تُشْرِكَ -أَحْسِبُهُ قَالَ:- وَلَا أُدْخِلَكَ النَّارَ، فَأَبَيْتَ إِلَّا الشِّرْكَ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٣١٥٦]

(انس) کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوای بەرز و باڵادەست دەفەرموێ بەسووك ترین ئەهلی ئاگر لە سزادا باشە ئەگەر دونیا و هەموو ئەوەی لە دونیادایە هی تۆ بوایە، ئایا لە تۆڵەی {رزگار} بوونی خۆتدا دەتدا؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، دەفەرمووێت: من لەوە سووك ترم لێداواکردیت لە کاتێکدا تۆ لەپشتی ئادەمدا بووی: کە شەریك بۆ خوا دانەنێیت- وابزانم فەرمووی: منیش نەتخەمە ناو ئاگرەوە، بەڵام تۆ جگە لە هاوەڵ دانان بۆ خوا هیچت نەویست)).

# (٦٤) بەشی بەهەشت

## ( ١ ) یەکەم کۆمەڵ کە دەچێتە بەهەشتەوە

١٨٧٢ـ عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: إِمَّا تَفَاخَرُوا، وَإِمَّا تَذَاكَرُوا: الرِّجَالُ فِي الْجَنَّةِ أَكْثَرُ أَم النِّسَاءُ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَوَ لَمْ يَقُلْ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ): ((إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، وَالَّتِي تَلِيهَا عَلَى أَضْوَإِ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ اثْنَتَانِ، يُرَى مُخُّ سُوقِهِمَا مِنْ وَرَاءِ اللَّحْمِ. وما فِي الْجَنَّةِ أَعْزَبُ)). [بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٧٣]

(محمد) دەڵێ:: {خەڵکی} یاشانازیان کرد یا باسیان کرد: ئایا پیاوان لەبەهەشتا زۆرترن یا ژنان؟ (أبو هريره) (ﷺ) وتی: ئەی (أبو القاسم)(ﷺ) نەیفەرمووە: ((یەکەمین دەستە کە دەچنە بەهەشتەوە لەسەرشێوەی مانگی چواردەن، دەستەی دوای ئەوانیش لەسەر شێوەی درەخشانترین ئەستێرەی درەوشاوەن لە ئاسماندا، هەر پیاوێك لەوان دوو ژنی هەیە، مۆخی لاقیان لەودیوی گۆشتەکەوە دیارە، لەبەهەشتا رەبەن نییە)).

١٨٧٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ نَجْمٍ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، ثُمَّ هُمْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنَازِلُ، لَا يَتَغَوَّطُونَ وَلَا يَبُولُونَ. ولا يمتخطون وَلَا يَبْزُقُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَمَجَامِرُهُمُ الْأَلُوَّةُ، وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، أَخْلَاقُهُمْ عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى طُولِ أَبِيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِرَاعًا)). قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: ((على خُلُقِ رَجُلٍ)). و قَالَ أَبُو كُرَيْبٍ: ((عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ)). و قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: ((عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ)). [بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٧٤]

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((یەکەمین کۆمەڵ لە ئوممەتم کە دەچنە بەهەشتەوە، لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، لەپاشان ئەوانەی لە دوایانەوە دێن لەسەر شێوەی پرشنگدارترین ئەستێرەن لە ئاسمانا، ئەوانەی دوای ئەوانیش چەند پلەیەکن، نەمیز دەکەن و نە پیسایی و، نە چڵمیان هەیە و نەبەڵغەم، شانەیان لە زێرە و، بخوردانیان دار عودە، ئارەقیان میسکە، خووڕەوشتیان یەك خووڕەوشتە لەسەر باڵای باوکە ئادەمیان شەست گەزن)).

## ( ٢ ) هەموو كەس لەسەر شێوەی ئادەم دەچێتە بەهەشت

١٨٧٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، فَلَمَّا خَلَقَهُ قَالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ النَّفَرِ، وَهُمْ نَفَرٌ مِنَ الْمَلَائِكَةِ جُلُوسٌ، فَاسْتَمِعْ مَا يُجِيبُونَكَ، فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ. قَالَ: فَذَهَبَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، قَالَ: فَزَادُوهُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ قَالَ فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ (ﷺ)، وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، فَلَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدَهُ حَتَّى الْآنَ)). [بخاري/ الاستئذان ٥٨٧٣]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوای باڵا دەست ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست كردووە، درێژییەكەی شەست باڵ بووە كاتێ دروستی كرد فەرمووی: برۆ سەلام بكە لەسەر ئەو چەند كەسە، كە چەند كەسێك بوون لە فریشتە دانیشتبوون. گوێ بگرە بزانە چۆن سڵاوت دەستێننەوە، چونكە ئەوە دەبێت بە سڵاوی خۆت و سڵاوی نەوەكانت. ئینجا رۆیشت و وتی: سەلامتان لسەربێت. ئەوانیش وتیان: سەلام و رەحمەتی خوا لەسەر تۆیش، دەفەرموێت: (رەحمەتی خوا)یان لێزیادكرد. هەركەسێك دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە سەلامی خوای لەسەر بێت كە شەست باڵ باڵای بەرز بووە، ئیتر دوای ئەو خەڵك بەرەو كورت بوون هاتوون هەتا ئیستا)).

## ( ٣ ) كۆمەڵێك دەچنە بەهەشتەوە دڵیان وەك دڵی باڵندەوایە

١٨٧٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلُ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ)).

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((كۆمەڵێك دەچنە بەهەشتەوە دڵیان وەك دڵی باڵندەوایە)).

## ( ٤ ) رازی بوونی خوا لە خەڵكی بەهەشت

١٨٧٦ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لِأَهْلِ الْجَنَّةِ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ. فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لَا نَرْضَى يَا رَبِّ وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَلَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُونَ: يَا رَبِّ، وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي، فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا)).
[بخاري/ الرقاق/ ٦١٨٣]

(ابو سعید)ی (الخدري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خـوای باڵادەست بەبەهەشتیەکان دەفەرموێت: ئەی بەهەشتیەکان ئەوانیش دەڵێن: ئێمە ملکەچ و گوێڕایەڵی تۆین ئەی پەروەردگار، هەموو خێر و بێرێك لەدەستی تۆدایە. دەفەرموویێت: ڕازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن پەروەرگار داخۆ بۆچ ڕازی نابین، لەکاتێکدا تۆ ئەمەندەت پێ خەڵات کردووین، کە بەهیچ کام لە دروست کراوەکانی خۆتت خەڵات نەکردووە، دەفەرموویێت: ئەی باشتر لەوەتان پێنەدەم؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگار دەبێت باشتر لەوە چی بێت؟ ئەویش دەفەرموویێت: شایشتەی ڕەزامەندی خۆمتان دەکەم لەمەولا هەرگیز لێتان زویر نابم)).

## ( ٥ ) بەهەشتیەکان لەگەڵ خاوەن پلەوپایە گەورەکانی بەهەشت یەکتر دەبینن

١٨٧٧ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ مِنَ الْأُفُقِ مِنَ الْمَشْرِقِ أَوِ الْمَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ)). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تِلْكَ مَنَازِلُ الْأَنْبِيَاءِ، لَا يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: ((بَلَى وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ)). [بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٨٣]

(ابو سعید الخدري) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەهەشتیەکان باڵە خانە نشینەکانی سەرو خۆیان دەبینن. {هەروەك چۆن ئێوە ئەو ئەستێرە درەوشاوە دەبینن کە لە ئاسۆی خۆر هەڵات بەرەو ئاوابوون دەچێت، لەبەر بەرزوبڵندی پلەی ئەوان لە مانیتر. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): ئەمە پلەوپایەی پێغەمبەرانە جگە لەوان کەس پێی ناگات؟ فەرمووی: ((بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە پیاوانێکن باوەڕیان بەخوا هێناوەو پێغەمبەرانیان بەڕاست زانیووە {پێیان دەگەن}.

## ( ٦ ) خۆراکی بەهەشتیەکان

١٨٧٨ـ عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ): ((يَأْكُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ، وَلَا يَتَغَوَّطُونَ، وَلَا يَمْتَخِطُونَ، وَلَا يَبُولُونَ، وَلَكِنْ طَعَامُهُمْ ذَاكَ جُشَاءٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ، يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالْحَمْدَ كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ)).

(جـابر)کـوڕی (عبـدالله) (ﭬ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بەردەوام بەهەشتیەکان لەبەهەشتا دەخۆن و دەخۆنەوە، نە پیسایی دەکەن نە چڵمیان هەیە و، نەمیز دەکەن، بەڵکو پاشەڕۆکی خواردنیان جۆرە قرقێنەیەکە بۆنی هەر لە بۆنی میسك دەچێت. سوپاس و ستایشی خوا دەکەن وەك چۆن ئێوە هەناسە دەدەن)).

## (٧) دیاریی بەهەشتیەکان

١٨٧٩ـ عَنْ ثَوْبَان (ﭬ) مَوْلَى رَسُول اللَّه (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ قَائمًا عنْدَ رَسُول اللَّه (ﷺ)، فَجَاءَ حبْرٌ منْ أَحْبَار الْيَهُود، فقَال: السَّلَامُ عَلَيْكَ يا مُحَمَّدُ، فَدَفَعْتُهُ دَفْعَةً كَادَ يُصْرَعُ منْهَا، فَقَالَ: لمَ تَدْفَعُني؟ فَقُلْتُ: أَلَا تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّه؟ فقَالَ الْيَهُوديُّ: إنَّمَا نَدْعُوهُ باسْمه الَّذي سَمَّاهُ به أَهْلُهُ. فقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إنَّ اسْمي مُحَمَّدٌ الَّذي سَمَّاني به أَهْلي)). فقَالَ الْيَهُوديُّ: جئْتُ أَسْأَلُك، فقَال لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أَيَنْفَعُكَ شَيْءٌ إنْ حَدَّثْتُك)). قَالَ: أَسْمَعُ بأُذُنَيَّ، فَنكَتَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بعُودٍ مَعَهُ، فَقَالَ: ((سَلْ)). فَقَالَ الْيَهُوديُّ: أَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْض وَالسَّمَوَاتُ؟ فقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((هُمْ في الظُّلْمَة دُونَ الْجسْر)) قَالَ: فَمَنْ أَوَّلُ النَّاس إجَازَةً؟ قَالَ: ((فُقَرَاءُ الْمُهَاجرينَ)). قَالَ الْيَهُوديُّ: فَمَا تُحْفَتُهُمْ حينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: ((زيَادَةُ كَبد النُّون)). قَالَ: فَمَا غذَاؤُهُمْ عَلَى إثْرهَا؟ قَالَ: ((يُنْحَرُ لَهُمْ ثَوْرُ الْجَنَّة الَّذي كَانَ يَأْكُلُ منْ أَطْرَافها)). قَالَ: فَمَا شَرَابُهُمْ عَلَيْه؟ قَالَ: ((منْ عَيْنٍ فيهَا تُسَمَّى سَلْسَبيلًا)). قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: وَجئْتُ أَسْأَلُكَ عَنْ شَيْءٍ لَا يَعْلَمُهُ أَحَدٌ منْ أَهْل الْأَرْض إلَّا نَبيٌّ أَوْ رَجُلٌ أَوْ رَجُلَان. قَالَ: ((يَنْفَعُكَ إنْ حَدَّثْتُكَ)). قَالَ: أَسْمَعُ بأُذُنَيَّ. قَالَ: جئْتُ أَسْأَلُكَ عَن الْوَلَد، قَالَ: ((مَاءُ الرَّجُل أَبْيَضُ وَمَاءُ الْمَرْأَة أَصْفَرُ، فَإذَا اجْتَمَعَا فَعَلَا مَنيُّ الرَّجُل مَنيَّ الْمَرْأَة أَذْكَرَا بإذْن اللَّه، وَإذَا عَلَا مَنيُّ الْمَرْأَة مَنيَّ الرَّجُل آنَثَا بإذْن اللَّه)). قَالَ الْيَهُوديُّ: لَقَدْ صَدَقْتَ، وَإنَّكَ لَنَبيٌّ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَذَهَبَ، فقَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((لَقَدْ سَأَلَني هَذَا عَن الَّذي سَأَلَني عَنْهُ وَمَا لي علْمٌ بشَيْءٍ منْهُ حَتَّى أَتَانيَ اللَّهُ به)).

(ثوبـان)(ﭬ)ی کـارگوزاری پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەڵـێ: مـن بـە پێـوە لـە خزمەت پێغەمبـەری خـوادا ڕاوەسـتابووم زانایـەك لـەزانای جولەکـەکان هـات و وتی: سەلامت لسەر بێت ئەی (محمد)، دەڵێ: منیش پاڵێکی وام پێوەنا خەریك بوو بکەوێت. ئەویش وتی: بۆچ پاڵم پێوە دەنێی؟ منیش وتم ئەی بۆ نـاڵێیت:

ئەی پێغەمبەری خوا؟ کابرای جولەکەیش وتی: ئێمە هەر بەو ناوەوە بانگی دەکەین کە کەس و کاری ناوی لێناوە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ((ناوم محمدە ئەو ناوەی کە کەسوکارم ناویان ناوم)) جولەکەکە وتی: هاتووم پرسیارت لێبکەم: پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: ((ئایا سوودت پێدەگات ئەگەر قسەت بۆ بکەم) ئەویش وتی: بە هەردوو گوێچکەم دەیبیستم، پێغەمبەریش (ﷺ) بە چیلکەیەك چوکڵی دەدا لە زەوی، فەرمووی: ((بپرسە)) جولەکەکە وتی: خەڵکی لە کوێ دەبن لە ڕۆژێکدا کە ئاسمانەکان و زەوی دەگۆڕێن بە ئاسمان و زەوییەکی دیکە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((لە تاریکستانێکدا دەبن لەخوار پردی سیراتەوە)) وتی: باشە یەکەمین کەس کێیە بەسەریدا تێدەپەڕێت؟ فەرمووی: ((کۆچەریە هەژارەکانن)). جولەکەکە وتی: دیاری پێشوازیان چییە کاتێك دەچنە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: ((زیادەی جگەری نەهەنگە)) وتی: دوای ئەوە خۆراکیان چییە؟ فەرمووی: ((گای بەهەشتیان بۆ سەردەبڕن کەلە قەراغی بەهەشتا لەوەڕاوە)). وتی: ئەی خواردنەوەیان چییە بەسەریدا؟ فەرمووی: ((لە کانیاوێکی بەهەشتە پێی دەوترێت سەلسەبیل)) وتی: ڕاست دەکەیت وتی: هەمدیسان هاتووم پرسیارت لێبکەم لە شتێك کە هیچ کەس لە دانیشتووانی سەرزەوی نایزانێت مەگەر پیغەمبەرێك یا پیاوێك یا دوو پیاو نەبێت. فەرمووی: ((سوودت پێدەگات ئەگەر قسەت بۆ بکەم)). وتی: بەهەردوو گوێچکەم دەیبیستم، وتی: هاتووم پرسیارت لێبکەم دەربارەی منداڵ. فەرمووی: ((ئاوی پیاو سپییە و ئاوی ژن زەردە، جا ئەگەر هاتوو کۆبوونەوەو ئاوی پیاوەکە سەرکەوت بەسەر ئاوی ژنەکە دا بەویستی خوا کوڕیان دەبێت، ئەگەر ئاوی ژنەکەیش سەرکەوت بەسەر ئاوی پیاوەکەدا بەویستی خوا کچیان دەبێت)). جولەکەکە وتی: ڕاستت کرد بەڕاستی تۆ پێغەمبەریت، پاشان لێیداو ڕۆیشت، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ((لەڕاستیدا ئەم پیاوە پرسیاری لێکردم دەربارەی ئەوەی کە کردی لە لەکاتێکدا کە من هیچ جۆرە زانستێکم نەبوو دەربارەی هەتا خوا ئاگاداری کردم لێی))

## (٨) نازونیعمەتی بەهەشت هەر بەردەوام دەبێت

١٨٨٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لَا يَبْأَسُ، لَا تَبْلَى ثِيَابُهُ وَلَا يَفْنَى شَبَابُهُ)).

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر کەس بچێتە بەهەشتەوە هەمیشە بەهرەمەند دەبێت و تەنگژیانیی بەسەردا نایەت، نەجلوبەرگی کۆت و داڕزاو دەبێت و نەتافی لاویشی بەسەر دەچێت)).

## (٩) بەرفراوانی سێبەری درەختی بەهەشت

١٨٨١ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لَا يَقْطَعُهَا)). قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَحَدَّثْتُ بِهِ النُّعْمَانَ بْنَ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيَّ فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ فِي الْجَنَّةِ شَجَرَةً، يَسِيرُ الرَّاكِبُ الْجَوَادَ الْمُضَمَّرَ السَّرِيعَ مِائَةَ عَامٍ مَا يَقْطَعُهَا)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٨٦]

(سهل)ی کوڕی (سعد)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەبەهەشتا درەختێك هەیە سەد ساڵ سوار بە سێبەرەکەیدا دەڕوات و نایبڕێت)) (ابو حازم) دەڵێ: ئەمەم بۆ (نعمان)ی کوڕی (ابو عیاش)ی (الزرقي) باس کرد، ئەویش وتی: (ابو سعید)ی الخدری قسەی بۆ کردووم ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لەبەهەشتا درەختێك هەیە، ئەسپ سواری چوستو چالاکی خێرا سەد ساڵ دەڕوات و نایبڕێت)).

## (١٠) شێوەی چادرەکانی بەهەشت

١٨٨٢ـ عَنْ أَبِي موسى (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((فِي الْجَنَّةِ خَيْمَةٌ مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ، عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلًا، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ مَا يَرَوْنَ الْآخَرِينَ، يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُ)). [بخاري/ التفسير/ ٤٥٩٨]

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەبەهەشتا چادرێك هەیە لە مرواری ناو بۆش، پانیەکەی شەست میلە، لەهەر سوچێکیدا کۆمەڵێکی تێدایە، ئەوانی دیکە نابینن، بڕوادار بە سەریاندا دەگەڕێت)).

## (١١) بازاڕی بەهەشت

١٨٨٣ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَسُوقًا يَأْتُونَهَا كُلَّ جُمُعَةٍ، فَتَهُبُّ رِيحُ الشَّمَالِ فَتَحْثُو فِي وُجُوهِهِمْ وَثِيَابِهِمْ،

فَيَزْدَادُونَ حُسْنًا وَجَمَالًا، فَيَرْجِعُونَ إِلَـى أَهْلِيـهِمْ وَقَـدِ ازْدَادُوا حُسْـنًا وجمالًـا، فيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ: وَاللهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنا حُسْنًا وجَمَالًا. فيقولُـون: وَأَنْتُمْ وَاللهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا وَجَمَالًا)).

(انـس)ی کـوڕی (مـالك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((لەبەهەشـتا بـازاڕێك هەیـە هـەموو ڕۆژێـك بەهەشـتیەکان سـەردانی دەکـەن، شـنەبای شـەماڵ لێیـان هـەڵدەکات و، جلـو بـەرگ و ڕەنـگ و ڕووخسـاریان تەپوتۆزاوی دەکات، هێندەی تر جوان و، گەشاوە دەبن کە دەگەڕێنەوە بۆ نـاو خێزانـەکانیان پێیـان دەڵێـن : بەخوا دوای ئـەوەی لای ئێمـە ڕۆیشـتن جوانـتر و گەشـاوەتر بـوون ئـەوانیش دەڵێـن: بـەخوا ئێوەیـش لـە پـاش ئێمـە هێنـدەی تـر جوانتر و گەشاوە تربوون)).

## (١٢) ڕووبارەکانی بەهەشت لەدونیادا

١٨٨٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ (ﷺ): ((سَـيْحَانُ وَجَيْحَـانُ وَالْفُرَاتُ وَالنِّيلُ: كُلٌّ مِنْ أَنْهَارِ الْجَنَّةِ)).

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((سـەیحان و جەیحان و فورات و نیل هەموو لە ڕوبارەکانی بەهەشتن))

## (١٣) بەهەشت بەناخۆشی دەورە دراوە

١٨٨٥ـ عَنْ أَنَـسِ بْنِ مَـالِكٍ (ﷺ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (ﷺ): ((حُفَّـتِ الْجَنَّـةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٢٢]

(انـس)ی کـوڕی (مـالك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بەهەشت بەناڕەحەتی و ناخۆشی دەورە دراوە، بەڵام ئـاگر بـە ئـارەزوو هـەواو هەوەس دەورە دراوە)).

## (١٤) کەم ترینی بەهەشتیەکان ئافرەتن

١٨٨٦ـ عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ قَالَ: كَانَ لِمُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ امْرَأَتَانِ، فَجَاءَ مِنْ عِنْدِ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتِ الأُخْرَى: جِئْتَ مِنْ عِنْدِ فُلَانَةَ؟ فَقَالَ: جِئْتُ مِنْ عِنْدِ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، فَحَدَّثَنَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ أَقَلَّ سَاكِنِي الْجَنَّةِ النِّسَاءُ)).

(أبو التياح) دەڵێ: (مطرف)ی کوڕی (عبدالله) دوژنی هەبوو، جارێکیان لای یـەکێکیان هاتـەوە، ئـەویتریان وتـی: لای فلانـە ژنـەوە هـاتی؟ ئـەویش وتـی: لای

(عمران)ی کوڕی (حصین)ەوە هاتم، قسەی بۆ کردین، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((کەمترینی بەهەشتیەکان ئافرەتن)).

## (١٥) نیشانەی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان لەدونیادا

١٨٨٧ـ عَنْ حارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ (ﷺ): سمع النَّبيَّ (ﷺ) قَال: ((ألا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجنَّةِ)). قَالُوا: بَلى، قَال (ﷺ): ((كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ، لَوْ أَقْسَمَ عَلى اللَّهِ لأبَرَّهُ)). ثُمَّ قالَ: ((أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ)). قَالُوا: بَلى، قَالَ: ((كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ)). [بخاري/ التفسير/ ٤٦٣٤]

لە(حارثە)ی کوڕی (وهب)(ﷺ) گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە فەرموویەتی: ((پێتان بڵێم بەهەشتیەکان کامانەن)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((هەموو کەسێکی لاوازی خۆ بەلاواز زان ، کە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات داواکەی بۆ جێبەجێ ئەکات)). پاشان فەرمووی: ((پێتان بڵێم دۆزەخی یەکان کامانەن)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((هەموو کەللە ڕەقێکی چاوبرسی خۆ پەرستی لە خۆبایی خۆبەزل زان)).

١٨٨٨ـ عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((رُبَّ أَشْعَث مَدْفُوعٍ بِالْأَبْوَابِ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّه لأبَرَّهُ)).

(ابي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ڕەنگە زۆر کەسی سەروقژ ئاڵۆسکاوی پەڕپوتی دەرکراوی بەردەرگای ئەوتۆ هەبێت ، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات {کە ئەبێ فلان شتی بۆ بکات} بۆی جێبەجێ دەکات.

١٨٨٩ـ عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ الْمُجَاشِعِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ فِي خُطْبَتِهِ: ((أَلَا إِنَّ رَبِّي أَمرنِي أَنْ أُعَلِّمَكُمْ مَا جَهِلْتُمْ مِمَّا عَلَّمَنِي يَوْمِي هَذَا: كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْدًا حَلَالٌ، وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ. وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ، وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِي مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَانًا. وَإِنَّ اللَّهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الْأَرْضِ فَمَقَتَهُمْ. عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ، إِلَّا بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، وَقَالَ: إِنَّمَا بَعَثْتُكَ لِأَبْتَلِيَكَ وَأَبْتَلِيَ بِكَ. وَأَنْزَلْتُ عَلَيْكَ كِتَابًا لَا يَغْسِلُهُ الْمَاءُ، تَقْرَؤُهُ نَائِمًا وَيَقْظَانَ. وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أُحَرِّقَ قُرَيْشًا، فَقُلْتُ: رَبِّ إِذًا يَثْلَغُوا رَأْسِي فَيَدَعُوهُ خُبْزَةً، قَالَ: اسْتَخْرِجْهُمْ كَمَا اسْتَخْرَجُوكَ، وَاغْزُهُمْ نُغْزِكَ، وَأَنْفِقْ فَسَنُنْفِقَ عَلَيْكَ، وَابْعَثْ جَيْشًا نَبْعَثْ خَمْسَةً

مثْلَهُ، وَقَاتلْ بِمَنْ أطَاعَكَ مَنْ عصَاكَ. قَالَ: وَأهْلُ الْجَنَّة ثَلَاثَةٌ: ذُو سُلْطَان مُقْسطٌ مُتَصدِّقٌ مُوَفَّقٌ، ورَجُلٌ رَحِيمٌ رقيقُ الْقَلْبِ لكُلِّ ذي قُرْبَى وَمُسْلمٍ، وعَفيفٌ مُتعفِّفٌ ذُو عيَالٍ. قَالَ: وأَهْلُ النَّار خَمْسَةٌ: الضَّعيفُ الَّذي لَا زَبْرَ لَهُ، الَّذِين هُمْ فيكُمْ تبعا، لَا يَبْتَغُونَ أهْلًا وَلَا مَالًا. وَالْخَائنُ الَّذي لَا يَخْفَى لَهُ طَمَعٌ وإنْ دَقَّ إلَّا خَانَهُ. ورجُلٌ لَا يُصبْحُ وَلَا يُمْسي إلَّا وَهُو يُخَادعُكَ عَنْ أهْلكَ وَمَالكَ -وَذَكر الْبُخْل أو الْكذب- وَالشِّنْظيرُ الْفَحَّاشُ)).

لـە (عياض)ى كـوڕى (حمار)ى (المجاشـعي)يـەوە (ﷺ) كـە پێغەمبـەر (ﷺ) ڕۆژێكيان لەوتارێكيدا فەرمووى: ((بزانـن كـە پـەروەردگار فـەرمانى پـێكردووم، ئەوەى كە نازانن فێرتان بكەم لەوەى كە لـەم ڕۆژەدا فێرى كـردووم. هـەر ماڵێك كە خەڵاتم كردبێت بە بەندەيەك ئەوە بۆى حەڵاڵە، من بـەندەكانى خۆمـم هـەموو لەسەر ڕێگاى ڕاستى و يەكتاپەرستى دروست كـردووە، كـەچى شـەيتانەكان هاتن بۆيان و لە دينى خۆيانيان لادان و، ئەوەى بۆم حەڵاڵ كردبوون حـەراميان كـرد لـە سـەريان، فـەرمانيان پێكـردن كـە هـاوەڵم بـۆ دابنێـن بێئـەوەى هيـچ بەڵگەيەكم لەسەر ناردبێت، خواى بالادەست تەماشاى هەموو دانشتوانى سەر زەوى كـرد هەرهـەموويانى لابـێزرا چ عـەرەبيان و چ عەجـەميان مەگـەر كـەمێك نەبێت لە پاشماوەى خاوەن كتێبـەكان و، فەرمووى: ((ئـەى موحەمـەد من بۆيـە تـۆم نـاردووە تـا تـۆ تاقىبكەمـەوە و كەسـانى تريشـت پـێ تـاقى بكەمـەوە، مـن نامەيـەكم ناردۆتـە سـەرتۆ كـە ئـاو نايشـواتەوە، چ لەخـەودا و چ لـە بێداريـدا دەيخوێنيتـەوە. هـەروەها خـوا فـەرمانى پێكـردووم كـە قورەيـش بسـوتێنم [لەناويان بەرم]. منيش وتم: پەروەردگار جا ئەگەر وابكەم ئـەوانيش وەكو نـان سەرم كەرت و پـەرت دەكـەن، ئـەويش فەرمووى: ((تۆيـش دەريانكە وەك چـۆن ئەوان دەريان كردى ، لەگـەڵيان بجـەنگن ئێمـە يارمـەتيت دەدەيـن، تـۆ سـامانى خۆت ببەخشە ئێمەيش پێتدەبەخشين لەشكرێك بنێرە ئێمە پێنجى وەك ئـەوت بـۆ دەنێرين، بەوانـەى كـە گوێڕايـەڵيت دەكـەن. بجەنگـە لەگـەڵ ئەوانـەى لێـت يـاخيبوون. فـەرمووى: ((بەهەشـتيەكان سـيانن: كاربەدەسـتێكى دادوەرى خێرخوازى سـەركەوتوو، پيـاوێكى دلۆڤـانى ميـهرەبانى دڵ نـەرم لەگـەڵ هـەموو خزم و دۆست و موسڵمانێكدا و كەسێكى خاووخێزاندارى دەرونبـەرزى بێنياز لە خەڵكى. فەرمووشـى: ((دۆزەخيـەكانيش پێنجـن ئـەو زەبـوون و لاوازەى كـە

هزروبیری نییە، ئەوانەی کەلە نێوتاندا هەمیشە پاشکۆن، ماڵ و منداڵ و سامانیان ناوێت، ئەو خیانەتکارەیش کە هەرچی بۆ ڕێکبکەوێت باکەمیش بێت خیانەتی لێدەکات. پیاوێکیش کە بەیانی و ئێوارە هەردەیەوێت بتخەڵەتێنێ و لەماڵ و خێزانتا گزیت لێبکات- باسی ڕژدی یان درۆیشی کرد- هەروەها کە چ ڕەوشت و هەرزەگۆو بەدکاریش)).

## (١٦) نەبڕانەوەیی بەهەشت و دۆزەخ

١٨٩٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ وَصَارَ أَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ: أُتِيَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، ثُمَّ يُذْبَحُ، ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لَا مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ لَا مَوْتَ. فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ، وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ)). [بخاري. الرقاق/ ٦١٨٢]

لە(عبداللە)ی کوڕی (عمر)(ﷺ) ەوە: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێ بەهەشتیەکان بەرەو بەهەشت یەکلایی کرانەوە و، دۆزەخیەکانیش بەرەو دۆزخ یەکلاکرانەوە. مردن دەهێنرێت، لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا سەر دەبڕێت، ئینجا جاڕ چیەك جاڕ دەدات: ئەی بەهەشتیەکان ئیتر مردن نی‌یە و، ئەی دۆزەخیەکانیش ئیتر مردن نی‌یە، ئینجا بەهەشتیەکانیش لەسەرو دڵ خۆشی‌یەکەیانەوە هێندەی تر دڵخۆش دەبن، و دۆزەخی‌یەکانیش لەسەرو خەفەتەکەیانەوە هێندەی تر خەفەت باردەبن)).

# (٦٥) بەشی ئاگری دۆزەخ

## (١) جڵەوەکانی دۆزەخ

١٨٩١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((يُؤْتَى بِجَهَنَّم يوْمئذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يجُرُّونَهَا)).

(عبـــدالله) (ﷺ) دەڵـــێ: پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) فەرموویـــەتی: ((دۆزەخ دەهێـنرێت حـەفتا هـەزار جڵـەوی هەیـە، لەگـەڵ هەرجڵـەوێکدا حـەفتا هـەزار فریشتە هەن ڕایدەکێشن)).

## (٢) سەختیی گەرمی دۆزەخ

١٨٩٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَة (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَال: ((نَارُكُمْ هذه الَّتي يُوقِدُ ابْنُ آدمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ حَرِّ جهنَّمَ)). قَالُوا: وَاللَّه إِنْ كانتْ لكَافِيَةً يا رَسُولَ اللَّه، قَال: ((فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْها بِتِسْعَةٍ وسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّها مِثْلُ حرِّها)). [بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٩٢]

(ابي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ئـەم ئـاگرەی کە ئادەمیزاد بۆ سوتاندن بەکاری دەهێنن بەشێکە لـە حـەفتا بەشـی گـەرمی دۆزەخ)) وتیـان: ئەگـەر هـەر ئەمـەیش بوایـا بەسـبوو ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئـەویش فـەرمووی: ((لـە ڕاسـتیدادۆزەخ شەسـت و نۆپلـەی زیـاترە لـەو. هـەر بەشێکی بەوێنەی ئەو گەرمە)).

## (٣) قووڵیی دۆزەخ

١٨٩٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) إِذْ سَمِعَ وجْبَةً، فقَال النَّبِيُّ (ﷺ): ((تَدْرُونَ ما هَذَا)). قال: قُلْنَا: اللَّهُ ورسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((هَذَا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ فِي النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفًا، فَهُوَ يَهْوِي في النَّارِ الْآن، حتَّى انْتَهَى إِلَى قعرها)).

(ابي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبـەردا بووین (ﷺ) گوێی لە گرمەیەك بوو، پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی: ((دەزانـن ئـەوە چیبـوو)) وتمان: خوا و پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: ((ئەوە بەردێك بوو فڕێدرایە ناو دۆزەخەوە، حەفتا پایزە ڕۆدەچێت ئێستا دای لە بنەکەی)).

## ( ٤ ) سووك ترین سزای دۆزەخ

١٨٩٤ـ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلَانِ وَشِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ، يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ كَمَا يَغْلِ الْمِرْجَلُ، مَا يَرَى أَنَّ أَحَدًا أَشَدُّ مِنْهُ عَذَابًا، وَإِنَّهُ لَأَهْوَنُهُمْ عَذَابًا)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٩٤]

(نعمان)ی کوڕی (بشیر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سووکترین سزای ئەهلی دۆزەخ سزای کەسێکە کە جووتێ نەعلی ئاگرینی لەپێدایە، مێشکی سەری پێیانەوە دەکوڵێ وەك چۆن مەنجەڵی ئاو دەکوڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا وانابینێت کەکەس لەو سزای سەختتر بێت، کەچی ئەو لەهەموویان سزای سووکترە)).

## ( ٥ ) ئاگرتاکوێی دۆزەخیی دەگرێت

١٨٩٥ـ عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى كَعْبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى حُجْزَتِهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى تَرْقُوَتِهِ)).

(سمرە)ی کوڕی (جندب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((دۆزەخیەکان هەیانە ئاگرتا قوولە پێی دێ و، هەیانە تا هەردوو ئەژنۆی و، هەشیانە تا پشتێنەی و، هەشیانە تا ئێسکی بن ملی دێت)).

## ( ٦ ) دۆزەخ جێی خۆسە پێنەر و ستەمکارانە و بەهەشتیش جێی هەژار و لاوازەکانە

١٨٩٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((تَحَاجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ، وَقَالَتِ الْجَنَّةُ: فَمَا لِي لَا يَدْخُلُنِي إِلَّا ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ وَغِرَّتُهُمْ؟ قَالَ اللَّهُ لِلْجَنَّةِ: إِنَّمَا أَنْتِ رَحْمَتِي، أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي. وَقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي، أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ: فَلَا تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى رِجْلَهُ، تَقُولُ: قَطْ قَطْ قَطْ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلَا يَظْلِمُ اللَّهُ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا. وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا)). [بخاري/ التفسير/ ٤٥٦٩]

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەهەشت و دۆزەخ مشت و مڕیان بوو، دۆزەخ وتی: من تایبەت کراوم بە خۆبەزل زان و مل

هورە ستەمكارەكان بەهەشتیش وتی: باشە من چیمە وا هەركەسانی زەبوون و لاواز و بێسەرو ساختە و ڕازونیاز نەبێت نایەتە ناوم؟ خوای بالاّ دەستیش بە بەهەشتی فەرموو: ئەی بەهەشت تۆ بەزەیی منی بەتۆ بەزەیی دەنوێنم بۆ هەر كەس بمەوێت لە بەندەكانم. بە دۆزەخیشی فەرموو: ئەی دۆزەخ تۆیش سزای منی، هەر كەس بمەوێت لەبەندەكانم بە تۆ سزای دەدەم، هەر یەك لە ئێوە پڕ بەپڕی خۆی هەیە، بەلاّم ئاگر: پڕ نابێت تاوەكو خوای بەرز و بلّند پێیەكی [قودرەتی] پیادەنێت. ئینجا دۆزەخ دەڵێت: بەسمە، بەسمە، ئیتر لەوێدا دێتەوە یەك و پڕبەپڕی ، خوایش ستەم لە هیچ كام لەدروست كراوەكانی ناكات. بەهەشتیش پڕ نابێت تا خوا جۆرە دروست كراوێكی بۆ بەدی دەهێنێ)).

## (٧) سزای كەسێك كە چوارپێی نەزركرد بۆ بتەكان

١٨٩٧- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ يَقُولَ: إِنَّ الْبَحِيرَةَ: الَّتِي يُمْنَعُ دَرُّهَا لِلطَّوَاغِيتِ، فَلَا يَحْلُبُهَا أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ. وَأَمَّا السَّائِبَةُ: الَّتِي كَانُوا يُسَيِّبُونَهَا لِآلِهَتِهِمْ فَلَا يُحْمَلُ عَلَيْهَا شَيْءٌ. وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (ﷺ): قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ عَامِرٍ الْخُزَاعِيَّ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السُّيُوبَ)).

(ابن شهاب) دەڵێت: گوێم لە (سعيد)ی كوڕی (مسيب)بوو دەیگووت (بحيره) بریتی‌یە لەو چوار پێیەی كە شیرەكەی گل دەدرایەوە بۆ بتەكان، ئیتر كەس نەیدەدۆشی. بەلاّم (سائبه): بریتی‌بوو لەو چوارپێیەی وازی لێدەهێنرا و هیچی پێ هەڵنەدەگیرا لەبەر خاتری بتەكانیان. (ابن المسيب) دەڵێ: (ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((عمرو) ی كوڕی (عامر الخزاعی)م بینی ڕیخۆڵەی خۆی بەناو ئاگردا ڕادەكێشا، كە یەكەمین كەس بوو چوارپێی واز لێهێنراوی نەزركرد {بۆ بتەكان})).

## (٨) گەورەیی خرێی بێ باوەڕ لە ئاگردا

١٨٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((ضِرْسُ الْكَافِرِ -أَوْ نَابُ الْكَافِرِ- مِثْلُ أُحُدٍ، وَغِلَظُ جِلْدِهِ مَسِيرَةُ ثَلَاثٍ)).

(ابی هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خرێی بێباوەڕ بە وێنەی كێوی ئوحودە، ئەستوری پێستیشی سێ ڕۆژ ڕێگایە)).

١٨٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) -يَرْفَعُهُ- قَالَ: ((مَا بَيْنَ مَنْكِبَي الْكَافِرِ فِي النَّارِ مَسِيرَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ لِلرَّاكِبِ الْمُسْرِعِ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٨٥]

لە (أبو هريرة)ەوە (ﷺ) دەيگەيێنێ بە پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرموويەتی: ((نێوانی هەردوو دەفەی شانی بێ باوەڕ لە ئاگردا سێ ڕۆژ ڕێگایە بۆ سواری خێرای چاپووك))

## (٩) سزای ئەوانەی خەڵكی سزادەدەن

١٩٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ: رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا)).

(ابي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموويەتی: ((دوو تاقم هەن كە دۆزەخین نەمبینیون: تاقمێكیان كە قامچییان پێیە وەك كلكی مانگا خەڵكی پێدائەپلۆسن، لەگەڵ چەند ژن گەلێكی {بەناو} پۆشتەی ڕووت و قووتی، تەفرە خواردووی تەفرەدەر سەروقژیان هەر دەڵێی سەركۆپارەی لاری وشترە، ناچنە بەهەشت و بۆنیشی ناكەن، ئەگەر چی بۆنی لەئەمەندە و ئەمەندە ڕێگەوە هەستی پێدەكرێت)).

١٩٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنْ طَالَتْ بِكَ مُدَّةٌ أَوْشَكْتَ أَنْ تَرَى قَوْمًا يَغْدُونَ فِي سَخَطِ اللَّهِ وَيَرُوحُونَ فِي لَعْنَتِهِ، فِي أَيْدِيهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ)).

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەيفەرموو: ((ئەگەر خوا ماوەيەك تەمەنی درێژ كردینەوە نزيكە تاقمێك ببینی كە لە توڕەیی خوادا ڕۆژ دەكەنەوە و، لە نەفرینی ئەويشدا ئێوارە دەكەنەوە، شتێكی وەك كلكی مانگايان بەدەستەوەيە)).

## (١٠) نوقم كردنی بەختەوەر ترین كەسی دونیا لە دۆزەخی خواو بە پێچەوانەوە.

١٩٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُصْبَغُ فِي النَّارِ صَبْغَةً ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ خَيْرًا قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ. وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ

بُؤْسًا فِي الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي الْجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْسًا قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ، مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلَا رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ)).

(انـس)ی کـوڕی (مـالك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بەختەوەرترینی کەس لە دۆزەخیەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێت، یەکجار هەڵدەژەنرێت لە ئاگر پاشان پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز خێر و خوشیت دیووە، ئایا هـەرگیز نیعمـەتی خـوا بەسەرتا تێپـەڕیووە؟ ئـەویش دەڵێت: نەبەخوا ئەی پەروەدگار، ئینجـا خـێر لـە خۆنـەدیوترین کەسـیش لـە دونیادا لەبەهەشتیەکان دەهێنرێت یـەکجار لە بەهەشتا هـەڵدەژەنرێت پاشـان پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز ناخۆشیت بەخۆتەوە بینیوە، ئایا هــەرگیز ســەختیی بەســەرتا تێپــەڕیووە، ئــەویش دەڵێــت: نەبــەخوا ئــەی پەروەردگار، هەرگیز ناخۆشیم لە ژیاندا نەدیوە، هەرگیز سەختیم نەدیوە)).

# (٦٦) بەشی ئاشووب و فیتنه

## ( ١ ) نزیك بونەوەی فیتنه و لەناوچوون كاتێ تاوان زۆر بوو

١٩٠٣- عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ (رضي الله عنها): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اسْتَيْقَظَ مِنْ نَوْمِهِ وَهُوَ يَقُولُ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍ قَد اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ)). وَعَقَدَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ عَشَرَةً. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: ((نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٣١٦٨]

لە(زینب)ی كچی (جحش) (رضي الله عنها)ەوە: كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخەو راپەڕی دەیفەرموو: ((لا اله الا الله، هاوار بۆ عەرەب لە شەڕێك كە نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ لە بەربەستەكەی (یأجوج) و(مأجوج) ئەوەندەی ئەمە كونی تێبوو)) (سفیان) ئاماژەی بۆ ژمارە دەكرد. منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەناو دەچین لە كاتێكدا ئێمە {هێشتا} پیاوچاكانمان تێدایە؟. ئەویش فەرمووی: ((بەڵێ كاتێك تاوان زۆر بوو))

١٩٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ)). وَعَقَدَ وُهَيْبٌ بِيَدِهِ تِسْعِينَ. [بخاري/ الأنبياء/ ٣١٦٩]

(أبي هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەمڕۆ لەبەربەستەكەی یاجوج و ماجوج و ئەوەندەی ئەمە كەلەبەری تێكەوت (وهیب) بەدەستی ئاماژەی بۆ نەوەد كرد.

## ( ٢ ) دابەزینی فیتنە وەك بارانی لێزمە

١٩٠٥- عَنْ أُسَامَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَشْرَفَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ قَالَ: ((هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى؟ إِنِّي لَأَرَى مَوَاقِعَ الْفِتَنِ خِلَالَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ الْقَطْرِ)). [بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٧٩]

لە (أسامە)ی كوڕی (زید)(رضي الله عنه)ەوە: كە پێغەمبەریخوا (ﷺ) بەسەر باڵەخانەیەك لە باڵەخانەكانی مەدینەدا سەركەوت و، پاشان فەرمووی: ((ئایا ئەوەی من دەیبینم ئێوە دەیبینن؟ بێگومان من لە نێو ماڵەكانتانەوە شوێنگەی فیتنە دەبینم وەك شوێنگەی بارانی بەلێزمە)).

## ( ٣ ) هاتنی فیتنە بەسەر دڵاندا پەیتا پەیتا

١٩٠٦ـ عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ (ﷺ) فقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ؟ فَقَالَ قَوْمٌ: نَحْنُ سَمِعْنَاهُ. فَقَالَ: لَعَلَّكُمْ تَعْنُونَ فِتْنَةَ الرَّجُلِ فِي أَهْلِه وَجَارِهِ؟ قَالُوا: أَجَلْ. قَالَ: تِلْكَ تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ، وَلَكِنْ أَيُّكُمْ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ الَّتِي تَمُوجُ مَوْجَ الْبَحْرِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: فَأَسْكَتَ الْقَوْمُ، فَقُلْتُ: أَنَا. قَالَ: أَنْتَ لِلَّه أَبُوكَ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((تُعْرَضُ الْفِتَنُ عَلَى الْقُلُوبِ كَالْحَصِيرِ عُودًا عُودًا، فَأَيُّ قَلْبٍ أُشْرِبَهَا نُكِتَ فِيه نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، وَأَيُّ قَلْبٍ أَنْكَرَهَا نُكِتَ فِيه نُكْتَةٌ بَيْضَاءُ، حَتَّى تَصِيرَ عَلَى قَلْبَيْنِ: عَلَى أَبْيَضَ مِثْلِ الصَّفَا فَلَا تَضُرُّهُ فِتْنَةٌ مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ، وَالْآخَرُ أَسْوَدُ مُرْبَادًّا كَالْكُوزِ مُجَخِّيًا، لَا يَعْرِفُ مَعْرُوفًا وَلَا يُنْكِرُ مُنْكَرًا، إِلَّا مَا أُشْرِبَ مِنْ هَوَاهُ)). قَالَ حُذَيْفَةُ: وَحَدَّثْتُهُ: أَنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا يُوشِكُ أَنْ يُكْسَرَ. قَالَ عُمَرُ: أَكَسْرًا لَا أَبَا لَكَ؟ فَلَوْ أَنَّهُ فُتِحَ لَعَلَّهُ كَانَ يُعَادُ. قُلْتُ: لَا، بَلْ يُكْسَرُ. وَحَدَّثْتُهُ أَنَّ ذَلِكَ الْبَابَ رَجُلٌ يُقْتَلُ أَوْ يَمُوتُ، حَدِيثًا لَيْسَ بِالْأَغَالِيطِ. قَالَ أَبُو خَالِدٍ: فَقُلْتُ لِسَعْدٍ: يَا أَبَا مَالِكٍ مَا أَسْوَدُ مُرْبَادًّا؟ قَالَ: شِدَّةُ الْبَيَاضِ فِي سَوَادٍ. قَالَ: قُلْتُ: فَمَا الْكُوزُ مُجَخِّيًا؟ قَالَ: مَنْكُوسًا. [بخاري/ مواقيت الصلاة/ ٥٠٢]

لە(حذيفة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: ئێمە لە کاتێکدا لە خزمەت (عمر)دا بوین وتی: کێتان بیستوویەتی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی فیتنەی کردبێت؟ خەڵکەکە وتیان: ئێمە بیستوومانە . ئەویش وتی: ڕەنگە ئێوە مەبەستان پێی ئەو فیتنە بێت کە پیاو بەهۆی ماڵ و منداڵ و دەرودراوسێیەوە تووشی دێت؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەو جۆرە فیتنە نوێژ و ڕۆژو و خێر و خێرات دەیسڕێتەوە، بەڵام داخۆ ئێوە کامتان بیستوویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی لەو فیتنە کردبێت کە وەك دەریا شەپۆل دەدات. (حذيفة) دەڵێ: خەڵکەکە بێدەنگ بوون منیش وتم: من. وتی: تۆ باوکت بەرەحمەت بێت؟ (حذيفة) وتی: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: ((لەمەولا فیتنە و ئاشووب دێت بەسەر دڵاندا وەك چۆن حەسیر تاڵ تاڵ لەسەر یەك دادەنرێت، هەر دڵێکیش هەڵیمژێت زوو بیمژێت ئەوا خاڵێکی ڕەشی تێدا دروست دەبێت، بەڵام هەر دڵێك حەزی پێنەکات ئەوە خاڵێکی سپی تیدا دروست دەبێت. تاوەکو دڵەکان دەبن بە دوو جۆر دڵ: دڵێکی سپی و سافی وەك قوماشی سپی و ساف، هیچ فیتنەیەك

زیـانـی لێنـادات چـەندە ئاسمانـەکان و زەوی بـەردەوام بـن، دڵەکـەی تریشـیان دڵێکـی ڕەش و تـاریك وەك گـۆزەی سـەربەرەو خـوار نـەچاك بـەچاك دەزانـێ و نەخراپ بە خراپ، مەگـەر ئەوەی کە ئارەزووی خۆی دەیخوازێـت)) (حذیفة) دەڵێ: بە (عمر)م وت: کەلە نیوان تۆو ئەودا {ئەو جۆرە فیتنـەدا} دەرگایـەکی داخراو هەیە نزیکە بشکێت. (عمر)یش وتـی: بـی باوك بیـت بـۆ شـکاندن بێت؟ خۆ ئەگەر بکرێتەوە پێوە دەدرێتەوە، منیـش وتم: نـەخێر بـەڵکو دەشـکێنرێت. بۆم باس کرد کە ئەو دەرگایە بریتی‌یە لە پیاوێك دەکوژرێـت یـا دەمرێـت، ئەمـە فەرموودەیە و هەڵەی تێدا نییە.

## ( ٤ ) شەیتان لەشکرەکانی خۆی بۆ تێکدانی خەڵك دەنێرێت

١٩٠٧ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ، ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ، فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً، يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ: مَا صَنَعْتَ شَيْئًا. قَالَ: ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ، قَالَ: فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ: نِعْمَ أَنْتَ –قَالَ الْأَعْمَشُ: أُرَاهُ قَالَ– فَيَلْتَزِمُهُ)).

(جـابر) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموويـەتی: ((شەیتان تـەختی خۆی لەسەر ئاو دادەنێت، پاشان مەفرەزەکانی {بەملاولادا} دەنێرێت، کامیـان لای شـەیتان پلەوپایەی نزمـترە لــە هــەموویان ســاختەچی تــرە، یـەکێکیان کـە دێتــەوە بــۆلای دەڵێــت: ئــەوەم کــرد و ئــەوەم کــرد، ئــەویش دەڵێــت: هیچــت نـەکردووە. پاشـان یـەکێکی تریان دێت و دەڵێت وازم لـە کابرانـەهێنا تـا نێـوان خۆی و ژنەکەیم تێك دا، ئەوجا ئەویش لەخۆیی نزیك دەخاتەوە و دەڵێت: ئای تۆ چەند چاکی– (اعمش) دەڵێ: وابزانم فەرمووی: ((دەستیشی لەمل دەکات)).

## ( ٥ ) فیتنە و شێوەکانی

١٩٠٨ـ عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الْخَوْلَانِيِّ كَانَ يَقُولُ: قَالَ حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ (ﷺ): وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُ النَّاسِ بِكُلِّ فِتْنَةٍ هِيَ كَائِنَةٌ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ السَّاعَةِ، وَمَا بِي إِلَّا أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَسَرَّ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ شَيْئًا لَمْ يُحَدِّثْهُ غَيْرِي، وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ –وَهُوَ يُحَدِّثُ مَجْلِسًا أَنَا فِيهِ عَنِ الْفِتَنِ– فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ يَعُدُّ الْفِتَنَ: ((مِنْهُنَّ ثَلَاثٌ لَا يَكَدْنَ يَذَرْنَ شَيْئًا، وَمِنْهُنَّ فِتَنٌ كَرِيَاحِ الصَّيْفِ، مِنْهَا صِغَارٌ وَمِنْهَا كِبَارٌ)). قَالَ حُذَيْفَةُ: فَذَهَبَ أُولَئِكَ الرَّهْطُ كُلُّهُمْ غَيْرِي.

(أبــی إدریـــس)ی (الخولانـــی) دەیـــووت: (حذیفـــة)ی (ﷺ) كـــوڕی (یمـــان) وتوویەتی: بەخوا من لە هەموو كەس زاناترم بەهـەموو فیتنەیـەك كە ڕوودەدات لە ئێستاوە تاقیامەت.. خۆ وەنەبێ من هیچ شتێكی ئەو تۆم هەبێت جگەلەوەی كە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـەوبارەوە چـەند شـتێكی [نـهێنی] پێوتـووم كـە بەكەسی تری نـەوتووە. بـەڵام پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((لـەكاتێكدا قسەی بۆ كۆڕێك دەكرد كە منیشیان تێدابووم دەربارەی فیتنـەكان. پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـەكاتێكدا خـەریكی ژمـاردنی فیتنـەكانبوو، فـەرمووی: ((ســیانیان نزیكە هیچ شتێك نەبوێرن و، هەیشیانە چەند فیتنەیەكن وەك هاوینەبا، هەیانـە بچووكن و هەشیانە گەورە)) (حذیفة)دەڵێ: هـەموو ئـەو چـەند كەسـانە مـردوون من نەبێت.

١٩٠٩ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَقَامًا مَا تَـرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلَّا حَدَّثَ بِهِ، حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ، قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابِي هَؤُلَاءِ، وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ قَدْ نَسِيتُهُ فَأَرَاهُ فَأَذْكُرُهُ، كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ، ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ. [بخاري/ القدر/ ٦٢٣٠]

(حذیفة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شوێنێكدا لەناوماندا ڕاوەستا هیچ شتێكی نەهێشتەوە كەلەوكاتـەوە تاقیامـەت ڕوودەدات هـەر هـەمووی بـاس كرد، ئەوەی لەبەری كـرد لـەبەری كـرد و، ئـەوەیش لـەبیری چـووە لـەبیری چـوو، هەموو ئەم هاوەڵانەم بەمـە دەزانن، جاری واهەیـە هـەندێك لـەوەی بیستوومە و لــەبیرم چۆتـــەوە كـــە دەبینــم [ڕوودەدات] بـــیرم دەكەوێتـــەوە، وەك پیـــاوێك ڕووخساری پیاوێك دێتەوە بیری كاتێك لێی وندەبێت. پاشان كاتێك بینیـەوە دەیناسێتەوە.

١٩١٠ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ، فَمَا مِنْهُ شَيْءٌ إِلَّا قَدْ سَأَلْتُهُ، إِلَّا أَنِّي لَمْ أَسْأَلْهُ: مَا يُخْرِجُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ.

(حذیفـة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خەبـەری پێـداوم لــەوەی كــە ڕوودەدات تاڕۆژی قیامەت. هیچ شتێك نەماوەتەوە لێی ئیلا پرسیارم لێكردووە دەربـارەی. مەگــەر ئــەوەی كــە لێـم نەپرسـی چـی خـەڵكی مەدینـە لـە مەدینـە دەردەكات.

١٩١١ـ عَنْ أَبِي زَيْدٍ [يَعْنِي عَمْرَو بْنَ أَخْطَبَ] (ﷺ) قال: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) الْفَجْرَ، وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ فَنَزَلَ فَصَلَّى. ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى. ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ،فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا.

لــە (ابــو زيــد)ەوە (مەبەســتی (عمــرو)ی کــوڕی (اخطــب)ە)(ﷺ) دەڵــێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردین، ئینجا چووە سەر مینبەر وتاری بۆدایـن تا نیوەڕۆ، ئینجا دابەزی و نویژی بۆ کردین. پاشان سەرکەوتەوە سەر مینبەر وتاری بۆ داین تا وەکو کاتی عەسر پاشان دابەزی و نوێژی بۆ کردین. ئینجا سەرکەوتەوە سەر مینبەر و وتاری بۆ داین تا خۆر ئاوابوو، خەبەری پێداین دەربارەی ئەوەی کە لەمەو پێش بووە و لەمەولایش دەبێت. لە هەموویشمان زاناتر ئەوەمانە کە لەهەمووماں باشتر لەبەری کردبێت.

## ( ٦ ) ئەوانەی فەرمودەیان لەبەرە دەربارەی فیتنە

١٩١٢ـ عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: قَالَ جُنْدُبٌ: جِئْتُ يَوْمَ الْجَرَعَةِ، فَإِذَا رَجُلٌ جَالِسٌ، فَقُلْتُ: لَيُهْرَاقَنَّ الْيَوْمَ هَاهُنَا دِمَاءٌ. فَقَالَ ذَاكَ الرَّجُلُ: كَلَّا وَاللَّه. قُلْتُ: بَلَى وَاللَّه. قَالَ: كَلَّا وَاللَّه. قُلْتُ بَلَى وَاللَّه. قَالَ: كَلَّا وَاللَّه، إِنَّهُ لَحَدِيثُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) حَدَّثَنِيهِ. قُلْتُ: بِئْسَ الْجَلِيسُ [لِي] أَنْتَ، مُنْذُ الْيَوْمِ تَسْمَعُنِي أُخَالِفُكَ، وَقَدْ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَلَا تَنْهَانِي؟ ثُمَّ قُلْتُ: مَا هَذَا الْغَضَبُ؟ فَأَقْبَلْتُ عَلَيْهِ، وَأَسْأَلُهُ، فَإِذَا الرَّجُلُ حُذَيْفَةُ (ﷺ).

(محمد)دەڵێ: (جنـدب)وتـی: ڕۆژی (الجرعـە) هـاتم، سەیرم کـرد پیـاوێك دانیشتووە، منیش وتم: وا پێدەچێت ئەمڕۆ لێرەدا خوێن بڕژێت. ئەو پیاوەیش وتی: نا بەخوا. منیش وتم: بەرێ وەڵڵا، ئەویش وتی: نا بەخوا. منیش وتم: بەرێ وەڵڵا ئەویش وتـی: نابەخوا. منیش وتم: بەرێ وەڵڵا ئەویش وتی: نا بەخوا، ئەوە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بۆی باسکردووم. منیش وتم: چەند تۆ هاوەڵێکی خراپی [بۆمن]، لەڕۆژی ئەمڕۆوە گوێت لێمە سوێندت بۆ دەخۆم. لــەکاتێکدا ئــەوەت لــە پێغەمبــەری خوایــش (ﷺ) بیســتووە کــەچی جڵەوگیریم لێناکەیت؟ پاشان وتم: ئەم توڕەییە چیە؟ کاتێ لام بەلایدا کردەوە و پرسیارم لێکرد، سەیردەکەم ئەو پیاوە (حذیفة)یە (ﷺ).

## ( ٧ ) فیتنە لەخۆرهەڵاتەوە دێت

١٩١٣ـ عَنْ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّه [بْن عُمَرَ (ﷺ)] قَالَ: يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ، مَا أَسْأَلَكُمْ عَنِ الصَّغِيرَةِ وَأَرْكَبَكُمْ لِلْكَبِيرَةِ! سَمِعْتُ أَبِي عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ الْفِتْنَةَ تَجِيءُ مِنْ هَاهُنَا -وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ- مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنَا الشَّيْطَانِ)). وَأَنْتُمْ يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، وَإِنَّمَا قَتَلَ مُوسَى (ﷺ) الَّذِي قَتَلَ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ خَطَأً، فَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ [لَهُ]: ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا﴾ [طه: ٤٠]. [بخاري/ الفتن/ ٦٦٨٠]

(سالم)ی کوڕی (عبدالله) دەڵێ: [ئبن عمر] (ﷺ) وتی ئەی عێراقیەکان چەند پرسیار لە شتی بچووك و سادە دەکەن، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا لە هەموو کەس زیاتر گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن؟ گوێم لە (عبدالله) کوڕی (عمر) بوو دەیوت: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: ((بێگومان فیتنە ئا لەوێوە دێت- بەدەستی ئاماژەی کرد بەرەو خۆر هەڵات- لەوێوە هەردوو شاخی شەیتان هەڵدێت)). ئێوەش لەناو خۆتاندا هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان دەدەن، حەزرەتی موسا سەلامی خوای لەسەر بێت ئەو زەلامەی کە کوشت لەدەست و پێوەندی فیرعەون بەهەڵە کوشتی، کەچی خوای بالا دەست {پێی} فەرمووی کە ئەمە واتاکەیەتی: ﴿زەلامێکت کوشت کەچی ئێمە لەدەست خەم و خەفەت تۆمان ڕزگار کرد و تۆمان توشی جۆرەها تاقیکردنەوەی سەخت کرد﴾.

## ( ٨ ) دابەشکردنی گەنجینەکانی کیسرا و قەیسەر لە ڕێی خوادا

١٩١٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قَدْ مَاتَ كِسْرَى فَلَا كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلَا قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ)). [بخاري/ الجهاد/ ٢٨٦٤]

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((کیسرا مردووە کیسرایەکی تر پاش ئەو نابێت، کاتێك قەیسەریش مرد قەیسەرێکی تر پاش ئەو نابێت سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە دڵنیابن گەنجینەکانیان لە ڕێی خوادا دەبەخشنەوە)).

١٩١٥ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَتَفْتَحَنَّ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ -أَوْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ- كَنْزَ آلِ كِسْرَى الَّذِي فِي الْأَبْيَضِ)). قَالَ قُتَيْبَةُ: ((مِنَ الْمُسْلِمِينَ)). وَلَمْ يَشُكَّ.

(جـابر)ی کـوڕی (سمـرة)دەڵـێ: لـە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیسـتووە، دەفەرمووێ: ((بەدڵنیاییەوە {لەمەولا} کۆمەڵێکی جەربەزە لە موسڵمانان-یان لە بڕواداران- گەنجینـەی بنەماڵەی کیسرا دەشـکێنن ئـەو گەنجینەیـەی کەلـە کۆشـکە سـپیەکەیدایە)). (قتیبـة) دوو دڵ نیـە لـەوەی کـە فـەرمووی: ((لـە موسڵمانان)).

## ( ٩ ) لەناوچونی ئەم ئوممەتە لە ناو خۆیاندا بەدەستی یەکتری

١٩١٦ـ عَنْ ثَوْبَانَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ زَوَى لِيَ الْأَرْضَ فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا، وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ الْأَحْمَرَ وَالْأَبْيَضَ، وَإِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي أَنْ لَا يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ وَأَنْ لَا يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ، وَإِنَّ رَبِّي قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لَا يُرَدُّ، وَإِنِّي أَعْطَيْتُكَ لِأُمَّتِكَ أَنْ لَا أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لَا أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ، وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا -أَوْ قَالَ: مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا- حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضًا، وَيَسْبِي بَعْضُهُمْ بَعْضًا)).

(ثوبان)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بێگومـان خـوا تـەنگی زەوی بۆ هێنامـەوە یەك، خۆر هـەڵات و خـۆر ئـاوایم بینـی، دەسـەڵاتی ئومەتەکەیشم دەگاتە ئەو ڕادەیـەی کـە بۆم هێنراوەتەوەیـەك، هـەردوو گەنجینـە سوور و سپیەکەیشم پـێ خـەڵات کراوە [مەبەسـت گـەنجی قەیسـەر و کیسرا] هەروەها من داوام لە پەروەردگارم کرد کە ئومەتەکەم بە گشتی بەو وشکە ساڵی و قات و قڕیە لەناو نەبات و، دووژمنی بەدەر لە خۆیان بەسەریاندا زاڵ نەکات، بەڕادەیەك ڕەگ و ڕیشەیان لەبن دەربێنێ، هـەروەها پـەروەردگارم فەرموویـەتی: ئـەی (محمد) کاتـێ من بڕیارێکم دەرکـرد تـازە گەڕانـەوەی نـابێت، مـن ئـەوەم خـەڵات کردووە بـە ئومەتەکەت کـە بـەو وشـکە سـاڵی و قـات و قـڕی بەگشـتی لەناویان نەبەم و، دوژمنی بەدەر لە خۆیان بەسەردا زاڵ نەکـەم. بەڕادەیەك ڕەگ و ڕیشەیان لەبن دەربێنێ، یـاوەکو هـەرچی خـەڵکی سەر زەوی هەیـە لـە هـەموو لایەکـەوە گەلـە کۆمـەیان لێبکـەن تـاوەکو خۆیـان لـە نـاو خۆیـاندا هـەندێکیان هـەندێکیان لـەناو دەبـەن و هـەندێکیان هـەندێکیان بـەدیل دەگـرن و تاڵانیـان دەکەن)).

١٩١٧ـ عَنْ عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَقْبَلَ ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْعَالِيَةِ، حَتَّى إِذَا مَرَّ بِمَسْجِدِ بَنِي مُعَاوِيَةَ دَخَلَ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْنَا مَعَهُ، وَدَعَا رَبَّهُ طَوِيلًا، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَيْنَا فَقَالَ (ﷺ): ((سَأَلْتُ رَبِّي ثَلَاثًا، فَأَعْطَانِي ثِنْتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً: سَأَلْتُ رَبِّي أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالسَّنَةِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالْغَرَقِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ، فَمَنَعَنِيهَا)).

(عـامر)ی کـوڕی (سـعد) (ﷺ) لـە باوکیـەوە: کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕۆژێکیان لە بەرزاییەکانی مەدینەوە هاتەوە، هەتا کاتێ ڕابورد بەلای مزگـەوتی تیرەی (معاوية)دا، چووە ژورەوە دوو ڕکات نوێـژی کـرد، ئێمـەش نوێژمان لـە خزمەتدا کرد زۆر لە پـەروەردگاری پاڕایـەوە، پاشـان لای کـردەوە بـەلاماندا و فـەرمووی: ((سـێ داوام لـــە پـــەروەردگارم کـــرد، دوانیـــانی پێخـــەڵاتکردم و یـەکێکیانی لێوەرنـەگرتم: داوام لـە پـەروەردگارم کـرد کـە ئومەتەکـەم بـەم وشـکە ساڵی لەناو نەبات پێی خەڵات کردم، داوام لێکرد کە ئوممەتەکـەم بـە خنکـاندن لەناو نەبات [ئەویش] پێی خەڵات کردم، داوام لێکرد لە نێـوان خۆیـان دا یـەکتر لەناو نەبەن پێی خەڵات نەکردم)).

## ( ١٠ ) لاسایی کردنەوەی خوو نەریتی پێشینان

١٩١٨ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ، شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ لَاتَّبَعْتُمُوهُمْ)). قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، آلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: ((فَمَنْ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٦٩]

(ابـو سـعيد)ی (الخـــدري)دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بێگومان لەمەولا دەکەونە شوێن خوو نەریتی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بـوون. بست بە بست و، گەز بە گەز، تا وەکو بەڕادەیەك ئەگـەر ئـەوان خۆیـان بکـەن بە کونـی بـزن مژەدا ئێـوەش شوێنیان دەکـەون)). وتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، گاور و جولەکەکان؟ فەرمووی: ((ئەی کێ؟)).

## ( ١١ ) وازهێنـان لە قورەیش

١٩١٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((يُهْلِكُ أُمَّتِي هَذَا الْحَيُّ مِنْ قُرَيْشٍ)). قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: ((لَوْ أَنَّ النَّاسَ اعْتَزَلُوهُمْ)). [بخاري/ المناقب/ ٢٤٠٩]

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((ئومەتەکەم بەدەستی ئەم تیرەیە لە قورەیش لەناو دەچن)). وتیان: ئەی فەرمانمان بەچی پێدەکەیت؟ فەرمووی: ((ئەگەر خەڵکی وازیان لێبهێنایە لێیان دوورکەوتنایەتەوە))

## ( ١٢ ) لەکاتی فیتنەدا دانیشتوو لە ڕاوەستاو چاکترە

١٩٢٠ـ عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ، أَلَا ثُمَّ تَكُونُ فِتْنٌ، أَلَا ثُمَّ تَكُونُ فِتْنٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي فِيهَا، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي إِلَيْهَا، أَلَا فَإِذَا نَزَلَتْ -أَوْ: وَقَعَتْ- فَمَنْ كَانَ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ)). قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ مَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِبِلٌ وَلَا غَنَمٌ وَلَا أَرْضٌ؟ قَالَ: ((يَعْمِدُ إِلَى سَيْفِهِ فَيَدُقُّ عَلَى حَدِّهِ بِحَجَرٍ، ثُمَّ لِيَنْجُ إِنِ اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ. اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ)). قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ أُكْرِهْتُ حَتَّى يُنْطَلَقَ بِي إِلَى أَحَدِ الصَّفَّيْنِ -أَوْ: إِحْدَى الْفِئَتَيْنِ- فَضَرَبَنِي رَجُلٌ بِسَيْفِهِ، أَوْ يَجِيءُ سَهْمٌ فَيَقْتُلُنِي؟ قَالَ: ((يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ، وَيَكُونُ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ)).

(أبو بكر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((بێگومان لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت بزانن ئاگاداربن دیسان پێتان دەڵێم لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت، دیسان ئاگادار بن لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت، ئەوەی دانیشتووە تێیدا باشترە لەوەی بەناویدا دەڕوات، ئەوەیشی تێیدا دەڕوات باشترە لەوەی بە تەکان بەرەو پیریەوە دەچێت، ئاگاداربن کاتێکیش دابەزییە ناوتان-یا ڕوویدا- با هەرکەسێك حوشتری هەبوو بچێتە بەلای حوشترەکەی خۆیەوە و، هەرکەسیش مەڕی هەبوو بابچێت بەلای مەڕی خۆیەوە، هەرکەسیش زەوی و زاری هەبوو بابچێت بەلای زەوی و زاری خۆیەوە)). دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە گەر هات و کەسێك

نە وشتری هەبوو نە مەڕی هەبوو نەزەوی و زاری هەبوو؟ فەرمووی: ((با بچێت شمشێرەکەی بێنێت بە بەردێك دەمەتیژە بڕندەکەی کەل و کوڵ بکات، پاشان ئەگەر توانی خۆی ڕزگار بکات، ئەی خوایا ئایا ڕام گەیاند، ئەی خوایا ئایا ڕام گەیاند، ئەی خوایا ئایا ڕام گەیاند)). دەڵێ: پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر زۆرم لێکراو بڕام بۆلای یەکێك لەو دوو پۆلە-یا ئەو دوو تاقمە- و پیاوێك بە شمشێرەکەی لێیدام، یاخوود تیرێك هاتوو و کوشتمی؟ فەرمووی: ((ئەو کاتە ئەو کەسە تاوانی خۆیشی و تۆیش هەڵدەگرێت و دەبێتە یاوەری دۆزەخ)).

## ( ١٣ ) کاتێ دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان لە ڕووی یەکدا وەستان بکوژ و کوژراو لە ئاگردان

١٩٢١ـ عَنِ الْأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: خَرَجْتُ وَأَنَا أُرِيدُ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ: فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ يَا أَحْنَفُ؟ قَالَ: قُلْتُ: أُرِيدُ نَصْرَ ابْنِ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). يَعْنِي عَلِيًّا (ﷺ). قَالَ: فَقَالَ لِي: يَا أَحْنَفُ ارْجِعْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ)). قَالَ: فَقُلْتُ -أَوْ قِيلَ-: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: ((إِنَّهُ قَدْ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ)). [بخاري/ الإيمان/ ٣١]

(احنف)ی کوڕی (قیس) دەڵێ: بەنیازی ئەو پیاوە دەرچوومە دەر، (أبو بکره)م پێگەیشت وتی: دەتەوێ بۆ کوێ بچیت ئەی (احنف)؟ دەڵێ: منیش وتم دەمەوێ یارمەتی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەم. مەبەستی (عەلی (ﷺ)) بوو. پێی وتم: ئەی (احنف) بگەڕێرەوە، چونکە من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((کاتێك دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەك وەستان ئەوا بکوژ و کوژراو لە ئاگردایە)). دەڵێ: من وتم یان وترا: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەمە بکوژ ئەی کوژراو بۆ؟ فەرمووی: ((چونکە ئەویش ویستویەتی هاوەڵەکەی بکوژێ)).

## ( ١٤ ) تاقمە دەست درێژەکارەکە ( عمار ) دەکوژن

١٩٢٢ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تَقْتُلُ عَمَّارًا الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ)). [بخاري/ المساجد/ ٤٣٦]

(أم سلمة)دەڵێ: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((تاقمـە دەسـت درێـژە کارەکە (عمار) دەکوژن)).

## ( ١٥ ) قیامەت نایەت هەتا دوو تاقمی گەورە کوشتار لەیەکتری نەکەن

١٩٢٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ، وَتَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ، وَدَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ)). [بخاري/ المناقب/ ٣٤١٣]

(ابـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((قیامـەت هەڵناسـێت تـا دوو تـاقمی گـەورە کوشـتار لەیـەکتری نەکـەن، لـەنێوانیان دا کوشتارێکی زۆر گەورە دەبێت یەك داوایان هەیە)).

## ( ١٦ ) قیامەت هەڵناستێت تا پیاو خۆزگە بە مردوو نەخوازێت

١٩٢٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ عَلَى الْقَبْرِ فَيَتَمَرَّغُ عَلَيْهِ، وَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي كُنْتُ مَكَانَ صَاحِبِ هَذَا الْقَبْرِ، وَلَيْسَ بِهِ الدِّينُ، إِلَّا الْبَلَاءُ)). [بخاري/ الفتن/ ٦٦٩٨٤]

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سوێند بەو کەسەی گیانی منـی بەدەستە ، دونیـا تەواو نـابێت تـاوەکو وای لێدێـت پیـاو بەلای گۆڕدا دەڕوات و تەپاوتلی لەسەر دەکات و دەڵێت: ((ئای خۆزگە لەجێی ئەم خـاوەن گـۆڕە دەبـووم، خـۆ وەنـەبێ لەبـەر قـەرزاری وا بکـات، بـەڵکو لەبـەر بەلایە)).

## ( ١٧ ) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو کوشتن و بڕین زۆر دەبێت

١٩٢٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الْهَرْجُ)). قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((الْقَتْلُ الْقَتْلُ)). [بخاري/ الاستسقاء/ ٩٨٩]

لە(ابو هريره)ەوە (ﷺ) کە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((قیامـەت هەڵناسێت تاوەکو (هـرج) زۆر دەبێت)) وتیـان: (هـرج) چییـە ئەی پێغەمبـەری خوا؟ فەرمووی: ((کوشتن، کوشتن)).

## (١٨) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو بکوژ و کوژراو هیچیان نازانن لەسەر چی دەکوژن یا دەکوژرێن

١٩٢٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَأْتِيَ عَلَى النَّاسِ يَوْمٌ لَا يَدْرِي الْقَاتِلُ فِيمَ قَتَلَ، وَلَا الْمَقْتُولُ فِيمَ قُتِلَ)). فَقِيلَ: كَيْفَ يَكُونُ ذَلِكَ؟ قَالَ: ((الْهَرْجُ، الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ)).

(ابو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((سوێند بـەو کەسەی گیانی منـی بەدەستە، دونیا دوایـی نایـەت تاوەکو ڕۆژێکـی وا بەسەر خەڵکیدا دێت نەبکوژ دەزانێت لەسەر چی دەکوژێت و، نـە کوژراویش دەزانێت لەسەر چـی کـوژراوە)). وتـرا: ئـەوە چـۆن دەبێـت؟ فەرمووی: (({هـرج} دەبێـت بکوژ و کوژراو لە ئاگردان)).

## (١٩) دەرچوونی ئاگر لە خاکی حیجازەوە

١٩٢٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ، تُضِيءُ أَعْنَاقَ الْإِبِلِ بِبُصْرَى)). [بخاري/ الفتن/ ٦٧٠١]

(أبي هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((قیامـەت هەڵناسێت تاوەکو ئاگرێك لە خاکی حیجازەوە دەردەچێت، لە (بُصری)ەوە ملی حوشتری پێ ڕووناك دەبێتەوە)).

## (٢٠) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو (لات)و (عوززا) دەپەرستڕێنەوە

١٩٢٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَا يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللَّاتُ وَالْعُزَّى)). فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ كُنْتُ لَأَظُنُّ حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ (ﷻ): ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ أَنَّ ذَلِكَ تَامًّا. قَالَ: ((إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيَبْقَى مَنْ لَا خَيْرَ فِيهِ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ)).

(عائشة)دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: ((شەو و ڕۆژ دوایی نایەت تا {سەر لەنوێ} (لات) و (عوززا) دەپەرسترێن)) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من وام گومان دەبرد کاتێ خوای باڵا دەست ئایەتی ﴿هو الذي ارسل رسوله بالهدى و دين الحق ليضهره على دين كله ولو كره المشركون﴾ی نـارد ئیـتر ئـەوە ئێجگـاریی دەبێـت. فـەرمووی: ((ئـەوە وا دەبێـت چـەند خـوا

بیەوێت، پاشان خوا شنە بایەکی خۆش هەڵدەکات هەرکەسێك بە ئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت دەیمرێنێت، ئەو کاتە ئەوانە دەمێننەوە کە خێریان تێدا نیە، ئیتر دەگەڕێنەوە سەر ئاینی باو باپیرانیان)).

## ( ٢١ ) قیامەت هەڵناسێت هەتا شارێك ڕزگار دەكرێت کە لایەکی لەوشکانیدایە و لایەکی لەدەریادا

١٩٢٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَحْرِ)). قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَغْزُوَهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِي إِسْحَقَ، فَإِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلَاحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ، قَالُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا – قَالَ ثَوْرٌ: لَا أَعْلَمُهُ إِلَّا قَالَ– الَّذِي فِي الْبَحْرِ، ثُمَّ يَقُولُوا الثَّانِيَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الْآخَرُ، ثُمَّ يَقُولُوا الثَّالِثَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، فَيُفَرَّجُ لَهُمْ، فَيَدْخُلُوهَا فَيَغْنَمُوا، فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْمَغَانِمَ، إِذْ جَاءَهُمُ الصَّرِيخُ فَقَالَ: إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَرَجَ، فَيَتْرُكُونَ كُلَّ شَيْءٍ وَيَرْجِعُونَ)).

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەم شارەتان بیستووە کە لایەکی لەوشکانی و لایەکی لە دەریادایە)). وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((قیامەت هەڵناسێت تاوەکوو حەفتا هەزار کەس لەنەوەی (أسحاق) لەشکر کێشی بۆ دەکەن، کاتێ کە بۆی دێن دادەبەزن نە بەچەك جەنگدەکەن ونەتیر دەتەقێنن، بەڵکو دەڵێن: لا الـه الا الله و الله اکبر، لایەکی دەگرێت –(ثور) دەڵێ: من وا دەزانم کە فەرمووی: ئەو لایەی کە لە دەریادایە– پاشان دووبارە دەڵێن: لا الـه الا الله و الله اکبر، ئەو لاکەی تریشی دەگیرێت، پاشان هەمدیسان بۆ جاری سێهەم دەڵێن: لا الـه الا الله و الله اکبر، ڕێگەیان بۆ چۆڵ دەکرێت دەچنە ناویەوە دەکەونە کۆکردنەوەی دەستکەوت لە کاتێکدا کە خەریکی دابەشکردنی دەستکەوتەکان دەبن، هاوارێکیان پێدەگات و دەڵێت: دەجاڵ دەرچوو، ئیتر هەموو شتێك وازلێدێنن و دەگەڕێنەوە))

## ( ٢٢ ) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو ( فورات ) کێوێکی زێڕین دەردەخات

١٩٣٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ، يَقْتَتِلُ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ

وَتِسْعُونَ، وَيَقُولُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ: لَعَلِّي أَكُونُ أَنَا الَّذِي أَنْجُو)). [بخاري/ الفتن/ ٦٧٠٢]

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خــوا (ﷺ) فەرموویــەتی: ((قیامــەت هەڵناسێت تاوەکو فورات کێوێکی زێڕین دەردەخات، ئەو جا خەڵکی بەشەڕ دێن لەسەری لەهەر سەد کەسێك نەوەد و نۆیان دەکوژرێن، هەر پیاوێك لەوان دەڵێت: ئومێدم وایە ئەو کەسەی ڕزگار دەبێت خۆم بم)).

١٩٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلَا يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا)). [بخاري/ الفتن/ ٦٧٠٢]

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((نزیکە فورات خۆی داماڵێت لە گەنجینەیەکی زێڕین، هەرکەس گەیشتە ئەو ڕۆژە با هیچی لێهەڵنەگرێت)).

## ( ٢٣ ) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو جەنگ لەگەڵ قەومێك دەکەن دەموو چاویان وەك قەڵغانی ڕووپۆشە

١٩٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تُقَاتِلُونَ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، حُمْرُ الْوُجُوهِ، صِغَارُ الْأَعْيُنِ)). [بخاري/ الجهاد/ ٢٧٧٠]

لە(أبي هريرة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لە پێش هاتنی قیامەتدا لەگەڵ هۆزێکدا دەجەنگن کەوشیان لە مووە، دەموو چاویان هەردەڵێی قەڵغانی ڕووپۆش کراوە {واتا دەمووچاویان خڕو گۆشتنە}. ڕوومەت سوور و چاو بچکۆلەن))

## ( ٢٤ ) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو پیاوێکی ستەمکار لە ( قحطان ) دەردەچێت

١٩٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ)). [بخاري/ المناقب/ ٣٣٢٩]

(ابي هريـرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((قیامــەت هەڵناسێت تاوەکوو پیاوێك لە هۆزی (قحطان) پەیدا دەبێت خەڵکی بە [زەبر]ی دار دەستەکەی دەیانبات بەڕێوە)).

**( ٢٥ ) قیامەت هەڵناسێت تا لەسەر زەویدا کەس نەمێنێ بڵێ الله. الله.**

١٩٣٤ـ عَنْ انس (ﷺ): ان رسول الله (ﷺ) قال: ((لا تقومُ الساعَة حتى لا يقال في الأرض الله الله)).

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((قیامەت هەڵناسێت تاوەکو لەسەر زەویدا کەس نەمێنێت بڵێت (الله، الله)).

**( ٢٦ ) ناردنی شنەبا لەیەمەنەوە بۆ گیانکێشانی باوەڕداران**

١٩٣٥ـ عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ ريحًا من الْيمَن أَلْينَ من الْحرير، فَلَا تَدَعُ أَحَدًا في قَلْبِه –قَالَ أَبُو عَلْقَمَةَ: مثْقَالُ حَبَّةٍ، و قال عبْدُ الْعَزِيز –مِثْقَالُ ذَرَّةٍ منْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ)).

(ابي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوا شنەبایەك لە (یەمەن)ەوە هەڵدەکات نەرم و ناسکترە لە ئاوریشم، هەر کەسێك بە ئەندازەی دانەوێڵەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت گیانی دەکێشێت)). عەلقەمە دەڵێ: دانەوێڵەیەك، (عبدالعزیز)یش دەڵێت: بە ئەندازەی گەردێك.

**( ٢٧ ) قیامەت هەر لەسەر خراپەکارەکان هەڵدەستێت**

١٩٣٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) عَنِ النَّبيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شرار النَّاس)). [بخاري/ الفتن/ ٦٦٥٦]

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((قیامەت هەر لەسەر خراپەکارەکان هەڵدەسێت)).

**( ٢٨ ) قیامەت هەڵناسێت تاوەکوو چەند کەسێکی درۆزن و ساختەچی پەیدا دەبن**

١٩٣٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلَاثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ)). [بخاري/ المناقب/ ٣٤١٣]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((قیامەت هەڵناسێت تاوەکو چەند کەسێکی درۆزنی ساختەچی پەیدادەبن کە نزیکەی سی کەسێکن، هەریەك لەوان خۆی بە پێغەمبەری خوا دەزانێت))

١٩٣٨ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ بَيْنَ يَدَي السَّاعَةِ كذابين)) وفي رواية: قَالَ جَابِرٌ: فَاحْذَرُوهُمْ.

(جابر)ی کوڕی (سمرە) دەڵــێ: لــە پێغەمبــەری خــوام (ﷺ) بیسـت کــە دەیفەرموو: ((بێگومان لە پێش هاتنی قیامەتدا چەند درۆزنێك هەن)). لـە ڕیوایەتێکدا (جابر) دەڵێ: وریای خۆتان بن.

## ( ٢٩ ) جەنگ کردنی موسڵمانان لەگەڵ جوولەکەدا

١٩٣٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ، فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ، حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْحَجَرِ وَالشَّجَرِ، فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوِ الشَّجَرُ: يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللَّهِ، هَذَا يَهُودِيٌّ خَلْفِي، فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ. إِلَّا الْغَرْقَدَ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ)). [بخاري/ الجهاد/ ٢٧٦٨]

(أبـي هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((قیامـەت هەڵناسـێت تـاوەکو موسـڵمانەکان لەگـەڵ جوولەکـەدا دەجـەنگن، ئـەو جـا موسڵمانەکان کوشتاریان لێ دەکەن، تـاوای لێدێـت جوولەکـە لـە پشـتی دار و بەردەوە خۆیان حەشاردەدەن ئینجا دارەکە یا بەردەکە دەڵێت: ئەی موسڵمان ئەی بەندەی خوا ئەم جوولەکەیە لە پشتمەوە وەرە بیکوژە، جگە لـەدرەختی (غرقد) چونکە لە دەرختی جولەکەکانە)).

## ( ٣٠ ) کە قیامەت هەڵدەسێت ڕۆمەکان لە هەموو خەڵکی زۆرترن

١٩٤٠ـ عَنْ مُوسَى بْنُ عُلَيِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ الْمُسْتَوْرِدُ الْقُرَشِيُّ عِنْدَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ): سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ)). فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو: أَبْصِرْ مَا تَقُولُ قَالَ: أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ: لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالًا أَرْبَعًا: إِنَّهُمْ لَأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ، وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ، وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ، وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ، وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ: وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ الْمُلُوكِ.

(موسـی)ی کوڕی (عُلَـيّ)لـە باوکیـەوە دەڵـێ: (المسـتورد)ی (القرشـي)لای (عمرو)ی کوڕی (عـاص) وتـی: گوێـم لـە پێغەمبـەربوو (ﷺ) دەیفـەرموو: ((کـە قیامەت هەڵدەستێ ڕۆمەکان زۆرترینـی خـەڵکن)) (عمرو)یش وتـی:بزانە چی دەڵێت. وتی: ئەوە دەڵێم کە لـە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیستووە وتـی: ئەگـەر وادەڵێیت ئەوە لـە بەر ئەوەیە چونکە چوار خوونـەریتی {جوانیـان} تێدایـە: ئەوانە لە هەموو کەس بە حیلم و حەوسەڵە ترن لەکاتی بەڵاو فیتنەدا، لەهـەموو کەسیش زووتر دێنەوە سەرخۆیان لەپاش بەڵاو ناڕەحەتی، لەهـەموو خـەڵکیش

زیاتر نزیك ترن لەبادانەوە سەر دوژمن پاش هەلاتن، چاكترین كەسیشن لە دەرحەق هەژار و هەتیو و بێ دەسەلات. پێنجەمیش چاكەیەكی جوانی دیكەشیان هەیە: كەلە هەموو كەس قایم و قوڵ ترن لە بەرهەڵستی كردن لە زۆر و ستەمی پادشایان)).

**( ٣١ ) لەبارەی جەنگ لەگەڵ ڕۆمەكان كاتی دەرچوونی دەجاڵ**

١٩٤١ـ عَنْ يُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: هَاجَتْ رِيحٌ حَمْرَاءُ بِالْكُوفَةِ فَجَاءَ رَجُلٌ لَيْسَ لَهُ هِجِّيرَى إِلَّا: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ جَاءَتِ السَّاعَةُ. قَالَ: فَقَعَدَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ: إِنَّ السَّاعَةَ لَا تَقُومُ حَتَّى لَا يُقْسَمَ مِيرَاثٌ، وَلَا يُفْرَحَ بِغَنِيمَةٍ. ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا وَنَحَّاهَا نَحْوَ الشَّأْمِ، فَقَالَ: عَدُوٌّ يَجْمَعُونَ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ وَيَجْمَعُ لَهُمْ أَهْلُ الْإِسْلَامِ. قُلْتُ: الرُّومَ تَعْنِي؟ قَالَ: نَعَمْ، وَتَكُونُ عِنْدَ ذَاكُمُ الْقِتَالِ رَدَّةٌ شَدِيدَةٌ، فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يُمْسُوا، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الرَّابِعِ نَهَدَ إِلَيْهِمْ بَقِيَّةُ أَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَيَجْعَلُ اللَّهُ الدَّبْرَةَ عَلَيْهِمْ، فَيَقْتُلُونَ مَقْتَلَةً -إِمَّا قَالَ: لَا يُرَى مِثْلُهَا، وَإِمَّا قَالَ- لَمْ يُرَ مِثْلُهَا، حَتَّى إِنَّ الطَّائِرَ لَيَمُرُّ بِجَنَبَاتِهِمْ فَمَا يُخَلِّفُهُمْ حَتَّى يَخِرَّ مَيْتًا، فَيَتَعَادُّ بَنُو الْأَبِ كَانُوا مِائَةً، فَلَا يَجِدُونَهُ بَقِيَ مِنْهُمْ إِلَّا الرَّجُلُ الْوَاحِدُ، فَبِأَيِّ غَنِيمَةٍ يُفْرَحُ، أَوْ أَيُّ مِيرَاثٍ يُقَاسَمُ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ هُوَ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ، فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ: إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِي ذَرَارِيِّهِمْ، فَيَرْفُضُونَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ وَيُقْبِلُونَ، فَيَبْعَثُونَ عَشَرَةَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنِّي لَأَعْرِفُ أَسْمَاءَهُمْ وَأَسْمَاءَ آبَائِهِمْ وَأَلْوَانَ خُيُولِهِمْ، هُمْ خَيْرُ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ. أَوْ: مِنْ خَيْرِ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ)).

(يُسير)ی كوڕی (جابر) دەڵێ: بایەكی تۆزاوی هەڵی كرد لە (كوفە) لەو كاتەدا پیاوێك هات هیچی پێنەكرا مەگەر ئەوە نەبێت كە دەیوت: ئەی (عبدالله)ی كوڕی (مسعود)وا قیامەت هات. دەڵێ: ئەوەیش كە پاڵیدابوویەوە، ڕاست بوویەوە و دانیشت، وتی: قیامەت هەڵناسێ تاوەكوو وای لێدێت

نـەمیرات دابەش دەکرێت و نـە دڵ بە دەسـتکەوتی جـەنگ خـۆش دەکرێـت و، پاشـان بـە دەسـتی ئامـاژەی کـرد ڕووەو شـام و وتـی: دوژمنـانێك خۆیـان کۆدەکەنـەوە بۆ ئیسلام خوازان و ئیسلام خوازانیش خۆیـان کۆدەکەنـەوە بـۆ ئـەوان وتم: مەبەسـتت لـە ڕۆمەکانـە؟ وتـی: بـەڵێ، ئیـتر لەوکاتـەدا جـەنگ بەرپادەبێت، بگرە و بەردەیەکی سەختی ئەو تۆ کە موسڵمانان پەیمانی مەرگی تێـدا دەدەن کـەتا سـەرنەکەون نەگەڕێنـەوە، ئینجـا کوشـتار دەسـت پێدەکـەن تاوەکو شەو دادێت و دەبێتە بەربەست لە نێوان ئەمان و ئەواندا، ئیتر هـەردوو لا ئـەمانیش و ئەوانیش دەگەڕێنـەوە هیچیان نابەزن و مەرجەکـەش نایەتـەدی، پاشان موسڵمانانان مەرجێکی دیکە دەدەن یا دەبێت بمرن یا بەسەرکەوتوویی بگەڕێنەوە، دیسان دەکەونەوە کوشتار کردن تاوەکوو شەویان بەسـەردا دێت و دەبێتە بەربەست لە نێوانیاندا ئیتر هەردوولا دەگەڕێنـەوە ئەمانیش و ئـەوانیش بـێ ئـەوەی هیچیـان ببـەزن و مەرجەکـەیش نایەتـەدی، پاشـان موسـڵمانان مـەرجێکی دیکـە دەدەن یـا دەبێـت بمـرن یـا بەسـەرکەوتووی بگەڕێنـەوە، هەمدیسان دەکەونـەوە کوشـتار کـردن تـاوەکو ئێوارەیـان بەسـەردا دێـت، ئیـتر هـەردوولا ئـەمانیش و ئـەوانیش دەگەڕێنـەوە بـێ ئـەوەی هیچیـان ببـەزن و مەرجەکەیش نایەتـە دی، پاشـان بـۆ ڕۆژی چـوارەم چـی مـاوە لـە پاشمـاوەی ئیسلام خـوازان بـەرەو ڕوویـان دەردەپـەڕن، تـاوەکو خـوا تێکیـان دەشـکێنێ، جـەنگێکی خوێنـاوی بـێ وێنـەی کـەس نـەدیدە دەکـەن، بەڕادەیـەك بـاڵندە گوزەردەکات بەملاولایاندا بەجێیان ناهێڵێت هەتا دەمرێ و دەکەوێتە خوارەوە. {وایلێدێت} بەرەبابێك کە سەد کەس بووبن سەرژمێری خۆیان دەکـەن دەبینـن تاقلەبڕبوون و تەنها یەك پیاویان ماوە، ئیتر بەچ دەستکەوتێك دڵخۆش بکرێت، یاخود چ میراتێك دابەش بکرێت، لـە کـاتێکدا ئـەمان لـەم حاڵـەدا دەبن گوێیـان لێدەبێت کە بەڵایـەکی لـەوە گـەورەتر دامێن گیریان بووە، کاتـێ جـارچی دێتـە لایـان و هاواریـان لێدەکـات: جـەجاڵ لـە دوای خۆیـان بەربۆتـە نـاو مـاڵ و منداڵیانەوە، ئەوانیش چییان پێیە هەر هـەمووی فڕێ دەدەن و ڕوو دەکەنـەوە {ماڵەوە}، دەسوار چـاك لـە پێـش خۆیانـەوە دەنـێرن. پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێت: ((مـن زۆرچـاك نـاوی خۆیـان و باوکیـان و ڕەنـگ و شـێوەی

ئەسپەکانیان دەزانم، ئەوان لە ڕۆژەدا چاکترین سواری سەر زەوین، یان لەو ڕۆژەدا لە چاکترین سواری سەر زەوین)).

## ( ٣٢ ) ئەو سەرکەوتنانەی کە موسڵمانان پێش هاتنی جەجال بەدەستی دەهێنن

١٩٤٢ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةٍ، قَالَ: فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ الْمَغْرِبِ عَلَيْهِمْ ثِيَابُ الصُّوفِ، فَوَافَقُوهُ عِنْدَ أَكَمَةٍ، فَإِنَّهُمْ لَقِيَامٌ، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَاعِدٌ، قَالَ: فَقَالَتْ لِي نَفْسِي: ائْتِهِمْ فَقُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ لَا يَغْتَالُونَهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ: لَعَلَّهُ نَجِيٌّ مَعَهُمْ، فَأَتَيْتُهُمْ فَقُمْتُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ، قَالَ: فَحَفِظْتُ مِنْهُ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ أَعُدُّهُنَّ فِي يَدِي، قَالَ: ((تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ (ﷻ)، ثُمَّ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ (ﷻ)، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ (ﷻ)، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ ﷻ)). قَالَ: فَقَالَ نَافِعٌ: يَا جَابِرُ، لَا نَرَى الدَّجَّالَ يَخْرُجُ حَتَّى تُفْتَحَ الرُّومُ.

لە(جابر)ی کوڕی (سمرە)وە، ئەویش لە (نافع)ی کوڕی (عقبە)وە (ﷺ) دەڵێ: لە جەنگێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، دەڵێ: لەوکاتەدا هۆزێك لە خۆر ئاواوە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرگی خورییان لەبەردابوو، لای تەپۆڵکەیەکدا پێی گەیشتن، لە کاتێکدا ئەوان بەپێوە بوون پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دانیشتبوو، دەڵێت: دڵی خۆم پێی وتم: بچۆ بۆلایان لە نێوانیاندا ڕاوەستە نەوەکوو بەدزیەوە بیکوژن، دەڵێ: پاشان وتم: دەگونجێت نهێنییەکی لەگەڵیاندا هەبێت. منیش هاتم لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ) و ئەواندا ڕاوەستام و،چوار وشەی لێوە فێربووم کە بەپەنجەی دەست دەیانژمێرم، فەرمووی: ((جەنگی دورگەی عەرەب دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات، پاشان {جەنگی} فارس دەکەن خوای باڵا دەست ئازادی دەکات، پاشان جەنگی ڕۆمەکانیش دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات، پاشان جەنگی جەجاڵیش دەکەن خوای گەورە لەناوی دەبات)) دەڵێ: (نافع) وتی: ئەی (جابر)، وانابینین جەجاڵ دەرچێت تا ڕۆمەکان نەگیرێن.

## ( ٣٣ ) گرتنی قسطنطینیە

١٩٤٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بِالْأَعْمَاقِ أَوْ بِدَابِقٍ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ الْمَدِينَةِ مِنْ خِيَارِ أَهْلِ

الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ، فَإِذَا تَصَافُّوا قَالَتِ الرُّومُ: خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ، فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ: لَا وَاللَّهِ، لَا نُخَلِّي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا، فَيُقَاتِلُونَهُمْ فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لَا يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ أَبَدًا، وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللَّهِ، وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ، لَا يُفْتَنُونَ أَبَدًا، فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطَنْطِينِيَّةَ، فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْغَنَائِمَ، قَدْ عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بِالزَّيْتُونِ إِذْ صَاحَ فِيهِمُ الشَّيْطَانُ: إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَلَفَكُمْ فِي أَهْلِيكُمْ، فَيَخْرُجُونَ، وَذَلِكَ بَاطِلٌ، فَإِذَا جَاءُوا الشَّأْمَ خَرَجَ، فَبَيْنَمَا هُمْ يُعِدُّونَ لِلْقِتَالِ يُسَوُّونَ الصُّفُوفَ إِذْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ (عليه السلام)، فَأَمَّهُمْ، فَإِذَا رَآهُ عَدُوُّ اللَّهِ ذَابَ كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ، فَلَوْ تَرَكَهُ لَانْذَابَ حَتَّى يَهْلِكَ، وَلَكِنْ يَقْتُلُهُ اللَّهُ بِيَدِهِ، فَيُرِيهِمْ دَمَهُ فِي حَرْبَتِهِ)).

(أبـو هريـرة)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: ((قیامـەت هەڵناسێت تا ڕۆمەکان لە (أعماق) یا (دابق) دادەبەزن، ئینجا لەشکرێکیان لە مەدینەوە بۆ دەردەچێت کە لە چاکترینی دانیشتوانی سەرزەوین لەو ڕۆژگارەدا، کاتێ ڕیز دەبن. ڕۆمەکان دەڵێن: وازمان لێبێنن با بجەنگین لەگەڵ ئەوانەی کە لە ئێمە بوون و بەدیل گیران [موسڵمان بوون و ئێستا هاتوون دەجەنگن لەگەڵمان] موسڵمانەکان دەڵێن: نەبەخوا وازتان لێناهێنین بجەنگن لەگەڵ براکانمان، ئینجا دەجەنگن لەگەڵیان، سێیەکیان لە جەنگەکە هەڵدێن خوا تەوبەیان لێقبوڵ ناکات، سێیەکیشیان دەکوژرێن کە چاکترینی شەهیدانن لای خوا، سێیەکەکەی تریشیان سەردەکەون، هەرگیز تووشی فیتنە نابن، ئینجا (قسطنطنیە) ئازاد دەکەن لە کاتێکدا کە خەریکی دابەش کردنی دەسکەوتی جەنگەکەن، شمشێرەکانیان بە دارزەیتونەوە هەڵواسیووە، شەیتان بەدرۆ لەناویاندا هاوار دەکات: جەجاڵ دوای ئێوە چۆتە ناو ماڵ و منداڵتان، ئەوانیش دەردەچن کاتێ ئەوان سەرگەرمی خۆسازدان دەبن بۆ جەنگ ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن قامەت دەکرێت بۆ نوێژ، (عیسا)ی کوڕی (مریم) (عليه السلام) دادەبەزێت، پێش نوێژییان بۆ دەکات، کاتێ دوژمنی خوا دەیبینێ دەتوێتەوە وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، خۆ ئەگەر وازی لێبهێنایە خۆی لە خۆیدا دەتوایەوە تالە ناودەچوو، بەڵام خوا بەدەستی ئەو دەیکوژێت. خوێنەکەی بە ڕمەکەیەوە نیشانیان دەدات.

## ( ٣٤ ) ئەو سوپایەی کە ڕۆدەچێت

١٩٤٤ـ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ ابْنِ الْقِبْطِيَّةِ قَالَ: دَخَلَ الْحَارِثُ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَفْوَانَ وَأَنَا مَعَهُمَا عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (﵂)، فَسَأَلَاهَا عَنِ الْجَيْشِ الَّذِي يُخْسَفُ بِهِ؟ وَكَانَ ذَلِكَ فِي أَيَّامِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَعُوذُ عَائِذٌ بِالْبَيْتِ فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ)). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهًا؟ قَالَ: ((يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُمْ، وَلَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ)). وَقَالَ أَبُو جَعْفَرٍ: هِيَ بَيْدَاءُ الْمَدِينَةِ.

لە(عبیـداللە)ی کـوڕی (القبطیـة)ەوە دەڵێـت: مـن و (حـارث)ی کـوڕی (أبـو ربیعە)ەو (عبید اللە)ی کوڕی (صفوان) چووین بۆ سەردانی (أم سلمە)ی دایکی بڕواداران (﵂) هەردووکیان لێیان پرسی دەربارەی ئەو سوپایەی کە ڕۆدەچێت بە زەوی‌دا؟ ئەمەیش لەسەردەمی (أبن زبیر)دابوو، ئەوەیش وتـی: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((پەناهێندەیـەك پـەنادەبات بـۆ کەعبـە، سـوپایەکی بـۆ ڕەوانە دەکرێت، کاتێ دەگەنە دەشت و خاکێکی بەرفراوان ڕۆدەچن)) وتم: ئەی پێغەمبـەری خـوا، ئـەی ئـەوەی بە زۆر بردوویانە چی بەسـەر دێـت؟ فـەرمووی: ((ئەویش لەگەڵیان ڕۆدەچێت بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر نیاز ونیـەتی خـۆی زیندوو دەبێتەوە)) (أبو جعفر) دەڵێ: ئەو دەشتە دەشتی مەدینەیە.

## ( ٣٥ ) خانووەکانی مەدینە پێش قیامەت

١٩٤٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تَبْلُغُ الْمَسَاكِنُ إِهَابَ. أَوْ: يَهَابَ)). قَالَ زُهَيْرٌ: قُلْتُ لِسُهَيْلٍ: فَكَمْ ذَلِكَ مِنَ الْمَدِينَةِ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا مِيلًا.

(أبو هریرة)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خانووەکـان دەگەنـە (إهاب) یا (یهاب))) (زهیر)دەڵێ: بە (سهیل)م وت: باشە ئەو شوێنە لەمەدینەوە چەندە دوورە؟ ئەوەیش وتی: ئەوەندە و ئەوەندە میل دەبێت.

## ( ٣٦ ) قووڵ باریکەکەی حەبەشە کەعبە دەڕوخێنێت

١٩٤٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): ((يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ)). [بخاري/ الحج/ ١٥١٩]

(أبـو هریـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((زەلامە قـوڵ باریکەکەی حەبەشە کەعبە دەڕوخێنێت)).

## ( ٣٧ ) عێراق زیوەکەی خۆی گل دایەوە

١٩٤٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((منعت الْعِراقُ دِرْهَمَهَا وَقَفِيزَهَا، وَمَنَعَتِ الشَّأْمُ مُدْيَهَا وَدِينَارَهَا، وَمَنَعَتْ مِصْرُ إِرْدَبَّهَا وَدِينَارَهَا، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ)). شهد عَلَى ذَلِكَ لَحْمُ أَبِي هُرَيْرَةَ وَدَمُهُ.

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((عێراق درهەم و قەفیزی خۆی قەدەغە کرد، شامیش مەن و دیناری خۆی قەدەغە کرد میسریش ئوردب و دیناری خۆی قەدەغەکرد، لە کوێوە هاتن گەڕانەوە بۆ ئەوێ، لە کوێوە هاتن گەڕانەوە بۆ ئەوێ)) گۆشتی (ابو هريرة)شایەتی لەسەر ئەوە دەدات لەگەڵ خوێنەکەی. {مەبەست لەمە یان زاڵبوونی دوژمنە بەسەر ئەم وڵاتانەدا یان مەبەست جێبەجێ نەکردنی ئەرکە خواییەکانە، بەو هۆیەوە ڕسوایی و ژێر دەستەیی دایان دەگرێت، تا دەگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەی خۆیان}.

١٩٤٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَيْسَتِ السَّنَةُ بِأَنْ لَا تُمْطَرُوا، وَلَكِنِ السَّنَةُ أَنْ تُمْطَرُوا وَتُمْطَرُوا، وَلَا تُنْبِتُ الْأَرْضُ شَيْئًا)).

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((وشکە ساڵی ئەوە نیە بارانتان بۆ نەبارێت، وشکە ساڵی ئەوەیە داوای باران بکەن و بۆتان ببارێت کەچی زەویش هیچ نەڕوێنێت)).

## ( ٣٨ ) نەمانی ئیمان و ئەمانەت لەوڵاتدا

١٩٤٩ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَدِيثَيْنِ، قَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الْآخَرَ، حَدَّثَنَا: ((أَنَّ الْأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، ثُمَّ نَزَلَ الْقُرْآنُ، فَعَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ وَعَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ)). ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِ الْأَمَانَةِ قَالَ: ((يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْوَكْتِ. ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْمَجْلِ، كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفِطَ، فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ)). ثُمَّ أَخَذَ حَصًى فَدَحْرَجَهُ عَلَى رِجْلِهِ ((فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ، لَا يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الْأَمَانَةَ، حَتَّى يُقَالَ: إِنَّ فِي بَنِي فُلَانٍ رَجُلًا أَمِينًا، حَتَّى يُقَالَ لِلرَّجُلِ: مَا أَجْلَدَهُ، مَا أَظْرَفَهُ، مَا أَعْقَلَهُ؟ وَمَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ)). وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ وَمَا أُبَالِي أَيَّكُمْ بَايَعْتُ، لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ دِينُهُ، وَلَئِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا أَوْ يَهُودِيًّا لَيَرُدَّنَّهُ

عليّ ساعيه، وأمّا اليوم فما كُنتُ لأُبايع منْكمْ إلّا فُلانًا وفُلانًا. [بخاري/ الرقاق/ ٦١٣٢]

(حذيفة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دوو فـەرموودەی بـۆ فـەرموین، یـەکێکیانم بینیـووە {هاتۆتـە دی} چـاوەڕوانی ئەویتریشـیانم، فـەرمووی: ((سەرەتا ئامانەت دابەزیە ناو ڕەگ و ڕیشەی دڵانی پیاوانەوە، ئنجا قورئـان دابەزی، لـە قورئـان فـێربوون و لـە سـونەتیش فـێربوون)) پاشـان دەربـارەی هەڵگرتنی ئامانـەت بۆمان دواو، فەرمووی: ((پیاو هەر ئەمەندەی سەرخەوێك دەشـکێنێت ئامانـەت لـە دڵیـدا دەردەکێشـرێت، شـوێنەوارەکەی لـە دڵیـدا وەك خاڵێکی لێدێت، پاشان سەرخەوێکی دیکە دەشـکێنێت و ئەمانـەت لـە دڵیـدا دەردەکێشرێت تاوەکو شوێنەوارەکەی لە دڵیدا وەك تلۆقێکی لێدێت، وەك چۆن پشـکۆیەك خلکەیتـەوە بەسـەر قاچتـا و تلـۆق بکـات. دەبینـی بـەرز بۆتـەوە و هیچیشـی تێدانیە)). (پاشان بەردێکی بچوکی هەڵگرت خلـی کـردەوە بەسـەر پێیدا) ((خەڵك وای لێدێت خەریکە کەسی نەبێت پەیمان بەرێتە سەر هەتا وای لێدێت دەڵێن: فلان تیرە پیاوێکی ئەمانەت پارێزی تێدایە تەنانەت وای لێدێت بەپیاوێك دەڵێن: ئای چەندە ئازایە!، ئای چەندە لێزانە!، ئای چەندە ژیرە!، کەچی بە ئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان لە دڵیدا نیە)) ڕۆژگارێك بەسەرمدا تێپـەڕی گوێـم نەدایـە پـەیمان بـە کـێ دەدەم، چونکـە ئەگـەر موسـڵمان بوایـە دینەکـەی پەیمانەکـەمی دەپاراسـت ئەگـەر گـاور یـا جولەکـەش بوایـە سەرپەرشتیارەکەی نەیدەهێشت پەیمانەکە بشکێنێت، بەڵام ئەمڕۆ پـەیمان بە کەس نادەم مەگەر فلان و فیسار.

## ( ٣٩ ) پەلە بکەن لە کرداری چاکدا پێش ئەوەی فیتنە دامێن گیرتـان بێت

١٩٥٠ـ عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أنَّ رَسُول اللّه (ﷺ) قال: ((بادرُوا بالْأعْمَال فتَنًا كَقطَع اللّيْلِ الْمُظْلـمِ، يُصْبـحُ الرَّجُـلُ مُؤْمنًـا وَيُمْسـي كـافرًا، أوْ يُمْسـي مُؤْمنًـا وَيُصْبِحُ كَافرًا، يبيعُ دينَهُ بعَرَضٍ منَ الدُّنْيا)).

لـە (أبـو هريـرة)ەوە (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((پەلـە بکەن لە کارو کردەوەی {چاك} پێش ئەوەی فیتنـەی چوونـە شـەوە زەنگـی تاریك دامێن گیرتـان بێـت، {وای لێدێـت} پیـاو بەیانی بـڕوادارە و ئێـوارە بـێ

باوەڕ، ئێواره بڕواداره و بەیانی بێباوەڕ، ئایینی خۆی بە کەمێك لە ماڵ و سامانی دنیا دەفرۆشێت)).

### ( ٤٠ ) پەله بکەن پێش ئەوەی شەش شت یەخەتان بگرێت

١٩٥١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ سِتًّا: الدَّجَّالَ، وَالدُّخَانَ، وَدَابَّةَ الْأَرْضِ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَأَمْرَ الْعَامَّةِ، وَخُوَيْصَّةَ أَحَدِكُمْ)).

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (( پەله بەکەن لە کردەوەی چاك پێش ئەوەی شەش شت دامێن گیرتان بێت: جەجاڵ و، دوکەڵ و، جانەوەری زەوی و، هەڵاتنی خۆر لە خۆر ئاواو، کارەساتی گشتی (کەمەبەست قیامەته) کارەساتی تایبەت بە هەریەکێك لە خۆتان {مەبەست مردنه}.

### ( ٤١ ) خواناسی لەکاتی بەرپابوونی کوشت و بڕیندا

١٩٥٢ـ عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الْعِبَادَةُ فِي الْهَرْجِ كَهِجْرَةٍ إِلَيَّ)).

(معقل)ی کوڕی (یسار)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خواپەرستی لەکاتی زۆر بوونی کوشت و بڕیندا وەك کۆچکردن وایە بۆلای من)).

### ( ٤٢ ) بەسەرهاتی ( أبن صياد ) -کوڕی ڕاوچیەکه

١٩٥٣ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا حُجَّاجًا أَوْ عُمَّارًا، وَمَعَنَا ابْنُ صَائِدٍ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا فَتَفَرَّقَ النَّاسُ، وَبَقِيتُ أَنَا وَهُوَ، فَاسْتَوْحَشْتُ مِنْهُ وَحْشَةً شَدِيدَةً مِمَّا يُقَالُ عَلَيْهِ، قَالَ: وَجَاءَ بِمَتَاعِهِ فَوَضَعَهُ مَعَ مَتَاعِي، فَقُلْتُ: إِنَّ الْحَرَّ شَدِيدٌ، فَلَوْ وَضَعْتَهُ تَحْتَ تِلْكَ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَفَعَلَ. قَالَ: فَرُفِعَتْ لَنَا غَنَمٌ، فَانْطَلَقَ فَجَاءَ بِعُسٍّ فَقَالَ: اشْرَبْ أَبَا سَعِيدٍ، فَقُلْتُ: إِنَّ الْحَرَّ شَدِيدٌ، وَاللَّبَنُ حَارٌّ. مَا بِي إِلَّا أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَشْرَبَ عَنْ يَدِهِ، أَوْ قَالَ: آخُذَ عَنْ يَدِهِ. فَقَالَ: أَبَا سَعِيدٍ، لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آخُذَ حَبْلًا فَأُعَلِّقَهُ بِشَجَرَةٍ ثُمَّ أَخْتَنِقَ مِمَّا يَقُولُ لِيَ النَّاسُ، يَا أَبَا سَعِيدٍ مَنْ خَفِيَ عَلَيْهِ حَدِيثُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مَا خَفِيَ عَلَيْكُمْ مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، أَلَسْتَ مِنْ أَعْلَمِ النَّاسِ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ((هُوَ كَافِرٌ)) وَأَنَا مُسْلِمٌ؟ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هُوَ عَقِيمٌ لَا يُولَدُ لَهُ)) وَقَدْ تَرَكْتُ وَلَدِي بِالْمَدِينَةِ؟ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ وَلَا مَكَّةَ))

وَقدْ أقْبَلْتُ من الْمدينة وانا أُريدُ مَكَّةظ قَال أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّك حَتَّى كِدْتُ أَنْ أعْذِرَهُن ثُمّ قَالَك اما واللّه إنّي لأعْرِفُهُن وَأعْرِفُ موْلدهُ وأيْنَ هُوَ الْآنَز قالَك قُلْتُ لهُك تبًّا لك سائرَ الْيوْمز

(أبي سعيد الخدري)(ﷺ) دەڵێ: بەمەبەستی حەج یان عەمرە کەوتینە ڕێ (ابن صائد)یشمان لەگەڵ بوو. لە شوێنێك لاماندا و خەڵکەکە بلاوەیان لێکرد، من و ئەو بەتەنها ماینەوە، منیش سامم لێکرد سامێکی ئێجگار زۆر لەبەر ئەوەی کە شت لەبارەیەوە دەوترا، شت و مەکەکانی خۆی هێنا لەگەڵ هینەکانی مندا دانا، منیش وتم: گەرماکە زۆر بەتینە. ئەگەر لە بن ئەو درەختەدا دات بنایا، ئەوەیش بە قسەی کردم، ئەنجا ڕانە مەڕێکمان بەدی کرد ئەویش ڕۆیشت پڕ بەجامێکی گەورە [شیری] هێنا وتی: (ابو سعید) بخۆرەوە. منیش وتم: گەرماکە زۆر بەتینە و، شیریش گەرمە. منیش خۆ وەنەبێ هیچم هەبێ هەر ئەوە نەبێ کە حەزم نەدەکرد شتی دەستی ئەو بخۆمەوە. یان لە دەستی وەرگرم. وتی: (ابوسیعد)، زۆر جار نیازم وایە بچم پەتێك بێنم و بەدارێکدا هەڵیواسم و خۆم بخنکێنم لەداخی ئەوەی کە خەڵکی دەربارەم دەڵێن، ئەی (ابوسعید): ئەگەر کەسێك هەبێت فەرموودەی پێغەمبەری لێ شاراوە بێت، لە ئێوە شاراوە نیە، ئەی کۆمەڵی یاریدەدەران، ئەی تۆ لەهەموو خەڵکی زانا تر نیت بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرمووە: ((جەجاڵ کافرە)) خۆ من موسڵمانم؟ ئەی نەیفەرمووە: ((ئەو نەزۆکە منداڵی نابێت)) خۆ من کوڕێکم لە مەدینە بەجێهێشتووە؟ ئەی پێغەمبەری خوا نەیشی فەرمووە: ((ناچێتە مەدینە و ناشچێتە مەککە)) بەلاّم ئەوەتا من لە مەدینەوە هاتووم و دەمەوێ بەرەو مەککە بڕۆم. (أبو سعید الخدري) دەڵێت: تا وام لێهات خەریك بوو بیانوی لێوەرگرم [باوەڕی پێبکەم] پاشان {ابن صیاد} وتی: بەلاّم بەخوا من چاك دەیناسم و کات و شوێنی لەدایك بوونیشی دەزانم، دەشزانم ئێستە لە کوێیە؟ (أبو سعید) دەڵێ: منیش پێم وت: دەك ڕەنجەڕۆ و داماو بێت لەمەودوا [چونکە کە وتی، من دەیناسم خستمیە گومانەوە].

١٩٥٤ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (ﷺ): أَنَّ ابْنَ صَيَّادٍ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ تُرْبَةِ الْجَنَّةِ، فَقَالَ: ((دَرْمَكَةٌ بَيْضَاءُ، مِسْكٌ خَالِصٌ)).

له(ابو سعيد)ەوه كه (ابن صياد) پرسيارى له پێغەمبەر (ﷺ) كرد، دەربارەى خـاك و خۆڵـى بەهەشـت. ئـەويش فـەرمووى: ((وەك ئـاردێكى پاڵفتـەى سـپيه {لەڕەنگدا}، ميسكێكى تەواويشه [لەبۆندا])).

١٩٥٥ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (ﷺ): ((لأَنـا أَعْلَـمُ بِمـا مـع الدَّجَّالِ مِنْـهُ، مَعَـهُ نَهْرَانِ يَجْرِيَـانِ، أَحَدُهُمَـا رَأْيَ الْعَيْـنِ مَـاءٌ أَبْيَـضُ، وَالْـآخَرُ رَأْيَ الْعَيْـنِ نَـارٌ تَـأَجَّجُ، فَإِمَّـا أَدْرَكَـنَّ أَحَدٌ فَلْيَـأْتِ النَّـهْرَ الَّـذِي يَرَاهُ نَـارًا، وَلْيُغَمِّـضْ ثُـمَّ لْيُطَأْطِئْ رَأْسَهُ فَيَشْرَبَ [مِنْهُ]، فَإِنَّهُ مَاءٌ بَارِدٌ. وَإِنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ، عَلَيْهَا ظَفَرَةٌ غَلِيظَةٌ، مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَـافِرٌ، يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِـنٍ، كَـاتِبٍ وَغَيْرِ كَـاتِبٍ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٦٦]

(حذيفة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى: ((مـن لـه جـەجاڵ خۆى باشتر دەزانم چى پێيه. دووڕووبارى ڕەوانى لەگەڵە، يەكێكيان لـه پێش چاودا ئاوێكى سپييه، ئەوى تريان له پێش چاودا ئاگرێكه بڵێسه دەدات، جا ئەگەر كەسێك پێى گەيشت با بچێت بۆ ئـەو ڕووبارەى كه بەئاگر دێته پێش چاوى و، باچاوى بنوقێنێ و پاشان باسـەرى داخـات و لێى بخواتـەوە، چونكه ئـاوێكى سـاردە، جـەجاڵ يــەك چـاوە، پێسـتێكى ئەسـتور لەسـەرچاويەتى، لەنێوچاوانيدا نوسراوە (كافر) هەموو بڕوادارێك دەيخوێنێتەوە چ خوێندەوار و چ نەخوێندەوار)).

١٩٥٦ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (ﷺ): ((الدَّجَّـالُ أَعْوَرُ الْعَيْــنِ الْيُسْرَى، جُفَالُ الشَّعَرِ، معهُ جَنَّةٌ وَنَارٌ، فَنَارُهُ جَنَّةٌ وَجَنَّتُهُ نَارٌ)).

(حذيفة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) فەرموويـەتى: ((جەجاڵ چـاوى چەپى كوێرە، تووكنـه، بەهەشـت و دۆزەخـى پێيـه، دۆزەخەكـەى بەهەشـته و بەهەشتەكەى دۆزەخە)).

١٩٥٧ـ عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ (ﷺ) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ) الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ فَخَفَّضَ فِيهِ وَرَفَّعَ، حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَلَمَّا رُحْنَا إِلَيْهِ عَرَفَ ذَلِكَ فِينَا، فَقَالَ: ((مَا شَأْنُكُمْ)). قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ غَدَاةً، فَخَفَّضْتَ فِيهِ وَرَفَّعْتَ، حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ. فَقَالَ: ((غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِي عَلَيْكُمْ، إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ، وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْـتُ فِيكُـمْ فَـامْرُؤٌ حَجِيـجُ نَفْسِهِ، وَاللَّهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ. إِنَّهُ شَـابٌّ قَطَـطٌ عَيْنُـهُ طَافِئَـةٌ، كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ

بعبْد الْعُزَّى بْن قطنٍ، فمَنْ أدركهُ منْكُمْ فليَقْرَأْ عليْه فوَاتح سُورَة الْكَهْف، إنَّهُ خَارجٌ خلَّةً بيْن الشَّأْم والْعرَاق، فعَاثَ يمينًا وعَاث شمَالًا، يَا عبَادَ اللَّه فاثْبُتُوا)). قُلْنَا: يَا رسُول اللَّه، ومَا لبْثُهُ في الْأَرْض؟ قَال: ((أرْبَعُون يوْمًا، يَوْمٌ كسَنَةٍ، ويَوْمٌ كشهْرٍ، ويَوْمٌ كجُمُعَةٍ، وسَائرُ أيَّامه كأَيَّامكُمْ)). قُلْنَا: يَا رسُولَ اللَّه، فَذَلكَ الْيَوْمُ الَّذي كسنَةٍ أتكْفينا فيه صلَاةُ يوْمٍ؟ قَال: ((لَا، اقْدُرُوا لَهُ قدْرَهُ)). قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّه، ومَا إسْراعُهُ في الْأَرْض؟ قَالَ: ((كالْغيْث اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ، فيأْتي علَى الْقَوْمِ فيدْعُوهُمْ فيُؤْمنُونَ به ويَسْتَجيبُون لَهُ، فيأْمُرُ السَّماءَ فتُمْطرُ، والْأَرْضَ فتُنْبتُ، فتَرُوحُ عليْهمْ سَارحتُهُمْ أطْوَلَ مَا كانَتْ ذُرًا وأسْبَغَهُ ضُرُوعًا وأمَدَّهُ خوَاصرَ. ثُمَّ يأْتي الْقَوْمَ فيَدْعُوهُمْ فيَرُدُّون علَيْه قوْلَهُ، فيَنْصَرفُ عنْهُمْ، فيُصْبحُونَ مُمْحلينَ ليْس بأَيْديهمْ شَيْءٌ منْ أمْوَالهمْ. ويَمُرُّ بالْخَربَة فيَقُولُ لَهَا: أخْرجي كُنُوزَك، فتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كيَعَاسيب النَّحْل ثُمَّ يدْعُو رجُلًا مُمْتلئًا شَبَابًا، فيَضْربُهُ بالسَّيْف فيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْن رمْيَةَ الْغرَض، ثُمَّ يدْعُوهُ فيُقْبلُ ويَتَهَلَّلُ وجْهُهُ يضْحَكُ، فَبيْنَمَا هُوَ كذَلكَ إذْ بعَثَ اللَّهُ الْمَسيحَ ابْنَ مرْيَمَ (الطَّيْلا)، فيَنْزلُ عنْدَ الْمَنَارَة الْبَيْضَاء شرْقيَّ دمَشْقَ بيْنَ مَهْرُودتَيْن، واضعًا كفَّيْه علَى أجْنحَة ملَكيْن، إذَا طَأْطَأَ رأْسَهُ قَطَرَ، وإذَا رَفعَهُ تحَدَّرَ منْهُ جُمَانٌ كاللُّؤْلُؤ، فلَا يحلُّ لكَافرٍ يَجدُ ريحَ نفَسه إلَّا مَاتَ، ونفَسُهُ ينْتَهي حَيْثُ ينْتَهي طرْفُهُ، فيَطْلُبُهُ حتَّى يُدْركَهُ ببَاب لُدّ، فيَقْتُلُهُ، ثُمَّ يأْتي عيسَى [ابْنَ مرْيَمَ] قوْمٌ قدْ عصَمَهُمُ اللَّهُ منْهُ، فيَمْسَحُ عنْ وُجُوههمْ، ويُحَدِّثُهُمْ بدَرَجاتهمْ في الْجَنَّة، فبيْنَمَا هُوَ كَذَلكَ، إذْ أوْحَى اللَّهُ إلَى عيسَى (الطَّيْلا): إنِّي قدْ أخْرجْتُ عبَادًا لي لَا يدَانِ لأَحَدٍ بقتَالهمْ، فحَرِّزْ عبَادي إلَى الطُّور، ويَبْعَثُ اللَّهُ يأْجُوجَ ومَأْجُوجَ ﴿وَهُمْ منْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسلُونَ﴾ [الأنبياء: ٩٦] فيَمُرُّ أوائلُهُمْ علَى بُحَيْرَة طبَريَّةَ فيَشْرَبُونَ مَا فيهَا. ويَمُرُّ آخرُهُمْ فيَقُولُونَ: لَقَدْ كانَ بهَذه مَرَّةً مَاءٌ، ويُحْصَرُ نَبيُّ اللَّه عيسَى (الطَّيْلا) وأصْحَابُهُ حتَّى يكُونَ رأْسُ الثَّوْر لأَحَدهمْ خيْرًا منْ مائَة دينَارٍ لأَحَدكُمُ الْيَوْمَ، فيَرْغَبُ نَبيُّ اللَّه عيسَى (الطَّيْلا) وأصْحَابُهُ، فيُرْسلُ اللَّهُ علَيْهمُ النَّغَفَ في رقَابهمْ، فيُصْبحُونَ فرْسَى كمَوْت نَفْسٍ واحدَةٍ. ثُمَّ يَهْبطُ نَبيُّ اللَّه عيسَى وأصْحَابُهُ إلَى الْأَرْض، فلَا يجدُونَ في الْأَرْض موْضعَ شبْرٍ إلَّا ملَأَهُ زَهَمُهُمْ ونَتْنُهُمْ، فيَرْغَبُ نَبيُّ اللَّه عيسَى وأصْحَابُهُ إلَى اللَّه (ﷻ)، فيُرْسلُ اللَّهُ طَيْرًا كأَعْنَاق الْبُخْت، فتَحْملُهُمْ فتَطْرَحُهُمْ حيْثُ شَاءَ اللَّهُ (ﷻ)، ثُمَّ يُرْسلُ اللَّهُ مطَرًا لَا يكُنُّ منْهُ بيْتُ مدَرٍ ولَا وبَرٍ، فيَغْسلُ الْأَرْضَ حتَّى يتْرُكَهَا كالزَّلَفَة. ثُمَّ

يُقَالُ لِلْأَرْضِ: أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ وَرُدِّي بَرَكَتَكِ، فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ الْعِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا، وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ حَتَّى أَنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الْإِبِلِ لَتَكْفِي الْفِئَامَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْبَقَرِ لَتَكْفِي الْقَبِيلَةَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْغَنَمِ لَتَكْفِي الْفَخِذَ مِنَ النَّاسِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ، وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ، فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ)).

(نواس)ی کوڕی (سمعان) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سەرلەبەیانییەك باسی جەجاڵی بۆ کردین جەجاڵی بەسووك سەیر کرد، بەڵام فیتنەکەی بە گەورە گرت، [ئەوەندەی باس کرد] تاوامان زانی لەناو دارخورماکاندایە، کاتێ ڕێکەوتین بچین بۆ لای [پێغەمبەر (ﷺ)] هەستی پێکردین و فەرمووی: ((چیتانە)) وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا سەرلەبەیانی باسی جەجاڵت بۆ کردین زۆرت باسکرد، بەسووکی سەیرت کرد، بەڵام فیتنەکەیت بە گەورە گرت تاوامان زانی والەناو باخە دارخورماکاندا. فەرمووی: ((شتێکی تر هەیە زیاتر لە دەجال مەترسی لێدەکەم لەسەرتان، ئەگەر دەرچێت و منتان لەناودا بم ئەوا من لەبری ئێوە چاری دەکەم، بەڵام ئەگەر دەرچێت و منتان لەناوا نەبم ئەوا باهەرکەس چارەسازی خۆی بێت، خوایش سەروکاری من و هەموو موسڵمانێکە، [دەجال] گەنجێکی چاوهەڵتۆقیوی قژلوولە. وەك ئەوەی بیشوبهێنم بە (عبدالعزی)ی کوڕی (قطن) جا هەر کەس لە ئێوە پێی گەیشت باسەرەتای سورەتی (الکهف)ی بەسەرا بخوێنێ، ئەو لە ڕێ و جێیەکی بەردەلانی سەختی نێوان (شام) و (عێراق) دەردەچێت، جارێ بەلای ڕاست وجارێ بەلای چەپدا ئاشووب و کوکە دەنێتەوە، ئەی بەندەکانی خوا دامەزراوبن)). وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا چەندێك لە زەویدا دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: ((چل ڕۆژ. ڕۆژێکی وەك ساڵێکە و، ڕۆژێکی وەك مانگێکە و ڕۆژێکی وەك حەفتەیەکە و باقی ڕۆژەکانی وەك ڕۆژەکانی دیکەتان وایە)). وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو ڕۆژەی کە وەك ساڵێکە نوێژی ڕۆژێکمانی تێدا بەس دەبێت؟ فەرمووی: ((نا، بە ئەندازەی خۆیی بۆ بگرن)) وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی گوڕی چۆنە لە زەویدا؟ فەرمووی: ((وەك بارانێك وایە بای لەپشت بێت، دێت بەسەر گەل و هۆزێکدا بانگیان دەکات ئەوانیش باوەڕی پێ دێنن و دێن بە دەمیەوە، ئەوجا فەرمان

دەكات بە ئاسمان باران ببارێنێت بەزەویش ڕووەك بڕوێنێت، سەر لە ئێواران مەڕ ومالآتیان كەدێتەوە سەرپشتیان لە جاران بەرزترەو وگوانیان پڕشیرترە و لاكەلەكەیان تێر تـرە. پاشان ڕادەبـوورێ بـەلای هۆزەكـەیدا بانگیـان دەكـات، ئـەوانیش بەرپـەرچی قسـەكەی دەدەنـەوە، ئـەویش وازیـان لێدێنـێ. ئیـتر وشكەسالّی و بێبارانی ڕوویان تێدەكات هیچیان بەدەستەوە نامێنێ لەمالّ و سامانیان. ئەدا بەلای كەلاوە وێرانەدا پێی دەلّێ: گەنجینەكانی خۆت دەركە، گەنجینـەكانی شـوێنی دەكـەون وەك شـای هـەنگ [هەنگـەكانی دیكـە شـوێنی دەكـەون] پاشـان بـانگی پیـاو دەكـات كـە لەوپـەڕی تـافی تـێر و تەواویدایـە بەشمشـێرەكەی لێـی دەدات، هـەروەك چۆن دەدرێـت لـە نیشـانە دەیكـات بـە دوكەرتەوە، پاشان بانگدەكات ئەویش سەرلەنوێ بەرەو ڕووی دێتەوەو، ڕەنگ و ڕووی پرشە دەدات و پێدەكەنێ، لەكاتێكدا كەلەو حالّەدایە، خوای بالآدەست (مەسیح)ی كوڕی (مریم) (عليه السلام) دەنـێرێت، لای منارەسپییەكەی خۆرهـەلآتی (دیمەشـق)دا دادەبـەزێت لـەدوو بـەرگی زەرددا، هــەردوو دەسـتی خسـتۆتە سەربالّی دوو فریشتە، كاتێ سەر دادەخـات سـەری ئاوی لێدەتكێ، كاتێكیش سەربەرزدەكاتەوە جۆرە ئاوێكی لێدەچۆڕێت هەر دەلّێی دانەی مرواریییە، هیچ بێبـاوەڕێك نییـە هەسـت بـەبۆنی هەناسـەی بكـات و نـەمرێت. هەناسەیشـی بڕدەكـات ئەمـەندەی كـەچاوی بڕبكـات، شـوێن {دەجـال} دەكـەوێت تـاوەكو لەبەردەگای شـاورۆچكەی (لُـد) پێـی دەگـات و دەیكوژێت. پاشـان (عیسـا)ی كوڕی (مریم)(ﷺ) دێت بۆلای هۆزێك كە خوا پاراستوونی لێی دەست دێنێت بەسەر دەموچاویاندا، قسەیان بۆ دەكات سەبارەت بەپلەوپایەیان لەبەهەشتدا. لەكاتێكدا عیسا لەم حالّەدایە. خوا وەحی دەنێرێت كە من چـەندین بـەندەم خولقاندووە كە كەس توانای جەنگ كردنی نییە لەگەلّیان، كەوا بوو بەندەكانی من حەشـاردە بەرەوكێوی (طـور) ئـەمجا خوا (یەئجوج) و (مەئجوج) دەنـێرێت ﴿وهم من كل حدب ينسلون﴾ [الانبياء٩٦ ] واتە: ﴿لەهـەموو تەپۆلكەیەكەوە بەڕاكردن بەردەبنـەوە﴾ بەراییەكانیان ڕابوون بـەلای دەریاچەی (طبرية)دا چی تێدابێت دەیخۆنەوە دواییەكانیان كە تێدەپەڕن دەلّێن: ئەمە كاتی خۆی ئاوی تێدابـووە، پێغەمبـەری خـوا (عیسـا)ی كـوڕی (مریـم)(عليه السلام) و هاوەلّـەكانی گـەمارۆ دەدرێـن تـاوەكو وای لێدێـت سـەرەگایەك بـۆ هەریـەكێك لـەوان

باشترە لە سەددینار بۆ یەکێك لە ئێوە ئەمڕۆ. ئەمجا پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مریم و هاوەڵەکانی دەست دەکەن بەپاڕانەوە و لاڵانەوە، تاوەکو خوا کرمۆکەی ناو پۆزی حوشتر و مەڕوماڵاتیان بۆ دەنێرێت هەر هەموویان بەجارێ لاڵ و پاڵ لێی دەکەون وەك مردنی یەك کەس. پاشان پێغەمبەری خوا عیساو و هاوەڵەکانی دادەبەزنە سەر زەوی. لەزەویدا یەك بست خاکیان دەست ناکەوێت کە کێم و زوخاوی لاشەی ئەوان پڕی نەکردبێت، ئەوجا پێغەمبەری خوا عیسا و هاوەڵەکانی دەپاڕێنەوە لە خوای گەورە. تاوەکو خوا جۆرە باڵندەیەك دەنێرێت، وەك ملی حوشتری گەردن بەرز هەڵیان دەگرێت و فڕێیان دەداتە ئەو شوێنەی خوای گەورە بیەوێت، دوای ئەوە خوای گەورە جۆرە بارانێك دەبارێنێت نەخانووی قوڕ و نەڕەشماڵ نابوێرێت. سەر زەوی هەموو دەشواتەوە وەك ئاوێنەی بێ گەردی لێدەکات دوای ئەوە بە زەوی دەوترێت: بەروبومی خۆت سەوز بکەو، فەڕ و بەرەکەتی خۆت بگەڕێنەوە، لەو ڕۆژەدا کۆمەڵە کەسێك لەیەك هەنار دەخۆن و، لەسایەی سێبەری توێکڵەکەشیدا دەحەوێنەوە، هەروەها فەڕ و بەرەکەت دەکەوێتە گوانی مەروماڵاتەکانەوە بەڕادەیەك شیری حوشترێك بەشی کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی دەکات و مانگایەکی شیردەر بەشی تیرەیەك لەخەڵکی دەکات. لە کاتێکدا ئەوان لەم باروگوزەرانەدا دەبن، خواشنەبایەکی خۆش هەڵدەکات بن هەنگڵیان دادەگرێتەوە، گیانی هەموو بڕوادار و موسڵمانێك دەکیشێت و، خراپانی خەڵکی دەمێننەوە لەیەکتری دەپەڕن وەك چۆن کەرگەل لەیەکتری دەپەڕن لەسەر ئەوان قیامەت هەڵدەسێت)).

١٩٥٨ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمًا حَدِيثًا طَوِيلًا عَنِ الدَّجَّالِ، فَكَانَ فِيمَا حَدَّثَنَا قَالَ: ((يَأْتِي -وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ- فَيَنْتَهِي إِلَى بَعْضِ السِّبَاخِ الَّتِي تَلِي الْمَدِينَةَ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَوْمَئِذٍ رَجُلٌ هُوَ خَيْرُ النَّاسِ -أَوْ: مِنْ خَيْرِ النَّاسِ- فَيَقُولُ لَهُ: أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ الَّذِي حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَدِيثَهُ، فَيَقُولُ الدَّجَّالُ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ، أَتَشُكُّونَ فِي الْأَمْرِ؟ فَيَقُولُونَ: لَا، قَالَ: فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يُحْيِيهِ، فَيَقُولُ حِينَ يُحْيِيهِ: وَاللَّهِ مَا كُنْتُ فِيكَ قَطُّ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّي الْآنَ، قَالَ: فَيُرِيدُ الدَّجَّالُ أَنْ

يَقْتُلَهُ فَلَا يُسَلَّطُ عَلَيْهِ)). قَالَ أَبُو إِسْحَقَ: يُقَالُ: إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ هُوَ الْخَضِرُ عَلَيْهِ السَّلَام. [بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٨٣]

(ابي سعيد الخدري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکیان باسێکی دووڕو درێژی بۆ کردین دەربارەی دەجال، هەندێك لەوەی کە بۆی باس کردین فەرمووی: ((دێت و –حەرامە لەسەری بچێتە ئەو ڕێگوزەرەی بۆ مەدینە دەچێت– تادەگاتە هەندێ خاکی وشك و برن کە لەولای مەدینەوەیە، لەوڕۆژەدا پیاوێکی لێرادەپەڕێت کە چاکترینی خەڵکە –یالە چاکترینی خەڵکە– پێی دەڵێ: شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو دەجالەی کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردووە بۆمان، دەجالیش دەڵێ: باشە پێم بڵێن ئەگەر ئەمەم کوشت و پاشان زیندووم کردەوە ئایا گومان لە کارەکەدا دەکەن؟ دەڵێن: نەء . ئەویش دەیکوژێت و پاشان زیندووی دەکاتەوە، کاتێ زیندووی دەکاتەوە پیاوەکە دەڵێ: بەخوا هەرگیز لەمەوپێش لە ئێستە باشتر تۆم نەناسیوە، دەجال دەیەوێت بیکوژێت و زاڵ نابێت بەسەریدا، (أبو اسحاق) دەڵێ: وتراوە ئەو پیاوە بریتی‌یە لە (خضر-ی زیندە) سەلامی خوای لێبێت.

١٩٥٩ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَخْرُجُ الدَّجَّالُ، فَيَتَوَجَّهُ قِبَلَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَتَلْقَاهُ الْمَسَالِحُ مَسَالِحُ الدَّجَّالِ، فَيَقُولُونَ لَهُ، أَيْنَ تَعْمِدُ؟ فَيَقُولُ: أَعْمِدُ إِلَى هَذَا الَّذِي خَرَجَ، قَالَ: فَيَقُولُونَ لَهُ: أَوَ مَا تُؤْمِنُ بِرَبِّنَا؟ فَيَقُولُ: مَا بِرَبِّنَا خَفَاءٌ، فَيَقُولُونَ: اقْتُلُوهُ، فَيَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَلَيْسَ قَدْ نَهَاكُمْ رَبُّكُمْ أَنْ تَقْتُلُوا أَحَدًا دُونَهُ؟ قَالَ: فَيَنْطَلِقُونَ بِهِ إِلَى الدَّجَّالِ، فَإِذَا رَآهُ الْمُؤْمِنُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَذَا الدَّجَّالُ الَّذِي ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ: فَيَأْمُرُ الدَّجَّالُ بِهِ فَيُشَبَّحُ، فَيَقُولُ: خُذُوهُ وَشُجُّوهُ، فَيُوسَعُ ظَهْرُهُ وَبَطْنُهُ ضَرْبًا، قَالَ: فَيَقُولُ: أَوَ مَا تُؤْمِنُ بِي؟ قَالَ: فَيَقُولُ: أَنْتَ الْمَسِيحُ الْكَذَّابُ، قَالَ: فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُؤْشَرُ بِالْمِئْشَارِ، مِنْ مَفْرِقِهِ حَتَّى يُفَرَّقَ بَيْنَ رِجْلَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ يَمْشِي الدَّجَّالُ بَيْنَ الْقِطْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولُ لَهُ: قُمْ، فَيَسْتَوِي قَائِمًا، قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ لَهُ: أَتُؤْمِنُ بِي؟ فَيَقُولُ: مَا ازْدَدْتُ فِيكَ إِلَّا بَصِيرَةً، قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَا يَفْعَلُ بَعْدِي بِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ. قَالَ: فَيَأْخُذُهُ الدَّجَّالُ لِيَذْبَحَهُ، فَيُجْعَلَ مَا بَيْنَ رَقَبَتِهِ إِلَى تَرْقُوَتِهِ نُحَاسًا، فَلَا يَسْتَطِيعُ إِلَيْهِ سَبِيلًا. قَالَ فَيَأْخُذُ بِيَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ فَيَقْذِفُ بِهِ، فَيَحْسِبُ

النَّاسُ أَنَّمَا قَذَفَهُ إِلَى النَّارِ وَإِنَّمَا أُلْقِيَ فِي الْجَنَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَذَا أَعْظَمُ النَّاسِ شَهَادَةً عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ)).

(ابـي سـعيد الخـدري)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((دەجـاڵ دەردەچێـت و پیـاوێك لـە بـڕواداران بـەرەو ڕووی دەچێـت، ئـەوجا چەكدارەكانی دەجاڵ ڕێی پێدەگرن و پێی دەڵێن: بەرەو كوێ دەڕۆیت؟ ئەویش دەڵێ: بەرەو ئەو كەسەی تازە پەیدابووە، ئەوانیش پێی دەڵێن: ئەی تۆ باوەڕت نییە بە پەرەوردگاری ئێمە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگارمان شاراوەنییە، دەڵێن: بیكـوژن، هـەندێكیان بەهـەندێكیان دەڵێـن: ئـەی پـەروەردگارتان جڵـەوگیری نەكردن لەوەی كە كەس نەكوژن لەپێناوی ئەودا؟ ئینجا دەیبەن بۆ لای دەجاڵ، كاتێ بڕوادارەكـە دەیبینێـت دەڵێـت: ئـەی خەڵكینـە ئەمـە ئـەو دەجالەیـە كـە پێغەمبـەری خوا (ﷺ) باسـی كـردووە. ئینجـا دەجـاڵ فـەرمانی بـۆ دەردەكـات بەسەرسكیدا دەیخەن، و دەڵێت بیگـرن و سەروچاوی بشكێنن، ئینجا پشت و ورگی دادەگرنەوە بە لێدان و تێ هەڵدان، ئینجا پێی دەڵێت: ئێستەیش باوەڕت پێم نییە؟ دەڵێ: تۆ یەك چاوە درۆزنەكەی، دەڵێـت: ئەوجا فـەرمان دەردەكات بەمشار دادەهێنرێت لەتـەوقی سەریەوە تاوەكو نێوانـی هـەردوو قاچیشـی لێك دەترازێنێـت. لە دوایدا دەجاڵ بە نێـوان هـەردوو پارچەكـەدا دەڕوات و، پێـی دەڵێت: هەستە، ئەویش جووتەپێ هەڵدەستێت و ڕاست دەبێتەوە. دوایـی پێـی دەڵێت: ئایـا بـاوەڕم پـێ دەهێنیت؟ ئەویش دەڵێـت: زیـاتر بـەرچاو ڕوون بـووم دەربارەت. پاشان دەڵێـت: ئـەی خەڵكینـە، دوای مـن نـاتوانێت وا بكـات لـە هیچ كەسی تر. ئینجا دەجاڵ دەیگرێت بۆ ئەوەی سەری بڕێت، بەڵام لە گەردنیەوە تا ئێسكی سەرسینەی دەبێت بەمس و دەسی بەسەریدا ناڕوات، ئینجا هەردوو دەست و هەردوو قاچی دەگرێت و فڕێی دەدات، خـەڵكی وا دەزانـن بـەرەو ئاگر فڕێی داوە كەچی فرێی داوەتە بەهەشتەوە، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((ئەمـە گەورەترین شەهیدە لەناو خەڵكیدا لای پەروەردگاری جیهانیان)).

١٩٦٠ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) قَالَ: مَا سَأَلَ أَحَدٌ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنِ الدَّجَّالِ أَكْثَرَ مِمَّا سَأَلْتُ، قَالَ: ((وَمَا يُنْصِبُكَ مِنْهُ؟ إِنَّهُ لَا يَضُرُّكَ)). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّ مَعَهُ الطَّعَامَ وَالْأَنْهَارَ؟ قَالَ: ((هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ)).
[بخاري/ الفتن/ ٦٧٠٥]

له (مغیر)ی کوڕی (شعبة)ەوه (ﷺ) دەڵێ: هیچ کەس لەمن زیاتر پرسیاری له پێغەمبەر (ﷺ) نەکردووه دەربارەی دەجال فەرمووی: ((چیت داوەڵێ، خۆ ئەو زیانت پێ ناگەیەنێت)). ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان دەڵێن خۆراك و ڕووباری لەگەڵە؟ فەرمووی: ((ئەو لای خوا لەوە ڕیسواترە)).

١٩٦١ـ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ يَعْقُوبَ بْنَ عَاصِمِ ابْنِ عُرْوَةَ بْنِ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو، وَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: مَا هَذَا الْحَدِيثُ الَّذِي تُحَدِّثُ بِهِ؟ تَقُولُ: إِنَّ السَّاعَةَ تَقُومُ إِلَى كَذَا وَكَذَا؟ فَقَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ -أَوْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهُمَا- لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لَا أُحَدِّثَ أَحَدًا شَيْئًا أَبَدًا، إِنَّمَا قُلْتُ: إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدَ قَلِيلٍ أَمْرًا عَظِيمًا: يُحَرَّقُ الْبَيْتُ، وَيَكُونُ وَيَكُونُ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فِي أُمَّتِي فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ -لَا أَدْرِي أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ أَرْبَعِينَ شَهْرًا، أَوْ أَرْبَعِينَ عَامًا- فَيَبْعَثُ اللَّهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، كَأَنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ، ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ سَبْعَ سِنِينَ، لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَدَاوَةٌ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ رِيحًا بَارِدَةً مِنْ قِبَلِ الشَّأْمِ، فَلَا يَبْقَى عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ أَوْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ، حَتَّى لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ دَخَلَ فِي كَبِدِ جَبَلٍ لَدَخَلَتْهُ عَلَيْهِ حَتَّى تَقْبِضَهُ)). قَالَ: سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: ((فَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ فِي خِفَّةِ الطَّيْرِ وَأَحْلَامِ السِّبَاعِ، لَا يَعْرِفُونَ مَعْرُوفًا وَلَا يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا، فَيَتَمَثَّلُ لَهُمُ الشَّيْطَانُ فَيَقُولُ: أَلَا تَسْتَجِيبُونَ؟ فَيَقُولُونَ: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ فَيَأْمُرُهُمْ بِعِبَادَةِ الْأَوْثَانِ، وَهُمْ فِي ذَلِكَ دَارٌّ رِزْقُهُمْ حَسَنٌ عَيْشُهُمْ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ فَلَا يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلَّا أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا، قَالَ: وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ، قَالَ: فَيَصْعَقُ وَيَصْعَقُ النَّاسُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ -أَوْ قَالَ: يُنْزِلُ اللَّهُ -مَطَرًا كَأَنَّهُ الطَّلُّ -أَوِ الظِّلُّ. نُعْمَانُ الشَّاكُّ- فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ، ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ﴾ [الصافات: ٢٤] قَالَ ثُمَّ يُقَالُ: أَخْرِجُوا بَعْثَ النَّارِ. فَيُقَالُ: مِنْ كَمْ؟ فَيُقَالُ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَ مِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، قَالَ: فَذَاكَ: يَوْمَ يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا، وَذَلِكَ ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ﴾ [القلم: ٤٢])).

(النعمان)ی کوڕی (سالم)(ﷺ) دەڵێ: گوێم لێبوو (یعقوب)ی کوڕی (عاصم)ی کوڕی (عروة)ی کوڕی (سعود)ی (الثقفي) دەیووت: گوێم له (عبدالله)ی کوڕی (عمر)بوو، کاتێ پیاوێك هات بۆلای وتی: ئەم قسه و باسه

چی‌یە کە دەیکەیت؟ دەڵێی قیامەت ئەمەندە و ئەمەندەی دیکە هەڵدەسێت؟ ئەویش وتی: (سبحان الله) یا (الااله الا الله) یا وشەیەکی لەو جۆرە –هات بەدڵیا– هەرگیز هیچ شتێك بۆ هیچ کەسێك نەگێڕمەوە، من هەر ئەوەندەم وتوە کە: ئێوە لەمەولا پاش کەمێك ڕوداوێکی گەورە دەبینن: ماڵی {خوا} دەسوتێنرێت. ئەوە و ئەوە دەبێت، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((دەجال لەناو ئومەتەکەمدا دەردەچێت چل دەمێنێتەوە –نازانم چل ڕۆژ، یا چل مانگ، یا چل ساڵ، پاشان خوا عیسای کوڕی مریم (ﷺ) دەنێرێت، هەر ئەڵێی (عروة)ی کوڕی (مسعود)ە شوێنی دەکەوێت و لەناوی دەبات، دوای ئەوە خەڵکی حەوت ساڵ دەمێنێتەوە، لە نێوان دوو کەسدا دوژمنایەتی نابێت،بەدوایدا خوا بایەکی سارد لە ڕووی شامەوە دەنێرێت، هیچ کەسێك ناهێڵێتەوە لەسەر ڕووی زەویدا بە ئەندازەی گەردیلەیەك خێر یا باوەڕ لە دڵیدا هەبێت مەگەر گیانی دەکێشێت، هەتاوەکو ئەگەر یەکێ لە ئێوە بچێتە ناوکرۆکی شاخەوە بابۆی دەچێتە ژوورەوە تا گیانی دەکێشێت)) لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: ((ئینجا خراپانی خەڵك دەمێنێتەوە لەسوکیدا وەك باڵندە وان و سروشت و ئارەزوویان وەك دڕندەیە، نەچاك بەچاك دەزانن و نەخراپ بە خراپ، بەڕادەیەك شەیتان خۆیان لێدەگۆڕێت و دەڵێت: ئایا شەرم ناکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەچی فەرمانمان پێدەکەیت؟ ئەویش فەرمانیان پی دەکات بە بت پەرستیی، کاتێ ئەوان لەسەر ئەو باروگوزەرانە دەبن ڕزق و ڕۆزیان زۆر دەبێت و، ژیان و گوزەرانیان خۆش دەبێت. لەپاشان فوو دەکرێت بە کەڕەناداو، هیچ کەسێك نی‌یە گوێی لێبێت ئیلا لاملی نەوی دەکات و لاملی بەرز دەکاتەوە. دەڵێ: یەکەمین کەسێکیش کە گوێی لێدەبێت پیاویکە خەریکە حەوزی حوشترەکەی چاك دەکات و سواقی دەدات. بەڵام تیا دەچێت و خەڵکیش تیا دەچن. دوای ئەوە خوا بارانێك دەنێرێت [یا وتی: دەیبارێنێت] هەردەڵێی بارانی پەڵەیە {نەرم و لەسەر خۆ} یان دەڵێی –سێبەرە (نعمان) دوودڵە– ئەوجا لەش و لاری خەڵکی لێدەڕوێتەوە لە پاشان فوویەکی دیکەی پیا دەکرێت ئیتر ئەوان کوتوپڕ ڕاست دەبنەوە و تەماشا دەکەن، دوای ئەوە دەوترێت: ئەی خەڵکینە وەرن بەرەولای پەروەردگارتان ﴿وقفوهم انهم مسؤولون﴾الصافات/٢٤. واتا: ﴿بیان وەستێنن

ئەوان بەرپرسیارنﷺ لەپاشان دەوترێت: دەستە و تاقمەكانی ئاگر دەركەن. دەوترێت: لە چەند؟ دەوترێت: لەهەموو هەزارێك نۆصەد و نەوەد و نۆیان. دەڵێت ئەوە ئەو ڕۆژەیە كە منداڵانی پێ پیر دەبێت. ئەو ڕۆژەیشە كە [قول و قاچی لێهەڵدەكرێت] واتای ئایەتی القلم/٤٢.

## ( ٤٣ ) یەكەمین نیشانەی گەورە هەڵاتنی خۆرە لە خۆر ئاواوە

١٩٦٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ) قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حَدِيثًا لَمْ أَنْسَهُ بَعْدُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ عَلَى النَّاسِ ضُحًى، وَأَيُّهُمَا مَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالْأُخْرَى عَلَى إِثْرِهَا قَرِيبًا)).

(عبدالله)ی كوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموودەیەكم لەبەر كردووە هێشتا لەبیرم نەچۆتەوە، بیستم پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ((یەكەمین نیشانەیەك كە دەردەچێت هەڵاتنی خۆرە لە خۆر ئاواوە و، دەرچوونی دەعباكەیە بۆ سەر خەڵكی لە چێشتەنگاودا، هەركامایان پێش ئەویان بوو ئەوی تریشی بە شوێنیدا نزیكە)).

## ( ٤٤ ) دەرچوونی دەجال و باسی ( الجساسة )

١٩٦٣ـ عَنْ عَامِرُ بْنُ شَرَاحِيلَ الشَّعْبِيُّ –شَعْبُ هَمْدَانَ– أَنَّهُ سَأَلَ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ، أُخْتَ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ (ﷺ)، وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ، فَقَالَ: حَدِّثِينِي حَدِيثًا سَمِعْتِيهِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، لَا تُسْنِدِيهِ إِلَى أَحَدٍ غَيْرِهِ، فَقَالَتْ: لَئِنْ شِئْتَ لَأَفْعَلَنَّ، فَقَالَ لَهَا: أَجَلْ حَدِّثِينِي، فَقَالَتْ: نَكَحْتُ ابْنَ الْمُغِيرَةِ وَهُوَ مِنْ خِيَارِ شَبَابِ قُرَيْشٍ يَوْمَئِذٍ، فَأُصِيبَ فِي أَوَّلِ الْجِهَادِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا تَأَيَّمْتُ خَطَبَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَخَطَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى مَوْلَاهُ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ)، وَكُنْتُ قَدْ حُدِّثْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ أَحَبَّنِي فَلْيُحِبَّ أُسَامَةَ)). فَلَمَّا كَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قُلْتُ: أَمْرِي بِيَدِكَ فَأَنْكِحْنِي مَنْ شِئْتَ، فَقَالَ: ((انْتَقِلِي إِلَى أُمِّ شَرِيكٍ)) –وَأُمُّ شَرِيكٍ امْرَأَةٌ غَنِيَّةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، عَظِيمَةُ النَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، يَنْزِلُ عَلَيْهَا الضِّيفَانُ –فَقُلْتُ: سَأَفْعَلُ، فَقَالَ: ((لَا تَفْعَلِي، إِنَّ أُمَّ شَرِيكٍ امْرَأَةٌ كَثِيرَةُ الضِّيفَانِ، فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَسْقُطَ عَنْكِ خِمَارُكِ، أَوْ يَنْكَشِفَ الثَّوْبُ عَنْ سَاقَيْكِ، فَيَرَى الْقَوْمُ مِنْكِ بَعْضَ مَا تَكْرَهِينَ، وَلَكِنِ انْتَقِلِي إِلَى ابْنِ عَمِّكِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ابْنِ أُمِّ

مَكْتُوم- وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فِهْرٍ، فِهْرِ قُرَيْشٍ، وَهُوَ مِنَ الْبَطْنِ الَّذِي هِيَ مِنْهُ - فَانْتَقَلْتُ إِلَيْهِ، فَلَمَّا انْقَضَتْ عِدَّتِي سَمِعْتُ نِدَاءَ الْمُنَادِي -مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)- يُنَادِي: الصَّلَاةَ جَامِعَةً، فَخَرَجْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَصَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَكُنْتُ فِي صَفِّ النِّسَاءِ الَّتِي تَلِي ظُهُورَ الْقَوْمِ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) صَلَاتَهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقَالَ: ((لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلَّاهُ)). ثُمَّ قَالَ: ((أَتَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ)). قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((إِنِّي وَاللَّهِ مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلَا لِرَهْبَةٍ، وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ لِأَنَّ تَمِيمًا الدَّارِيَّ كَانَ رَجُلًا نَصْرَانِيًّا، فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ، وَحَدَّثَنِي حَدِيثًا وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ، حَدَّثَنِي أَنَّهُ رَكِبَ فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ مَعَ ثَلَاثِينَ رَجُلًا مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامَ، فَلَعِبَ بِهِمُ الْمَوْجُ شَهْرًا فِي الْبَحْرِ، ثُمَّ أَرْفَئُوا إِلَى جَزِيرَةٍ فِي الْبَحْرِ حَتَّى مَغْرِبِ الشَّمْسِ، فَجَلَسُوا فِي أَقْرُبِ السَّفِينَةِ فَدَخَلُوا الْجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ، لَا يَدْرُونَ مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ، فَقَالُوا: وَيْلَكِ مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ، قَالُوا: وَمَا الْجَسَّاسَةُ؟ قَالَتْ: أَيُّهَا الْقَوْمُ انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالْأَشْوَاقِ، قَالَ: لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلًا فَرِقْنَا مِنْهَا أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا سِرَاعًا حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقًا، وَأَشَدُّهُ وِثَاقًا، مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ، مَا بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى كَعْبَيْهِ بِالْحَدِيدِ، قُلْنَا: وَيْلَكَ مَا أَنْتَ؟ قَالَ: قَدْ قَدَرْتُمْ عَلَى خَبَرِي، فَأَخْبِرُونِي مَا أَنْتُمْ؟ قَالُوا: نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ، رَكِبْنَا فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ فَصَادَفْنَا الْبَحْرَ حِينَ اغْتَلَمَ، فَلَعِبَ بِنَا الْمَوْجُ شَهْرًا، ثُمَّ أَرْفَأْنَا إِلَى جَزِيرَتِكَ هَذِهِ فَجَلَسْنَا فِي أَقْرُبِهَا فَدَخَلْنَا الْجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْنَا دَابَّةٌ أَهْلَبُ، كَثِيرُ الشَّعَرِ، لَا يُدْرَى مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ، فَقُلْنَا: وَيْلَكِ مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ، قُلْنَا: وَمَا الْجَسَّاسَةُ؟ قَالَتِ: اعْمِدُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالْأَشْوَاقِ، فَأَقْبَلْنَا إِلَيْكَ سِرَاعًا، وَفَزِعْنَا مِنْهَا، وَلَمْ نَأْمَنْ أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً. فَقَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: أَسْأَلُكُمْ عَنْ نَخْلِهَا هَلْ يُثْمِرُ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ لَا تُثْمِرَ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِيهَا مَاءٌ؟ قَالُوا: هِيَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ، قَالَ: أَمَا إِنَّ مَاءَهَا يُوشِكُ أَنْ يَذْهَبَ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ عَيْنِ زُغَرَ، قَالُوا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِي الْعَيْنِ مَاءٌ؟ وَهَلْ يَزْرَعُ أَهْلُهَا بِمَاءِ الْعَيْنِ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ هِيَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ، وَأَهْلُهَا

يَنْزِعُونَ مِنْ مَائِهَا، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَبِيِّ الْأُمِّيِّينَ مَا فَعَلَ؟ قَالُوا: قَدْ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَنَزَلَ يَثْرِبَ، قَالَ: أَقَاتَلَهُ الْعَرَبُ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: كَيْفَ صَنَعَ بِهِمْ، فَأَخْبَرْنَاهُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ عَلَى مَنْ يَلِيهِ مِنَ الْعَرَبِ وَأَطَاعُوهُ، قَالَ لَهُمْ: قَدْ كَانَ ذَلِكَ؟ قُلْنَا نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّ ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، وَإِنِّي مُخْبِرُكُمْ عَنِّي: إِنِّي أَنَا الْمَسِيحُ [الدجال]. وَإِنِّي أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِي فِي الْخُرُوجِ فَأَخْرُجَ، فَأَسِيرَ فِي الْأَرْضِ، فَلَا أَدَعَ قَرْيَةً إِلَّا هَبَطْتُهَا فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ، فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَيَّ كِلْتَاهُمَا، كُلَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ وَاحِدَةً، -أَوْ وَاحِدًا- مِنْهُمَا اسْتَقْبَلَنِي مَلَكٌ بِيَدِهِ السَّيْفُ صَلْتًا، يَصُدُّنِي عَنْهَا، وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلَائِكَةً يَحْرُسُونَهَا)). قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَطَعَنَ بِمِخْصَرَتِهِ فِي الْمِنْبَرِ: ((هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ، -يَعْنِي الْمَدِينَةَ- أَلَا هَلْ كُنْتُ حَدَّثْتُكُمْ ذَلِكَ)). فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ. ((فَإِنَّهُ أَعْجَبَنِي حَدِيثُ تَمِيمٍ، أَنَّهُ وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْهُ، وَعَنِ الْمَدِينَةِ وَمَكَّةَ، أَلَا إِنَّهُ فِي بَحْرِ الشَّأْمِ أَوْ بَحْرِ الْيَمَنِ، لَا بَلْ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ)). وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الْمَشْرِقِ. قَالَتْ: فَحَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).

لە(عامر)ی کوڕی (شراحیل)ی (الشعبی)یەوە -شەعبی هەمەدان- کە پرسیاری لە (فاطمة)ی کچی (قیس) کردووە -خوشکی (الضحاك)ی کوڕی (قیس)(ﷺ) کە لە ژنە کۆچەرییە پێشینەکانە-، وتی: قسەیەکم بۆ بکە کە خۆت لە پێغەمبەرت (ﷺ) بیستبێت، بەمەرجێ پاڵی نەدەیت بەلای هیچ کەسێکی دیکە جگەلەو، وتی: دەتەوێ وادەکەم، ئەویش وتی: بەڵێ قسەم بۆ بکە، ئەویش وتی: شووم کرد بە (ابن مغیرە) کە لەچاکترینی لاوانی قورەیش بوولەو ڕۆژەدا، کەچی لەیەکەمین جەنگێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پێکرا، کاتێ بێوەژن کەوتم (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف) لەگەڵ چەند کەسێکدا لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) داوای کردم، هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای کردم بۆ کارگوزارەکەی خۆی (أسامە)ی کوڕی (زید)(ﷺ) منیش بۆیان باس کردبووم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس منی خۆش دەوێت با (أسامە)یشی خۆش بوێت)). کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) قسەی لەگەڵ کردم وتم: جڵەوی کاری من بەدەستی تۆیە لەکێم مارەدەکەیت مارەم بکە. فەرمووی: ((بگوێزەرەوە ماڵی (ام شریك))) (ام شریك) ژنێکی دەوڵەمەند بوو لە

(یاریدەدەران) خەرجی زۆر گەورەی دەکێشا لە ڕێگەی خوادا، میوانی دەهات. منیش وتم: وا دەکەم، فەرمووی: ((وامەکە، (أم شريك) زۆر میوانداره، منیش حەز ناکەم سەرپۆشەکەت لێبکەوێت، یاخود قاچ و قولت دەرکەوێت، خەڵکی هەندێك شوێنت لێوە ببینن کەحەزی پێ نەکەیت، بەڵام بگوێزەرەوە بۆ لای کوڕی مامت (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (أم كلثوم)– کە ئەوە پیاوێك بوو لە بەرەی (فهر). (فهر)ی قورەیش، کەلە تیرەی ئەو ئافرەتە بوو– منیش گواستمەوە بۆ لای، کاتێ ماوەی (عدة)کەم تەواو بوو گوێم لە بانگی جارچی بوو –جارچی پێغەمبەری خوا کە بانگی دەکرد. (الصلاة جامعة) منیش دەرچووم بەرەو مزگەوت، نوێژم لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) کرد کە من لەریزی ژنەکاندا بووم لە پشت پیاوانەوە، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد، لەسەر دوانگە–منبر– دانیشت و پێدەکەنی، فەرمووی: ((با هەرکەس لە جێنوێژی خۆیدا بمێنێتەوە)) پاشان فەرمووی: ((ئایا دەزانن بۆ چیکۆم کردونەتەوە)) وتیان: خوا و پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن. فەرمووی: ((بەخوا من بۆ هیچ مەبەستێك و هیچ ترسێك ئێوەم کۆنەکردۆتەوە، بەڵکو بۆیە کۆم کردونەتەوە چونکە (تميم)ی (الداری) پیاوێکی گاور بوو، هات بەڵێنی داو موسڵمان بوو، قسەیەکی بۆ کردووم کە هاو شێوەی ئەوەیە کە من بۆم باس کردوون سەبارەت بە دەجالی یەکچاو، قسەی بۆ کردم کە سواری کەشتیەکی دەریایی بووە لەگەڵ سی پیاو لە هۆزی (لخم) و (جذام)ماوەی مانگێك شەپۆلی دەریاکە گێژی داون، تاوەکوو سەرەنجام پەنایان بردۆتە بەر دوورگەیەك لە دەریاکەدا تا خۆر ئاوابوون، لە نزیکی کەشتیەکەوە دادەنیشن لەدوایدا دەچنە ناو دورگەکەوە، دەعبایەکی تیسکنی تووکنیان پێ دەگات، کە لەبەر زۆری تووك و موو پاش و پێشیان بۆ لێك جیانەکراوەتەوە، دەڵێن: قورت بەسەر تۆ کێیت؟ دەڵێ: من (الجساسە)ەم، دەڵێن: الجساسة چییە؟ دەڵێ: خەڵکینە بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوەی کە لە کۆشکەکەدایە، چونکە زۆر تامەزرۆی دەنگ و باسی ئێوەیە. کاتێ ناوی پیاوی برد ترساین لێی کەجۆرە شەیتانێك بێت، ئێمەیش بەپەلە ڕۆیشتین تا چووینە کۆشکەکەوە. کاتێ سەیر دەکەین زەلامێکی تێدایە کە هەرگیز زەلامی ئاوامان نەدیبوو، لە هەموو کەس کەتە و زلترو، لەهەموو کەس زیاتر کۆت و بەند و شەتەك درابوو، هەردوو دەستی تا گەردنی، نێوان

هەردوو ئەژنۆی تا قوولەپێی بە ئاسن، وتمان: قورت بەسەر تۆ کێیت؟ وتی: ئێوە توانیتان بەسەر دەنگ و باسی من ئاشنا بن. پێم بڵێن ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە خەڵکانێکین لە عەرەب، سواری کەشتیەکی دەریایی بووین، گێرۆدەی داوی دەریا بووین لەکاتێ هەڵچوونیدا، ماوەی مانگێک شەپۆلی دەریاگێژی داین، پاشان پەنامان هێنا بەرەو لای ئەم دوورگەیەی تۆ،لە نزیکیەوە دانیشتین تا چووینە دوورگەکەوە، گیانلەبەرێکی تیسکنی تووکنمان پێگەیشت، لەبەر موو پێش و پاشیمان بۆ لەیەك جیا نەکرایەوە وتمان: (الجساسە)چیەیە؟ وتی: بچن بۆ لای ئەو پیاوەی کە لە کۆشکەکەدایە ئەو تامەزرۆی دەنگ و باسی ئێوەیە، ئێمەیش بەپەلە هاتین بۆلای تۆ و، زۆری لێترساین، ترساین لەوەی کە جۆرە شەیتانێك بێت، ئەویش وتی: خەبەرم بدەنێ سەبارەت بە دارخورماکانی (بێستان) وتمان: لەبارەی چ شتێکیەوە پرسیار دەکەیت؟ وتی:پرسیارتان دەربارەی دارخورماکانی لێ دەکەم داخۆ بەردەگرێت؟ پێمان وت: بەڵێ، وتی: بەڵام نزیکە ئیتر بەرنەگرێت. وتی خەبەرم بدەنێ سەبارەت بە دەریاچەی (طبرية)، وتمان: لەچ شتێکیەوە پرسیار دەکەیت؟ وتی: ئایا ئاوی تیا هەیە؟ وتیان: ئاوی زۆرە وتی: بەڵام ئاوەکەی نزیکە نەمێنێت، وتی: خەبەرم بدەنێ دەربارەی کانیاوی (زُغَرة) وتیان: لەچ شتێك پرسیار دەکەیت. وتی: ئایا لەوکانیاوەدا ئاو هەیە؟ ئایا خەڵکەکەی بەئاوی کانیاوەکە کشت و کاڵ دەکەن؟ پێمان وت: بەڵێ ئاوی زۆرە. خەڵکەکەیشی کشت وکاڵی پێدەکەن، وتی: خەبەرم بدەنێ دەربارەی پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکان چی کرد؟ وتیان: لەمەککە دەرچووە و لە (یَثرب)نیشتەجێ بووە، وتی: ئایا عەرەب شەڕیان لەگەڵ کرد؟ وتمان: بەڵێ وتی: چۆنی پێکردن؟ خەبەرمان پێدا کە سەرکەوتووە بەسەر ئەوانەی لێوەی نزیکن لە عەرەب و، ئەوانیش گوێڕایەڵی بوون.پێی وتین: جا ئەوە بووە؟ وتمان: بەڵێ ، وتی: بزانن چاکتروایە بۆیان کە گوێڕایەڵی بن منیش خەبەرتان دەدەمێ من کێم: من دەجالم. من نزیکە کە مۆڵەتی دەرچونم بدرێتێ و دەرچم و، بەزەویدا بڕۆم هیچ دێهات و {شارێك} نەهێڵمەوە کە دانەبەزم بۆی لەماوەی چل شەودا جگە لە (مەککە) و(طیبة)نەبێت، کە ئەو دووانە هەردووکیان لە من قەدەغەن، هەرکاتێك بمەوێ بچمە یەکێکیان، فریشتەیەك شمشێرێکی ڕووتی بەدەستەوەیە ڕووم تێدەکات و بەرهەڵستیم

لێدەکات، لەسەر هەر ڕێگەوبانێکی فریشتە وەستاون و پاسەوانی دەکەن))
دەڵێت: پێغەمبەر بەداردەستەکەی دەستی دەیژەند لە دووانگەکەوە - مینبەرەکەوە- و دەیفەرموو: ((ئەمە (طیبة)ەیە، ئەمە (طیبة)ەیە، ئەمە (طیبة)ەیە، -مەبەستی لە مەدینە -بوو.ئایا من لەو بارەوە قسەم بۆکردوون)) خەڵکیش وتیان بەڵێ. فەرمووی((من قسەکەی (تمیم)م پێخۆش بوو هاوشێوەی ئەوە من قسەم بۆ کردن. هەروەها لەبارەی مەدینە و مەککەیشەوە. بزانن کە ئەو لەدەریای شامدایە یاخود دەریای یەمەن، نا بەڵکو لە ڕووی خۆرهەڵاتەوەیە، لەڕووی خۆرهەڵاتەوەیە، لەڕووی خۆرهەڵاتەوەیە)) بەدەستی بەرەو خۆر هەڵات ئاماژەی کرد. دەڵێ: ئەمەم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لەبەرکرد.

١٩٦٤ـ عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((لَيْسَ مِنْ بلدٍ إِلَّا سَيطَؤُهُ الدَّجَالُ، إِلَّا مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، ولَيْسَ نَقْبٌ مِنْ أَنْقَابِهَا إِلَّا عليْه الْملائكَةُ صَافِّينَ تحْرُسُها، فَيَنْزِلُ بِالسِّبْخَة، فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلَاثَ رَجَفَاتٍ، يَخْرُجُ إِلَيْهِ مِنْهَا كُلُّ كَافِرٍ ومُنَافِقٍ)). [بخاري/ فضائل المدينة، ١٧٨٢]

(أنس)ی کوڕی (مالك)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((هیچ وڵاتێك نییە دەجال پێی تێنەنێت، جگە لە مەککە و مەدینە، هەرچی ڕێگەو بانی مەدینە هەیە هەمووی فریشتە بەڕیز تیاوەستاون و پارێزگاری لێدەکەن، لەزەوییەکی ڕووتەنیدا کە گیای لێناڕوێت دادەبەزێت، سێ جار مەدینە دەلەرێنێتەوە هەرچی کافر و مونافیقی تێدایە هەموو دەڕوات بەرەولای جەجاڵ)).

## ( ٤٥ ) حەفتا هەزار جوولەکەکەی ( اسبهان ) شوێن جەجاڵ دەکەون

١٩٦٥ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((يَتْبَعُ الدَّجَّالَ مِنْ يَهُودِ أَصْبَهَانَ سَبْعُونَ أَلْفًا، عَلَيْهِمُ الطَّيَالِسَةُ)).

(انس) کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((حەفتا هەزار جولەکەی ئەسفەهان دوای جەجال دەکەون عەبایان بەسەرشانەوەیە)).

## ( ٤٦ ) هەلاتنی خەڵك لە جەجال بەرەو کێوەکان

١٩٦٦ـ عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ (﵂): أَنَّهَا سَمِعَت النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَيفِرَنَّ النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ فِي الْجِبالِ)). قَالتْ أُمُّ شَرِيكٍ: يا رَسُولَ اللَّهِ، فأَيْنَ الْعَرَبُ يوْمئِذٍ؟ قَالَ: ((هُمْ قَلِيلٌ)).

دایکی (شریك)(﵂) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: ((خەڵکی لەجەجال هەڵدێن بەرەو کێوەکان)) دایکی شریك وتی: عەرەب لە کوێ دەبن ئەو ڕۆژە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((ئەوان کەمن)).

## ( ٤٧ ) لە دروست بوونی ئادەمەوە تا قیامەت هیچ فیتنەیەك لە فیتنەی جەجال گەورەتر نیە

١٩٦٧ـ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ، عَنْ رَهْطٍ، مِنْهُمْ أَبُو الدَّهْمَاءِ وَأَبُو قَتَادَةَ، قَالُوا: كُنَّا نَمُرُّ عَلَى هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ، نَأْتِي عِمْرَانَ ابْنَ حُصَيْنٍ (﵁)، فَقَالَ ذَاتَ يَوْمٍ: إِنَّكُمْ لَتُجَاوِزُونِي إِلَى رِجَالٍ مَا كَانُوا بِأَحْضَرَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنِّي، وَلَا أَعْلَمَ بِحَدِيثِهِ مِنِّي، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَا بَيْنَ خَلْقِ آدَمَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ خَلْقٌ أَكْبَرُ مِنَ الدَّجَّالِ)).

لە(حمید)ی کوڕی (هلال)ەوە، لە چەند پیاوێکەوە، کە (أبو الدهماء) و (أبو قتادە) لەوانن، دەیانوت: ئێمە بەسەر (هشام)ی کوڕی (عامر)دا تێپەڕمان دەکرد، ئەچوون بۆ لای (عمران)ی کوڕی (حصین)(﵁) ڕۆژێکیان ، وتی: ئێوە لە من تێپەڕ دەکەن دەچن بۆ لای پیاوانێك کە لەمن ئاگادارتر نین بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و زیاتر لە خزمەتیدا نەبوون، لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((لەنێوان دروست کردنی ئادەم و ڕۆژی قیامەتدا [فیتنەی] هیچ دروستکراوێك لە [هی] جەجاڵ گەورەتر نیە)).

## ( ٤٨ ) دابەزینی عیسا و شکاندنی خاچ و کوشتنی بەراز

١٩٦٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁) أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَاللَّهِ لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلًا، فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ، وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ، وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلَاصُ فَلَا يُسْعَى عَلَيْهَا، وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ، وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلَا يَقْبَلُهُ أَحَدٌ)). [بخاري/ البيوع/ ٢١٠٩]

(ابو هريرة)(﵁) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سوێند بە خوا کوڕی (مریم) دادەبەزێت دەبێت بە فەرمان ڕەوایەکی دادوەر، خاچ دەشکێنێ و

بەراز دەکوژێت و، سەرانە هەڵدەگرێت و، حوشتری تازە ساڵ واز لێدەهێنرێت و کـەس تـاوی لەســەر نـادات، ڕق و قینەبەرایــەتی و حەسـوودی بەیـەکتربردن لادەبات و، خەڵکی بانگ دەکات بۆ ماڵ و سامان کەس وەری ناگرێت)).

١٩٦٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ، فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ)). فَقُلْتُ لِابْنِ أَبِي ذِئْبٍ: إِنَّ الْأَوْزَاعِيَّ حَدَّثَنَا عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: ((وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ)). قَالَ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ: تَدْرِي مَا ((أَمَّكُمْ مِنْكُمْ))؟ قُلْتُ: تُخْبِرُنِي، قَالَ: فَأَمَّكُمْ بِكِتَابِ رَبِّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ (ﷺ). [بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٦٥]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((حاڵتـان چۆن دەبێت کاتێك کوڕی مریم دادەبەزێتە ناوتان. پێشەواشتان لە خۆتانە .

ڕاوی دەڵێـت: بـە (ابـن ذئـب)م وت: کـە (الاوزاعـی) قسـەی بـۆ کـردوم لـە (الزهراوی)یەوە، ئەویش لە (نافع)ەوە، ئەویش لـە (ابو هريرە)ەوە فەرموودەکە بـەم شـێوەیە ((و امـامکم منکـم)) (ابـن ابـي ذئـب) دەڵێ: دەزانیـت مانـای ((أمکـم منکم) چییە؟ وتم: پێم بڵێ، وتی: پێشەوایەتیتان دەکات بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەتان)).

١٩٧٠ـ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. قَالَ: فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ (عليه السلام)، فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ: تَعَالَ صَلِّ لَنَا، فَيَقُولُ: لَا، إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ، تَكْرِمَةَ اللَّهِ هَذِهِ الْأُمَّةَ)).

(جـابر)ی کـوڕی (عبـدالله)(ﷺ) دەڵـێ: لـە پێغەمبـەری خــوام (ﷺ) بیسـت دەیفـەرموو: ((بـەردەوام کۆمـەڵێك لـە ئومەتەکـەم لەسـەر حـەق سـەرکەوتووانە دەجـەنگن تـا ڕۆژی قیامـەت، ئینجـا عیسـای کـوڕی مەریـەم (عليه السلام) دادەبـەزێت، سەرلەشکرەکەیان دەڵێت: وەرە نوێژمـان بـۆ بکـە، دەڵێـت: نـا، ئێـوە هـەندێکتان لەناو خۆتانا سەرپەرشتیاری هەندێکتانن ئەمەیش ڕێز لێنانێکی خواییە بۆ ئەم ئوممەتە)).

## ( ٤٩ ) من و قیامەت ئاوەهاین

١٩٧١- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يُشِيرُ بِإِصْبَعِهِ الَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ وَالْوُسْطَى وَهُوَ يَقُولُ: ((بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ هَكَذَا)). [بخاري/ التفسير/ ٤٦٥٢]

(سهل)ی کوڕی (سعد)(رضي الله عنه) دەڵـێ: لـە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیست کـە بەپەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاستی ئاماژەی دەکرد و دەیفەرموو: ((من ڕەوانەکراوم لەگەڵ قیامەتدا ئاوەها)).[واتە پێکەوەین]

## ( ٥٠ ) نزیکی قیامەت

١٩٧٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: مَتَى [تَقُومُ] السَّاعَةُ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) هُنَيْهَةً، ثُمَّ نَظَرَ إِلَى غُلَامٍ بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ، فَقَالَ: ((إِنْ عُمِّرَ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ)). قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: ذَاكَ الْغُلَامُ مِنْ أَتْرَابِي يَوْمَئِذٍ.

(أنس)ی کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك لە پێغەمبـەری (ﷺ) پرسـی کـەی قیامەت هەڵدەسێت؟ دەڵێ: ئەویش کەمێك مات بوو پاشان تەماشای منداڵێکی کرد لەبەردەمیدا لە هۆزی (أزدشنوءة)، ئینجا فـەرمووی: ((ئەگـەر ئەمـە عومـری باقی بێت پیر نابێت تا قیامەت هەڵدەسێت)) (أنس)ی کوڕی (مالك) دەڵێ: ئەو منداڵە ئەو ڕۆژە لە تەمەنی مندا بوو.[1]

١٩٧٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ الْأَعْرَابُ إِذَا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سَأَلُوهُ عَنِ السَّاعَةِ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَنَظَرَ إِلَى أَحْدَثِ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ، فَقَالَ: ((إِنْ يَعِشْ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ قَامَتْ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ)). [بخاري/ الرقاق ٦١٤٦]

عائشە (رضي الله عنها) دەڵـێ: دەشـتەکیەکان کاتـێ دەهاتنـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) پرسـیاری قیامـەتیان لێدەکـرد، کـەی قیامـەت دێـت؟ ئـەویش تەماشـای گەنجترین کەسیانی کرد و فەرمووی: ((ئەگـەر ئەمـە بـژی تـا دەگاتـە {قۆنـاغی} پیریی قیامەتی ئێوە هەڵدەسێت)).

---

[1] زانایان دەڵێن: مەبەست لەم فەرموودەیە قیامەتی ئەوانە. واتە مردنیانە.

## ( ٥١ ) قیامەت کتوپڕ دێت

١٩٧٤ـ عنْ أبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) -يبْلُغُ به النَّبيَّ (ﷺ)- قَال: ((تقُومُ السَّاعةُ وَالرّجُلُ يَحْلُبُ اللِّقْحَة، فمَا يصلُ الْإنَاءُ إلى فيه حتَّى تقُومَ. والرَّجُلَان يتبايعان الثَّوْبَ، فما يتَبايَعانه حتَّى تقُومَ والرَّجُلُ يلطُ [في] حَوْضه، فما يَصْدُرُ حتَّى تقُومَ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٤١]

لـە(أبـو هريـرە)ەوە –ئـەویش دەیگەێنێتـەوە بـە پێغەمبـەر (ﷺ)– کـە فەرموویەتی: ((قیامەت دێت کاتێ کەپیاوێك خەریکە حوشترە دۆشەنیەکەی دەدۆشـێت، فریاناکـەوێت جامەکـە بگەیەنێتـە دەمـی قیامـەت هەڵدەسـێت، دووپیاو خەریکی کڕین و فرۆشتنی پۆشاکێك دەبن، مامەڵەکەیان نابڕێننـەوە قیامەت دێـت، پیـاوێکیش خـەریکی چـاك کردنـی حەوزەکەیـەتی، لێنابێتـەوە قیامەت دێت)).

## ( ٥٢ ) ماوەی نێوان فووی یەکەم و دووەم

١٩٧٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ)). قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: ((ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ، قَال: وَلَيْسَ مِنَ الْإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلَّا يَبْلَى، إِلَّا عَظْمًا وَاحِدًا وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). [بخاري/ التفسير/ ٤٥٣٦]

(أبو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ماوەی نێوانی هەردوو فووەکە چلە)) وتیان: ئەی (ابو هريره) چل ڕۆژ؟ وتی: ناڵێم. فەرمووی: ((پاشان خوا بارانێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت {خەڵکی} سەوز دەبنەوە وەك چۆن دانەویڵە سەوز دەبێتەوە، هیچ شتێکیش نییە لە مرۆڤ کە نەڕزێت جگە لـە یـەك ئێسـك ئـەویش کلێنچکەیـە، لـەو کلێنچکـەوە دروسـتکراوەکان پێکدەهێنرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا)).

## ( ٥٣ ) ئافرەت خراپترین فیتنەیە بۆ پیاو

١٩٧٦ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً هِيَ أَضَرُّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ)). [بخاري/ النكاح/ ٤٨٠٨]

(اسامە)ی کوڕی (زید)گێڕاویەتەوە کەلە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویانەتەوەکە فەرموویەتی: ((پاش خۆم لە نێو خەڵکیدا هیچ فیتنەیەکم جێ نەهێشتووە لە فیتنەی ژنان خراپتربێت بۆ پیاوان)).

## ( ٥٤ ) خۆپاراستن لە فیتنەی ژنان

١٩٧٧- عنْ أَبي سعيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خضِرةٌ، وإِنَّ اللَّه مُسْتخْلِفُكُمْ فيهَا فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ، فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاء، فإِنَّ أَوّلَ فتْنَة بَني إِسْرائِيلَ كانَتْ في النِّسَاءِ)).

(ابو سعيد الخدري)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەڕاستیدا دونیا سەوز و شیرینە، خوایش ئێوەی کردۆتە جێنشین تێیدا تەماشا دەکات داخۆ چیدەکەن، خۆتان لە دونیا بپارێزن و. خۆیشتان لە ژنان بپارێزن، چونکە لەڕاستیدا یەکەمین فیتنەی (نەوەی ئیسرائیل) بەهۆی ئافرەتەوە بوو).

# (٦٧) بەشی خۆشنەویستنی دنیا

## (١) نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بنەماڵەکەی

١٩٧٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا)). [بخاري/ الرقاق/ ٦٠٩٥]

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوایە ڕزق و ڕۆزی بنەماڵە و نەوەی (محمد) هەر ئەمەندە بێت پێی بژین)).

## (٢) سەختی ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر و خاو خێزانی

١٩٧٩ـ عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: وَاللَّهِ -يَا ابْنَ أُخْتِي- إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلَالِ ثُمَّ الْهِلَالِ ثُمَّ الْهِلَالِ، ثَلَاثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) نَارٌ. قَالَ: قُلْتُ: يَا خَالَةُ فَمَا كَانَ يُعَيِّشُكُمْ؟ قَالَتْ: الْأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ وَالْمَاءُ، إِلَّا أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) جِيرَانٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَكَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ، فَكَانُوا يُرْسِلُونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ أَلْبَانِهَا فَيَسْقِينَاهُ. [بخاري/ الهبة وفضلها/ ٢٤٢٨]

لە (عروە)وە، ئەویش لە (عائشە)وە (ﷺ) کە دەیوت: بەخوا -ئەی خوشکەزام- ئێمە جاری وابووە مانگی یەکشەوەمان دیوە، دیسان دیومانە، دیسان دیومانە، سێ مانگی یەکشەوە لە دوو مانگدا، لە ماڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاگر نەکراوەتەوە، دەڵێت: وتم جا باشە پورێ بەچی دەژیان؟ وتی: بە خورما و ئاو، بەڵام ئەوە هەیە پێغەمبەر (ﷺ) چەند دراوسێیەکی لە یاریدەدەران -الانصار- هەبوو کاسە دراوسێیان هەبوو، شیریان دەنارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەشی ئێمەی لێدەدا.

١٩٨٠ـ عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: لَقَدْ مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَمَا شَبِعَ مِنْ خُبْزٍ وَزَيْتٍ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ.

(عائشة)ی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا وەفاتی کرد لە ڕۆژێکدا دوو جار تێرنان و ڕۆنی نەخواردووە.

١٩٨١ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) يَوْمَيْنِ مِنْ خُبْزِ بُرٍّ، إِلَّا وَأَحَدُهُمَا تَمْرٌ. [بخاري/ الرقاق/ ٦٠٩٠]

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: خاو خێزانی (محمد)(ﷺ) دوو ڕۆژ لەسەر یەك تێرنانی گەنمیان نەخواردووە بەڵكو ڕۆژێكیان هەر خورما بووە.

١٩٨٢- عَنْ أَبِي حَازِمٍ قال: رأيت أبا هُرَيْرَةَ (ﷺ) يشيرُ بإصْبَعه مراراً يَقول: وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ، مَا أَشْبَعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَهْلَهُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ تِبَاعًا مِنْ خُبْزِ حِنْطَةٍ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. [بخاري/ اوائل كتاب الأطعمة/ ٥٠٥٩]

(أبو حازم) دەڵێ: (أبو هريرة)م بینی چەندین جار بەپەنجەی ئاماژەی دەكرد دەیووت: سوێند بەو كەسەی گیانی (أبو هريرە)ی بەدەستە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خاو خێزانی سێ ڕۆژ لەسەریەك لەنانی گەنم تێر نەبوون تا دونیای بەجێ هێشت.

١٩٨٣- عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَمَا فِي رَفِّي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلَّا شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ. [بخاري/ الخمس/ ٢٩٢٩]

عائشة (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ وەفاتی كرد لەسەر ڕەفەكەمان شتێ نەبوو كە زیندەوەر پێی بژی نیوەن جۆ نەبێت لەسەر ڕەفەیەكم، ماوەیەكی زۆر لێمخوارد، كاتێ پێوام تەواو بوو.

## (٣) پێغەمبەر (ﷺ) خورمای (دقل)[1]ی دەست نەدەكەوت خۆی تێر بكات

١٩٨٤- عَنْ سِمَاكِ ابْنِ حَرْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ (ﷺ) يَخْطُبُ، قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ مَا أَصَابَ النَّاسُ مِنَ الدُّنْيَا، فَقَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَظَلُّ الْيَوْمَ يَلْتَوِي، مَا يَجِدُ دَقَلًا يَمْلَأُ بِهِ بَطْنَهُ.

(سماك)كوڕی (حرب) دەڵێ: گوێم لە (النعمان)ی كوڕی (البشیر)بوو (ﷺ) وتاری دەدا و دەیوت: (عمر)باسی خەڵكی كرد لەوەی تووشیان هاتبوو لە دونیادا، وتی: لەڕاستیدا من پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی ڕۆژ تا ئێوارە سكی هەڵدەگوشی، ئەوەندە خورمای (قەسپی) دەست نەدەكەوت سكی پێ تێر بكات.

## (٤) كۆچبەرە هەژارەكان پێش دەوڵەمەندەكان دەچنە بەهەشت

١٩٨٥- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) -وَسَأَلَهُ رَجُلٌ- فَقَالَ: أَلَسْنَا مِنْ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ؟ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ:

---

[1] خراپترین جۆری خورمایە

أَلَكَ امْرَأَةٌ تَأْوِي إِلَيْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَلَكَ مَسْكَنٌ تَسْكُنُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَنْتَ مِنَ الْأَغْنِيَاءِ. قَالَ: فَإِنَّ لِي خَادِمًا، قَالَ: فَأَنْتَ مِنَ الْمُلُوكِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: وَجَاءَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ –وَأَنَا عِنْدَهُ– فَقَالُوا: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، إِنَّا وَاللَّهِ مَا نَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ، لَا نَفَقَةٍ وَلَا دَابَّةٍ وَلَا مَتَاعٍ. فَقَالَ لَهُمْ: مَا شِئْتُمْ؟ إِنْ شِئْتُمْ رَجَعْتُمْ إِلَيْنَا فَأَعْطَيْنَاكُمْ مَا يَسَّرَ اللَّهُ لَكُمْ، وَإِنْ شِئْتُمْ ذَكَرْنَا أَمْرَكُمْ لِلسُّلْطَانِ، وَإِنْ شِئْتُمْ صَبَرْتُمْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الْأَغْنِيَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى الْجَنَّةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا)). قَالُوا: فَإِنَّا نَصْبِرُ لَا نَسْأَلُ شَيْئًا.

(أبو عبدالرحمن الحُبُلي)دەڵێ: گوێم لە (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عـاص)(ﷺ) بـوو کاتـێ پیـاوێك لێـی پرسـی وتـی: باشـەئێمە لـە هـەژارە کۆچبەرەکان نین؟ (عبدالله) پێی وت ژنت هەیە لەسایەیدا بحەسێیتەوە؟ وتی: بەڵێ: وتی: ئەی خانە ولانەت هەیە تیایا دانیشیت؟ وتی:بەڵێ. وتی: کەواتە تۆ لەدەوڵەمـەندەکانیت، وتـی: خزمەت کارێکیشـم هەیـە. وتـی: کەواتـە تـۆ لـە پادشاکانی (أبو عبدالرحمن). دەڵێ: سێ کەس هاتن بۆلای (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی و (العاص) –منیشی لەلابووم– وتیان: ئەی (أبو محمد)، بەخوا ئێمە توانای هیچمان نییـە، نەبژێوی و نـە ولاخ و نەکەل وپـەل، ئەویش پێـی وتـن: بابەکەیفی ئێوەبێ؟ ئەگەر ئەتانەوێ وەرنەوە بۆ لامان ئەوەی خوا ئاسانی بکات دەتـان دەینێ، ئەگەر دەیشتانەوێ کێشـەکانتان دەخەینـە بەردەستی سوڵتان، ئەگەر دەیشتانەوێ ئارام بگرن، چونکە من لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((بەڕاستی کۆچەرنیە هەژارەکان، لە ڕۆژی قیامەتدا چل پایز پێش دەوڵەمەندەکان دەکەون بۆ بەهەشت)) وتیان: کەواتە ئارام دەگرین و داوای هیچ ناکەین.

## ( ٥ ) زۆرترینی بەهەشتیەکان هەژارەکانن

١٩٨٦ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ، وَإِذَا أَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ، إِلَّا أَصْحَابَ النَّارِ فَقَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ. وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ)). [بخاري/ النكاح/ ٤٩٠٠]

(اسامه)ی کوڕی (زید) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەسەر دەرگای بەهەشت وەستام زۆربەی ئەوانەی لە بەهەشتا بوون هەژارەکان بوون. دەوڵەمەندەکانیش گیر درابوون، بەڵام دۆزەخیەکانیش فەرمانیان پێکرابوو بەرەو ئاگر، لەسەر دەرگای دۆزەخیش وەستام سەیر دەکەم زۆربەی ئەوانەی لە دۆزەخدا بوون ژنان بوون)).

## ( ٦ ) دەربارەی دڵ نەدان بە دونیا

١٩٨٧ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مَرَّ بِالسُّوقِ دَاخِلًا مِنْ بَعْضِ الْعَالِيَةِ وَالنَّاسُ كَنَفَتَهُ [وَفِي رواية: كَنَفَتَهُ] فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ مَيِّتٍ، فَتَنَاوَلَهُ فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ ثُمَّ قَالَ: ((أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنَّ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ)). فَقَالُوا: مَا نُحِبُّ أَنَّهُ لَنَا بِشَيْءٍ، وَمَا نَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: ((أَتُحِبُّونَ أَنَّهُ لَكُمْ)). قَالُوا: وَاللَّهِ لَوْ كَانَ حَيًّا كَانَ عَيْبًا فِيهِ لِأَنَّهُ أَسَكُّ، فَكَيْفَ وَهُوَ مَيِّتٌ؟ فَقَالَ: ((فَوَاللَّهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ هَذَا عَلَيْكُمْ)).

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرووی مەدینەوە بەبازاڕدا گوزەری کرد خەڵکیش لەملاولایەوە بوون. بەلای کارژۆڵەیەکی کەڕیلەی مردارەوە بوودا ڕابورد، دەستی برد گوێچکەی گرت و پاشان فەرمووی: ((کێ ئەمەی دەوێت بە درهەمێك)) وتیان: بە هیچیش نامانەوێت، چی ئالەمە بکەین؟ فەرمووی: ((حەزدەکەن ئەمە بۆ خۆتان بێت)) وتیان: بەخوا ئەگەر زیندوویش بوایە هەر عەیب دار بوو چوونکە تەڕلەیە، نەخوازەلا کەمردارەوە بوویشە؟ فەرمووی: ((دە بەخوا دنیا لای خوا بێ نرخترەن لەبێ نرخی ئەو کارەی لای ئێوە)).

١٩٨٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ)).

(ابو هریره() (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((دنیا بەندیخانەی بڕواداره و بەهەشتی بێباوەڕانە)).

## ( ٧ ) ترسان لە ململانێ لەسەر دنیا

١٩٨٩ـ عَنْ عَمْرِو بْنَ عَوْفٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ (ﷺ) إِلَى الْبَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) هُوَ صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمُ الْعَلَاءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ، فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ.

فَسَمِعَتِ الْأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ فَوَافَوْا صَلَاةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) انْصَرَفَ، فَتَعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ رَآهُمْ، ثُمَّ قَالَ: ((أَظُنُّكُمْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدِمَ بِشَيْءٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ)). فَقَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنِّي أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا عَلَيْكُمْ كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ)). [بخاري/ الجزية والموادعة/ ٢٩٨٨]

(عمرو)ی کوڕی (عوف)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (أبو عبيدة)ی کوڕی (الجراح)ی (ﷺ)نارد بۆ بەحرەین تا سەرانەی خاوەن کتێبەکان کۆبکاتەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ خەڵکی بەحرەین ڕێککەوتبوو، (العلاء )ی کوڕی (الحضرمی) یشی کردبوو بەلێپرسراویان، (أبو عبيدة) بەسامانێکەوە لەبەحرەینەوە گەڕایەوە، کاتێ یاریدەدەران (الانصار) بیستیان (أبو عبيدة)هاتۆتەوە هەموو زوو نوێژی بەیانیان لە خزمەت پێغەمبەرا (ﷺ) کرد. کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژەکەی کرد ڕۆیشت ئەوانیش چوونە ڕێگەکەی، پێغەمبەریش (ﷺ) کاتێ بینی زەردەخەنە گرتی، پاشان فەرمووی: ((وابزانم بیستووتانە کە (ابو عبيدة) شتێکی لەبەحرەینەوە هێناوەتەوە)) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((دە مژدەبێ و بەئومێدی ئەوە بن دڵخۆشتان دەکات، سابەخوا من لە هەژاری ناترسم لەسەر ئێوە بەڵکو من لەوە دەترسم کە دونیا ڕووتان تێ بکات وەك چۆن ڕووی کردە ئەوانەی پێش ئێوە، ئێوەیش کێ بڕکێی لەسەر بکەن وەك چۆن ئەوان کردیان، ئینجا لەناوتان بەرێت، وەك چۆن ئەوانی لەناوبرد)).

## ( ٨ ) ترسان لە ململانێ و حەسودی بەیەکتری بردن

١٩٩٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((إِذَا فُتِحَتْ عَلَيْكُمْ فَارِسُ وَالرُّومُ أَيُّ قَوْمٍ أَنْتُمْ)). قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ (ﷺ): نَقُولُ كَمَا أَمَرَنَا اللَّهُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ، تَتَنَافَسُونَ، ثُمَّ تَتَحَاسَدُونَ، ثُمَّ تَتَدَابَرُونَ، ثُمَّ تَتَبَاغَضُونَ -أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ- ثُمَّ تَنْطَلِقُونَ فِي مَسَاكِينِ الْمُهَاجِرِينَ، فَتَجْعَلُونَ بَعْضَهُمْ عَلَى رِقَابِ بَعْضٍ)).

(عبدالله)ی كوڕی (عمرو) كوڕی (عاص) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئێوە چۆن خەڵكێك دەبن ئەگەر خـوا فارس و ڕۆمـی خستە ژێر دەستتان)) (عبدالرحمن) كوڕی (عوف) (ﷺ) وتی: خوای گەورە چـۆن فەرمانی پێداوین وا دەبین.، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((نەخێر وانابن، ململانێی یەكتر دەكەن، حەسودی بە یەكتری دەبەن، پشت لەیەكتری دەكەن، ڕق لەیەكتری هــەڵدەگرن، -یاوێنــەی ئەمانــەی فــەرموو- دوای ئــەوە بەردەبنــە كۆچبــەرە هەژارەكان و هەندێكیان بەردەدەنە گەردنی هەندێكیان)).

## ( ٩ ) دنیا لە چاو دواڕۆژدا

١٩٩١ـ عَنْ مُسْتَوْرِدًا أَخِي بَنِي فِهْرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَاللَّهِ مَا الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إِلَّا مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ هَذِهِ -وَأَشَارَ يَحْيَى بِالسَّبَّابَةِ- فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ تَرْجِعُ)).

(المستورد) برای (بنی فهر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەخوا دنیا لەچاو دواڕۆژدا هیچ نییە، مەگەر ئەمەندە نەبێت كە یەكێك لـە ئێوە ئەم پەنجەیەی بكات بە ناو دەریادا، پاشان سەیر بكات بزانـێ چـەندە ئاو دەگرێتە خۆی)) {یەحیای ڕاوی ئاماژەی بە پەنجەی شایەتومانی كرد}.

## ( ١٠ ) تاقیكردنەوە بەدنیا و چۆنێتی ئیش كردن تیایدا

١٩٩٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ ثَلَاثَةً فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ: أَبْرَصَ وَأَقْرَعَ وَأَعْمَى، فَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ: فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكًا، فَأَتَى الْأَبْرَصَ فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ، وَيَذْهَبُ عَنِّي الَّذِي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ. قَالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ قَذَرُهُ، وَأُعْطِيَ لَوْنًا حَسَنًا وَجِلْدًا حَسَنًا، قَالَ: فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْإِبِلُ -أَوْ قَالَ: الْبَقَرُ، شَكَّ إِسْحَقُ، إِلَّا أَنَّ الْأَبْرَصَ أَوِ الْأَقْرَعَ، قَالَ أَحَدُهُمَا: الْإِبِلُ، وَقَالَ الْآخَرُ: الْبَقَرُ- قَالَ: فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ، فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا. قَالَ: فَأَتَى الْأَقْرَعَ، فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: شَعَرٌ حَسَنٌ، وَيَذْهَبُ عَنِّي هَذَا الَّذِي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ، قَالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ، [قَالَ:]: وَأُعْطِيَ شَعَرًا حَسَنًا، قَالَ: فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْبَقَرُ، فَأُعْطِيَ بَقَرَةً حَامِلًا، فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ [تعالى] لَكَ فِيهَا. قَالَ: فَأَتَى الْأَعْمَى، فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: أَنْ يَرُدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِي، فَأُبْصِرَ بِهِ النَّاسَ. قَالَ: فَمَسَحَهُ، فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ، قَالَ: فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْغَنَمُ، فَأُعْطِيَ

شَاةُ وَالِدًا، فَأُنْتِجَ هَذَانِ، وَوَلَّدَ هَذَا، [قَالَ]: فَكَانَ لِهَذَا وَادٍ مِنَ الْإِبِلِ، وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْبَقَرِ، وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَمِ، قَالَ: ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الْأَبْرَصَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ قَدِ انْقَطَعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلَا بَلَاغَ لِيَ الْيَوْمَ إِلَّا بِاللَّهِ (ﷻ) وجل ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ وَالْجِلْدَ الْحَسَنَ وَالْمَالَ- بَعِيرًا أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي، فَقَالَ: الْحُقُوقُ كَثِيرَةٌ، فَقَالَ لَهُ: كَأَنِّي أَعْرِفُكَ، أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ، فَقِيرًا فَأَعْطَاكَ اللَّهُ؟ فَقَالَ: إِنَّمَا وَرِثْتُ هَذَا الْمَالَ كَابِرًا عَنْ كَابِرٍ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ: وَأَتَى الْأَقْرَعَ فِي صُورَتِهِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذَا، وَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَى هَذَا، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وَأَتَى الْأَعْمَى فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ، انْقَطَعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلَا بَلَاغَ لِيَ الْيَوْمَ إِلَّا بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي. فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِي، فَخُذْ مَا شِئْتَ وَدَعْ مَا شِئْتَ، فَوَاللَّهِ لَا أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ شَيْئًا أَخَذْتَهُ لِلَّهِ (ﷻ). فَقَالَ: أَمْسِكْ مَالَكَ، فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ، فَقَدْ رُضِيَ عَنْكَ وَسُخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ)). [بخاري/ الأنبياء/ ٣٢٧٧٤]

(ابو هريرة)(ﷺ) لە پێغەمبەری خوای (ﷺ)ی بیستووە کە فەرموویەتی: ((سێ کەس لە نەوەی (اسرائیل) بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك، خوا ویستی تاقیان بکاتەوە، فریشتەیەکی ناردە لایان، هات بۆلای بەڵەکەکە وتی: زۆرتر حەزت لە چییە؟ وتی: ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوان، ئەوەشم لەسەر لاچێ کە بەهۆیەوە خەڵکی بێزم لێدەکەنەوە دەڵێ: ئەویش دەستی بەسەردا هێناو، ئەوەی کەمایەی بێزلێکردنەوە بوو لەسەری لاچوو، ڕەنگێك و پێستیکی جوانی پێ بەخشرا. ووتی: زۆرتر حەزت لە چ سامانێکە؟ وتی: حوشتر یا -وتی: مانگا، (أسحاق) دودڵە، بەڵام بەڵەکەکە یا کەچەڵەکە یەکێکیان وتی: حوشتر و ئەوی تریان وتی: مانگا- دەڵێ: حوشترێکی ئاوسی پێدرا سکەکەی دەمانگ بوو، پێی‌وت: خوا فەڕ و بەرەکەتی تێ خات بۆت. دەڵێ: ئینجا هات بۆلای کەچەڵەکە، وتی: زیاتر حەز لەچی دەکەیت؟ وتی: قژێکی جوان، ئەوەشم لەسەر لاچێ کە خەڵکی بەهۆیەوە بێزم لێدەکەنەوە. دەڵێ: دەستی بەسەردا هێنا و ئەوەی لەسەر لاچوو، قژێکی جوانی پێ درا وتی: ئەی زیاتر حەزت بەچ جۆرە سامانێکە، وتی: مانگا، ئەویش مانگایەکی ئاوسی پێدرا و وتی: خوای

بالأدەست فەڕ و بەرەکەتت بۆ تیٚبخات، ئینجا هات بۆلای کوێرەکە، وتی: زیاتر حەزت بە چ شتێکە؟ وتی: خوا چاوم بۆ بگێرێتەوە، خەڵکی پێبیبینم، دەڵێت: دەستی بەسەردا هێنا، خوا چاوی بۆ گەڕانەوە، وتی: ئەی زیاتر حەزت لە چ سامانێکە؟ وتی: مەڕ، مەڕێکی بزۆکیش بەو بەخشرا، وشتر و مانگاکە بەریان لێکەوتەوە و مەڕەکەیش بەرخی بوو، هەتا وای لێهات ئەمیان شیویٚ وشتر و، ئەویان شیویٚ گاگەل و، ئەمەی تریشیان شیوێك مەڕی هەبوو، دەڵێت: پاش ماوەیەك فریشتەکە لە سەر شێوە و وێنەی خۆی هاتەوە بۆلای بەڵەکەکە و، وتی: پیاوێکی هەژارم لەسەفەردا دەستی بەرودوام بڕاوە، ئەمڕۆ کەس شك نابەم بەهانامەوە بێت جگەلە خوا و پاشان تۆ نەبێت، تو ئەو کەسەی ئەو ڕەنگ و پێستە جوان و ماڵەی پیٚ خەڵات کردی داوات لێدەکەم وشترێکم بدەیتیٚ لەم سەفەرەمدا پێی بگەمە مەنزڵ، وتی: کورە ئەرکی زۆرمان لەسەرە ، پێیوت: کورە وەکو بت ناسم وایە، ئەی تۆ بەڵەك نەبوویت و خەڵکی بێزیان لێدەکردیتەوە، هەژار نەبویت خوا پێیدایت؟ وتی: من ئەم ماڵ و سامانەم لە باوباپیرەوە دەست بەدەست بۆ ماوەتەوە، وتی: دە ئەگەر درۆ دەکەیت خوا وەکو خۆتت لێبکاتەوە، دەڵیٚ: ئەمجا هات بۆلای کەچەڵەکە لەسەر شێوە و وێنەی جارانی خۆی، ئەوەی بەوی وت، بەمیشی وت، ئەویش هەمان وەلامی دایەوە، ئەویش وتی ئەگەر درۆ دەکەیت خوا وەکو خۆتت لێبکاتەوە، دەڵیٚ: ئەمجا هات بۆلای کوێرەکە لەسەر شێوە و وێنەی جارانی خۆی، وتی: کابرایەکی هەژارم ڕێبوارم، دەستی بەرودوام بڕاوە، کەس شك نابەم بە فریامەوە بێت جگە لە خوا و پاشان تۆ نەبێت، داوات لێدەکەم تو ئەو کەسەی چاوی پێدایتەوە مەڕێکم بدەیتی لەم سەفەرەمدا پێی بگەمە مەنزڵ، وتی: من کوێر بووم خوا چاوی دامەوە بەخوا دەست ناهێنمە ڕێت، لە ڕێگەی خوای گەورەدا بە ئارەزووی خۆت بکە چی دەبەیت بیبە و چیش نابەیت مەیبە، ئەویش وتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، ئێوە تاقیکرانەوە خوا لەتۆ ڕازی بوو و خەشم و قینی گرت لە دوو هاوەڵەکەت.

## ( ١١ ) کەمی دونیا و ئارام گرتن لێی و گەلأی درەخت خواردن

١٩٩٣ـ عَنْ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ (ﷺ) قَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لَأَوَّلُ رَجُلٍ مِنَ الْعَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَقَدْ كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مَا لَنَا طَعَامٌ نَأْكُلُهُ

إلَّا ورقُ الْحُبْلَةِ وهَذَا السَّمُرُ، حتَّى إنَّ أحدنا ليضعُ كمَا تضعُ الشَّاةُ، ثُمَّ أصْبحَتْ بنُو أسَدٍ تُعزِّرُني على الدِّينِ، لقدْ خبْتُ إذًا وضلَّ عملِي. [بخاري/ الرقاق/ ٦٠٨٨]

(سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) (ﷺ) دەڵێ: بەخوا من یەکەمین پیاوم لەعەرەب کە تیری تەقاندبێت لە ڕێی خوادا، ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) جەنگمان دەکرد، هیچ خۆراکێکمان نەبوو بیخۆین جگە لەگەڵای (الحبلة)و (السمر)؛ کە دوو درەختی دڕکاوین ، تا وامان لێهات وەك مەڕ پشقلمان دادەنا، ئێستەش وایلێهاتووە بەرەی (أسد) ئامۆژگاریم دەکەن لەسەر دین. ئەگەر وا بێ من ڕەنجەڕۆ بووم و کردەوەکانم پوچەڵ بۆتەوە.

١٩٩٤ـ عَنْ خَالدِ بْنِ عُمَيْرٍ الْعَدَوِيِّ قال: خَطَبَنَا عُتْبَةُ بْنُ غَزْوَانَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أمَّا بَعْدُ، فَإنَّ الدُّنْيَا قَدْ آذَنَتْ بِصَرْمٍ، وَوَلَّتْ حَذَّاءَ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْهَا إلَّا صُبَابَةٌ كَصُبَابَةِ الْإِنَاءِ يَتَصَابُّهَا صَاحِبُهَا، وَإِنَّكُمْ مُنْتَقِلُونَ مِنْهَا إلَى دَارٍ لَا زَوَالَ لَهَا، فَانْتَقِلُوا بِخَيْرِ مَا بِحَضْرَتِكُمْ، فَإِنَّهُ قَدْ ذُكِرَ لَنَا أَنَّ الْحَجَرَ يُلْقَى مِنْ شَفَةِ جَهَنَّمَ، فَيَهْوِي فِيهَا سَبْعِينَ عَامًا لَا يُدْرِكُ لَهَا قَعْرًا، وَ وَاللَّهِ لَتُمْلَأَنَّ، أفَعَجِبْتُمْ؟ وَلَقَدْ ذُكِرَ لَنَا أَنَّ مَا بَيْنَ مِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ مَسِيرَةُ أَرْبَعِينَ سَنَةً، وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَيْهَا يَوْمٌ وَهُوَ كَظِيظٌ مِنَ الزِّحَامِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنِي سَابِعَ سَبْعَةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مَا لَنَا طَعَامٌ إلَّا وَرَقُ الشَّجَرِ، حَتَّى قَرِحَتْ أَشْدَاقُنَا، فَالْتَقَطْتُ بُرْدَةً فَشَقَقْتُهَا بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ، فَاتَّزَرْتُ بِنِصْفِهَا وَاتَّزَرَ سَعْدٌ بِنِصْفِهَا، فَمَا أَصْبَحَ الْيَوْمَ مِنَّا أَحَدٌ إلَّا أَصْبَحَ أَمِيرًا عَلَى مِصْرٍ مِنَ الْأَمْصَارِ، وَإِنِّي أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ فِي نَفْسِي عَظِيمًا وَعِنْدَ اللَّهِ صَغِيرًا، وَإِنَّهَا لَمْ تَكُنْ نُبُوَّةٌ قَطُّ إلَّا تَنَاسَخَتْ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَاقِبَتِهَا مُلْكًا، فَسَتَخْبُرُونَ وَتُجَرِّبُونَ الْأُمَرَاءَ بَعْدَنَا.

(خالد)ی کوڕی (عمير العدوي) دەڵێ: (عتبة)ی کوڕی (غزوان)(ﷺ) وتارێکی بۆداین، سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان وتی: لەپاشان بزانن کە دنیا تازە بڕیاری خوا حافیزی داوەو، پشت پێی لێهەڵکردووە، ئەوەی لێی ماوەتەوە وەك چۆڕە ئاوێك وایە لە قاپێکدا، کەخاوەنەکەی هەڵیدەمژێت، بزانن کە ئێوە دەگوێزنەوە بەرەو خانەیەك کە تەواو بوونی نیە، کە وابوو بەچاکترین تووێشووەوە بەجێ‌ی‌بێڵن، چونکە ئێمە بۆمان باسکراوە کە بەرد لە لێواری دۆزەخەوە بەردەدرێتەوە بە حەفتا ساڵ ناگاتە بنی ، سوێند بە خوا کە هەردووکیان پڕدەکرێن ، ئایا سەرتان سوڕماوە؟ ئایا سەرتان سوڕ دەمێنێ؟

هەروەها بۆمان باس کراوە، کە نێوانی هەردوو لاشیپانی دەروازەی بەهەشت چل ساڵ ڕێیە، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕۆژێك دێت جمەی دێت لە عەشامدا، ڕۆژگارێکیش بوو من حەوتەمین کەس بووم لەو حەوت کەسەی کەلە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)بووین. خۆراکمان نەبوو جگە لە گەڵای درەخت، تا لچو لێومان قڵیشا، جارێکیان پۆشاکێکم دۆزیەوە کردم بە دوو کەرتەوە، لە نێوان خۆم و (سعد)ی کوڕی (مالك)دا بەشمان کرد، من نیوەیم کرد بە پشتەماڵ بۆ خۆم و (سەعد)یش نیوەکەی تری، ئێستەش دەبینن ئەمڕۆ هەر یەکێك لە ئێمە بووە بە کاربەدەست لەسەر ناوچەیەك لە ناوچەکان، من پەنا بەخوا دەگرم لەوەی کەلە دڵی خۆمدا خۆم بە گەورە بزانم، بەڵام لای خوا بچوك بم، بیشزانن کە هەرگیز هیچ پێغەمبەرایەتیەك نەبووە، مەگەر گۆڕاوە و لەسەرەنجامدا بۆتەوە بە پادشایەتی و پەیڕەوانی لەخۆیان گۆڕاون، لەمەولا لە دونیا تێدەگەن و پاش ئێمەش کاربەدەستانتان بۆ تاقی دەبێتەوە.

## ( ١٢ ) ئەوەی بۆ مردوو دەمێنێتەوە

١٩٩٥ـ عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلَاثَةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى وَاحِدٌ: يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ، وَيَبْقَى عَمَلُهُ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٤٩]

(أنس) ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سێ شت شوێن مردوو دەکەوێت، دوانیان دەگەڕێتەوە و یەکێکیان دەمێنێتەوە، خزم و کەس و کار و ماڵەکەی دەگەڕێنەوە، کردەوەکەی دەمێنێتەوە)).

## ( ١٣ ) تەماشای لەخۆتان خوارتر بکەن

١٩٩٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلَا تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لَا تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللَّه – قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ– عَلَيْكُمْ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٢٥]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی(( تەماشای لەخۆتان خوارتر بکەن، تەماشای لە خۆتان ژوورتر مەکەن، ئەوە باشترە بۆ ئەوەی ناز و نیعمەتی خوا بەسەرتانەوە بەکەم تەماشا نەکەن)).

## ( ١٤ ) خوا بەندەی خواناسی دەوڵەمەندی نادیاری خۆشدەوێت

١٩٩٧ـ عَنْ عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ (ﷺ) فِي إِبِلِهِ، فَجَاءَهُ ابْنُهُ عُمَرُ، فَلَمَّا رَآهُ سَعْدٌ قَالَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ هَذَا الرَّاكِبِ. فَنَزَلَ فَقَالَ لَهُ: أَنَزَلْتَ فِي إِبِلِكَ وَغَنَمِكَ وَتَرَكْتَ النَّاسَ يَتَنَازَعُونَ الْمُلْكَ بَيْنَهُمْ؟ فَضَرَبَ سَعْدٌ فِي صَدْرِهِ فَقَالَ: اسْكُتْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ التَّقِيَّ الْغَنِيَّ الْخَفِيَّ)).

(عامر)ی کوڕی (سعد) دەڵێ: (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) (ﷺ) لەناو گەلەوشترەکەیدا بوو، (عمر)ی کوڕی هات بۆلای، کاتێ (سعد) بینی وتی: پەنا بەخوا دەگرم لە زیانی ئەم سوارە. کە دابەزی پێیوت: تۆ بۆ خۆت لە نێو ڕانە وشتر و مەڕی خۆت دایت و خەڵکیشت واز لێهێناوە لە نێو خۆیاندا کێشمە کێشمیانە لەسەر موڵك و دەسەڵات؟ ئەویش دای بەسنگیدا و وتی: بێدەنگ بە! من لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((بێگومان خوا بەندەی خواناسی دەوڵمەندی شاراوەی خۆش دەوێت)).

## ( ١٥ ) کەسێ شەریك بۆ خوا دابنێ لە کردەوەکانیدا

١٩٩٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ)).

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿من لەهەموو شەریکەکان بێنیاز ترم لەشەریك، کەسێ کردەوەیەك بکات و جگە لەمنی تێدا بەشدار بکات واز لە خۆی و شەریکەکەی دێنم﴾)).

## ( ١٦ ) کەسێ بۆ ناو و شۆرەت ڕەنج بدات

١٩٩٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ، وَمَنْ رَاءَى رَاءَى اللَّهُ بِهِ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٣٤]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((کەسێك بۆ ناوبانگ بیستنەوە کار بکات خوا ناوی دەزڕێنێت، کەسێکیش بۆ بەرچاوێنی کار بکات، خوا لە پێش چاوی خەڵکی ئابڕوی دەبات)).

## ( ١٧ ) چونە ناو دۆزەخ بەهۆی بەلای زمانەوە

٢٠٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مَا يَتَبَيَّنُ مَا فِيهَا، يَهْوِي بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ)).
[بخاري/ الرقاق/ ٦١١٢]

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((جاری واهەیە بەندە قسەی ئەوتۆ دەکات کە بیر لە سەرەنجامەکەی ناکاتەوە، خوا بەهۆی ئەو قسەوە دوورتر لە نێوان خۆرهەڵات و خۆر ئاوا بەری دەداتەوە ناو دۆزەخ)).

## ( ١٨ ) بڕوادار هەموو کارێکی مایەی خێرە بۆی

٢٠٠١- عَنْ صُهَيْبٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لِأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ: إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ)).

(صـهیب)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((کـار و بـاری بڕوادار جێـی سەرسوڕمانە، هەموو کار و فرمانێکی هـەر مایـەی خـێرە بـۆی، ئەمەش بۆ هیچ کەس نیە جگە لەباوەڕدار، ئەگەر تووشی خۆشگوزەرانی ببێت سوپاسی خوا دەکات دەبێتـە مایەی خێر بۆی، خۆ ئەگەر توشی زیانمەندی ببێت ئارام دەگرێت هەر دەبێتە مایەی خێر بۆی)).

## ( ١٩ ) ئارام گرتن لەسەر بەلا و چیرۆکی خاوەن لەغەمەکان

٢٠٠٢- عَنْ صُهَيْبٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ، فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ: إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ، فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلَامًا أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ. فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلَامًا يُعَلِّمُهُ، فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ إِذَا سَلَكَ رَاهِبٌ، فَقَعَدَ إِلَيْهِ، وَسَمِعَ كَلَامَهُ فَأَعْجَبَهُ، فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ، فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ، فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ، فَقَالَ: إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ فَقُلْ: حَبَسَنِي أَهْلِي، وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ: حَبَسَنِي السَّاحِرُ. فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَتَى عَلَى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ، فَقَالَ: الْيَوْمَ أَعْلَمُ: آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ؟ فَأَخَذَ حَجَرًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ، فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ، فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا وَمَضَى النَّاسُ، فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: أَيْ بُنَيَّ، أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي، قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى، وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلَا تَدُلَّ عَلَيَّ. وَكَانَ الْغُلَامُ يُبْرِئُ

الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَيُدَاوِي النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الْأَدْوَاءِ، فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ، فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ، فَقَالَ: مَا هَاهُنَا لَكَ أَجْمَعُ إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِي. فَقَالَ: إِنِّي لَا أَشْفِي أَحَدًا، إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ (ﷻ)، فَإِنْ [أَنْتَ] آمَنْتَ بِاللَّهِ دَعَوْتُ اللَّهَ (ﷻ) فَشَفَاكَ، فَآمَنَ بِاللَّهِ فَشَفَاهُ اللَّهُ (ﷻ)، فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ؟ قَالَ: رَبِّي. قَالَ: وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِي؟ قَالَ: رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ. فَأَخَذَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلَامِ، فَجِيءَ بِالْغُلَامِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: أَيْ بُنَيَّ قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ، وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ، فَقَالَ إِنِّي لَا يَشْفِي أَحَدًا، إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ (ﷻ). فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ، فَجِيءَ بِالرَّاهِبِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى فَدَعَا بِالْمِنْشَارِ، فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ، ثُمَّ جِيءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ، فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ، ثُمَّ جِيءَ بِالْغُلَامِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا، فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذُرْوَتَهُ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلَّا فَاطْرَحُوهُ، فَذَهَبُوا بِهِ فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ. فَرَجَفَ بِهِمُ الْجَبَلُ فَسَقَطُوا، وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللَّهُ. فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورٍ، فَتَوَسَّطُوا بِهِ الْبَحْرَ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلَّا فَاقْذِفُوهُ، فَذَهَبُوا بِهِ، فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ. فَانْكَفَأَتْ بِهِمُ السَّفِينَةُ فَغَرِقُوا وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللَّهُ. فَقَالَ لِلْمَلِكِ إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ. قَالَ: وَمَا هُوَ قَالَ تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَتَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ خُذْ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِي، ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قُلْ: بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلَامِ، ثُمَّ ارْمِنِي، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ قَتَلْتَنِي، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ أَخَذَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ، ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلَامِ، ثُمَّ رَمَاهُ، فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ فِي مَوْضِعِ السَّهْمِ، فَمَاتَ، فَقَالَ النَّاسُ: آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ، آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ. فَأُتِيَ الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ: أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ؟ قَدْ وَاللَّهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ، قَدْ آمَنَ النَّاسُ. فَأَمَرَ بِالْأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ، وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ، وَقَالَ: مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ فَأَحْمُوهُ فِيهَا، أَوْ قِيلَ لَهُ: اقْتَحِمْ،

ففعلُوا، حتّى جَاءت امْرَأةٌ وَمعها صَبِيٌّ لها فتَقاعَسـتْ انْ تقع فيها، فقال لـها الْغُلامُ: يَا أمّه اصْبِري، فإنّك عَلَى الْحَقِّ)).

(صهيب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەوانەوەی پێش ئێوەوە پادشایەك هەبوو، کە جادوگەرێکی هـەبوو کاتێ جادوگەرەکە پـیربوو بەپادشای وت: من چوومەتە ساڵەوە منالێکم بۆ بنێرە با فێری جادووی بکەم، ئەویش منداڵێکی بۆ نارد تا فێری بکـات. لـە ڕێگەکـەیدا کـە هـاتوچۆی پیـا دەکـرد، خواناسـێکی گۆشـە گیر هــەبوو ئـەویش لای دانیشـت و، گوێـی لـە قسەکانی ڕاگرت پێی خۆش بوو، جا کاتێ دەچوو بۆلای جادوگەرەکە بەلای خواناسەکەدا ڕائەبوورد و لای دادەنیشت و، [دوا دەکەوت] کاتێ دەچوو بۆلای جادوگەرەکە لێیـدەدا [چونکە دوا دەکـەوت] سسکاڵای ئـەوەی لای خواناسـەکە کرد، ئەویش وتی: ئەگەر کاتێ لە جادوگەرەکە ترسـای بڵێ: لەماڵـەوە دوایـان خستم، کاتێکیش لەماڵەوە ترسایت بڵێ جادوگەرەکە دوای خستم. لـەکاتێکدا ئەو لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بوو ڕۆژێکیان هات بەسەر دەعبایەکی گەورەدا کە ڕێی لە خەڵکی گرت بوو، وتـی: ئـەبێ ئەمڕۆ بزانم: داخۆ جادوگەرەکە باشترە یان خواناسەکە؟ بەردێکی هەڵگرت و وتی: خوایە ئەگەر ئیشی خوانەسەکەت لا خۆشەویسترە لە ئیشی جادوگەرەکە، ئەم دەعبایە بکوژە تا خەڵکی دەرباز بن، بەردەکەی تێگرت و دەعباکەی کوشت و خەڵکەکە دەربـاز بـوون، ئینجـا هـات بۆلای خواناسەکە و ئەمەی بۆ باس کرد، کابرای خواناس پێی‌وت: ئەی کوڕی خۆم، ئەمڕۆ تۆ لەمن باشتری، کارت گەیشـتۆتە ئەو ڕادەیـەی کـە من دەیبینـم، دڵنیابە تـۆ توشـی گیروگرفت دەبی، جا ئەگەر گرفتـار بوویـت، خەبـەر لـە مـن نەدەیت، ئەمەو منداڵەکە وای لێهاتبوو کوێری زگماگ و بەڵەکی چاك دەکردەوە و لەدەرد و نەخۆشیەکانی دیکەیش چارەی دەکرد، هاودەمێکی پاشا کە کوێـر بوو ئەمەی بیست، بە خەڵات و بەراتێکی زۆرەوە هات بۆلای، وتـی: هـەموو ئەم دیاریەم بۆتۆ ئەگەر چاکم بکەیتەوە. ئەویش وتی: خۆ من کەس چاك ناکەمەوە، بەڵکو هەر تەنها خوای بەرز و باڵادەست خەڵکی چاك دەکاتـەوە، ئەگەر تۆیـش باوەڕبەخوا بێنیـت، داوات لـەخوای گـەورە و باڵادەسـت بـۆ دەکـەم، کـەچاکت بکاتـەوە، ئەویش بـاوەڕی بە خـوا هێنـا و خـوای گـەروە و باڵادەستیش چـاکی کردەوە، هاتـەوە بـۆلای پادشـا و لەلایـەوە دانیشـت هـەروەك چـۆن لـەوەپێش

دائەنیشت، پادشا پێی وت: کێ چاوی پێدایتەوە؟ وتی: پەروەردگارم، وتی: بۆ پەرەردگارێکی ترت هەیە جگە لەمن؟ وتی: پەروەردگاری منیش و تۆیش هەر خوایە. ئەویش گرتی و دەستی کرد بە ئەشکەنجە دانی تاوەکو خەبەری لە منداڵەکەدا، ئینجا منداڵەکەیان هێنا، پادشا پێی وت: کورە بچکۆلەی خۆم، لە جادوگەریدا گەیشتویتە ئاستێك کە کوێرو بەڵەکی زگماگ چاك دەکەیت، و ئەوە دەکەیت و ئەوە دەکەیت، وتی: من کەس چاك ناکەمەوە، تەنها هەر خوای گەورە و باڵادەست خەڵکی چاك دەکاتەوە، ئەویشی گرت و دەستی کرد بە ئەشکەنجەدانی، تا خەبەری لە کابرای خواناس دا، خواناسەکەیش هێنرا پێی وترا: لە دینەکەت پاش گەز بەرەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، بانگی کرد هەرەیەکیان[1] بۆ هێنا هەرەکەی لەسەر تەوقی سەری دانا تا کردی بە دوو کەرتەوە، پاشان هاودەمەکەی پادشا هێنرا، پێی وترا: لە دینەکەت پاشگەز بەرەوە ئەویش ڕازی نەبوو، هارەی لەسەر سەری دانا و ئەویشی کرد بە دوو پارچەوە، ئینجا منداڵەکەیان هێنا و پێی وترا لە دینەکەت پاشگەز بەرەوە، ئەمیش ڕازی نەبوو، دایە دەست کۆمەڵێك لە پیاوەکانی و وتی ببیەن بۆ شاخی ئەوێ و ئەوێ سەری‌خەن بۆ سەر شاخەکە، کە گەیشتنە لوتکەکەی، ئەگەر لە دینەکەی پاشگەز بوویەوە باشە، ئەگەر نا فڕێیدەنە خوارەوە، ئەوانیش بردیان و بە شاخەکەدا سەریان خست، وتی: خوایە چۆن دەتەوێت ئەمانەم لە کۆڵ بکەرەوە، شاخەکە کەوتە لەرزین ئەوان کەوتنە خوارەوە، ئەمیش هاتەوە بۆلای پادشا، پادشا پێی وت: هاوەڵەکانت چییان کرد؟ وتی: خوا لە کۆڵمی کردنەوە، ئەویش دایەوە دەست چەند کەسێکی دیکە لە پیاوەکانی و وتی: ببیەن لە بەلەمێکدا هەڵی‌گرن تا دەگەنە ناوەڕاستی دەریاکە، ئەگەر لە دینەکەی پاش گەز بوویەوە باشە ئەگەر نا فڕێیدەنە ناوی ، ئەوانیش بردیان، ئەویش وتی: خوایە چۆن دەتەوێت ئەمانەم لە کۆڵ بکەرەوە. کەشتیەکە پێیانەوە قڵپ بوویەوە و هەموو نوقم بون و ئەویش هاتەوە بۆلای پادشا، پادشا پێی وت: هاوەڵەکانت چییان لێهات؟ وتی: خوا لە کۆڵمی کردنەوە. ئینجا بە پادشای وت: تۆ ناتوانیت من بکوژیت، تا چیت پێدەڵێم ئەوە دەکەیت، وتی: ئەوە

---

[1] هارە یا هەرە: مەبەست مشارە.

چییـە؟ وتـی: خـەڵكی هـەموو لەیـەك گۆڕەپـاندا كـۆ كـەرەوە و بم بەسـتە بـە دارخورمایەكەوە، پاشان تیرێك لـە تیروكەوانەكـەم دەربهێنـەوە و، تیرەكە بخـەرە ناو جەرگەی كەوانەكەوە و پاشان بڵێ: بە ناوی خـوای پـەروەردگاری منداڵەكە و دوای ئەوە تیرەكەم تێگرە، ئەگـەر تۆ ئەمـەت كرد، ئیـتر دەمكوژیـت، ئـەویش خـەڵكی هەموو لەیـەك خـاكدا كۆكـردەوە و بـەبنكی دارخورمایەكـەوە شـەتەكی داو، پاشان تیرێكی لە تیر دانەكەی هەڵگرت و، خستیە ناوجەرگەی كەوانەكەوە وتـی: بەناوی خـوا، پـەروەردگاری منداڵەكـە. تیرەكـەی تێگـرت، بـەر لاجـانگی كەوت، دەستی نایە سەر شوێنـی تیرەكە و مرد، خەڵكی هەموو وتیان باوەڕمان هێنـا بە پەروەردگاری منداڵەكـە، باوەڕمـان هێنـا بـە پـەروەردگاری منداڵەكـە، باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری منداڵەكە، زەلامێك هات بۆلای پادشا و پێی وت: ئایا دەزانیت ئەوەی لێی دەترسای سوێند بەخوا ئـەمڕۆ ڕوویدا لێـت، خـەڵكی تازە باوەڕیان هێنا. ئەویش فـەرمانی دەركـرد بـە لەغـەم لێـدان، لەسـەر كوچـە و كۆڵانـەكان لەغـەم لێدرا و ئاگری تێداكرایـەوە و وتـی: هەركـەس لـە دینەكـەی پاشگەز نەبوویەوە بیسوتێن تیایدا، یان پێی بوترێت خۆتی تێفرێدە، ئەوانیش وایان كرد، تاوەكو تەنانەت ژنێك هات منداڵێكی خۆی پێبوو، سڵی كرد لەوەی خـۆی تێ فرێدا، منداڵەكەی پێـی وت: دایـە ئارام بگـرە، چونكە بەڕاسـتی تـۆ لەسەر حەقی))،

# (٦٨) بەشی گەورەیی قورئان

## ( ١ ) گەورەیی سورەتی ( فاتحة )

٢٠٠٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: ((هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ، لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَقَالَ: هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الْأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَسَلَّمَ وَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا، لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلَّا أُعْطِيتَهُ)).

(ابـن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: لـەکاتێکدا (جـبریل) لای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دانیشتبوو، گوێـی لە جیڕەیەك بـوو لـە ژوور سـەریەوە، سـەری بـەرز کـردەوە فـەرمووی: ((ئەوە دەرگایـەکی ئاسمـان بـوو ئـەمڕۆ کرایـەوە، جگـە لـە ئـەمڕۆ هـەرگیز نەکراوەتـەوە، فریشـتەیەکی لێهاتـە خـوارەوە، فـەرمووی: ((ئەمـە فریشتەیەکە دابەزیوەتە سەر زەوی هەرگیز دانەبـەزیوە ئـەمڕۆ نـەبێت، سەلامی کرد و وتی: مـژدە بێ دوو ڕووناکیت پێ خەڵات کراوە ، بە هیچ پێغەمبەرێك پێش تۆ خەڵات نەکراوە، سورەتی فاتیحە و کۆتایی سورەتی بەقەرە هەر پیتێك لە هەرکامیان بخوێنی {هەر داخوازیەکی تێدابێت} خوا پێتدەبەخشێت)).

## ( ٢ ) سورەتی ( البقرة ) و ( ال‌عمران )

٢٠٠٤ـ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لِأَصْحَابِهِ. اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا. اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلَا تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ)). قَالَ مُعَاوِيَةُ: بَلَغَنِي أَنَّ الْبَطَلَةَ: السَّحَرَةُ.

(أبـو أسـامة الباهلي)(ﷺ) دەڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا بـووە (ﷺ) فەرموویەتی: ((قورئان بخوێنن، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و تکا دەکات بۆ خاوەنـەکانی هـەردووگوڵ ڕەنگەکـە بخوێنـن: (البقـرة) و سـورەتی (ال‌عمـران) چونکە ئەم دوانە لە ڕۆژی قیامەتدا وەك دوو پەڵە هەور، یا وەك دوو سێبەر، یا وەك دوو پۆل لـە بـاڵندە کـە باڵیـان ڕەپ کـردووە [لـە ئاسمانـا] دێـن بـەرگری

لەخاوەنەکانیان دەکەن. سورەتی (البقـرە) بخوێنـن چونکـە خوێندنـی پیـت و بەرەکەتـەو، وازلێـهێنانی مایـەی پەشـیمانی و خەفەتـە، کەسـانی بێـورەو کەمتەرخەم پێی نـاوێرن، معاویـە دەڵـێ: پێـم گەیشـتووە کـە کەسـانی بێـورە مەبەستی جا دووگەرانە)).

## ( ٣ ) گەورەیی ( آیة الکرسی )

٢٠٠٥ـ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا أَبَا الْمُنْذِرِ، أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ (ﷻ) مَعَكَ أَعْظَمُ)). قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: ((يَا أَبَا الْمُنْذِرِ، أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ)). [قَالَ]: قُلْتُ: ﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ [البقرة: ٢٥٥]. قَالَ: فَضَرَبَ فِي صَدْرِي وَقَالَ: ((وَاللَّهِ لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ)).

(ابي)کوڕی (لعب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ئـەی (ابـو المنـذر)دەزانـی چ ئایـەتێك لـە کتێبـی خـوای بالادەسـت لەهـەمووان گەورەترە)). دەڵێ: وتم: خوا و پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: ((ئەی (ابو المنذر) دەزانی چ ئایەتێك کەلە خزمەتیدای، لە کتێبی خوای بالا دەسـت لـە هەموان گەورەترە)). [دەڵێت] وتم (الله لا اله الا هو الحی القیوم) [البقرە/ ٢٥٥] دەڵێ: دەستی دابەسنگما و فەرمووی: ((بەخوا [پێکاوتە] زانسـت و زانیـاریت لێپیرۆز بێت ئەی (ابو المنذر))).

## ( ٤ ) کۆتـاییەکانی سورەتی ( البقرة )

٢٠٠٦ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ قَرَأَ هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ)). [بخاري/ المغازي/ ٣٧٨٦]

(ابو مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((هەرکـەس ئەو دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی (البقرە) لە شەوێکدا بخوێنێت بەسیەتی)).

## ( ٥ ) گەورەیی سورەتی ( البقرە )

٢٠٠٧ـ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنَ [فتنة] الدجال)). وفي رواية: ((مِنْ آخِرِ الْكَهْفِ)).

(ابو الدرداء) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس دە ئایـەت لەسـەرەتای سـورەتی (الکـهف) لەبـەر بکـات لـە زیـانی (جـەجال) دەپارێزرێت)). لەریوایەتێکدا: ((کۆتایی سورەتی (الکهف))).

## ( ٦ ) گەورەیی خوێندنی : (( قل هو الله احد ))

٢٠٠٨ـ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ)). قَالُوا: وَكَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٢٧]

(أبو الدرداء) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی: ((ئایا هیچ کام لە ئێوە ناتوانێت سێ یەکی قورئان بخوێنێت لە شەوێکدا)) وتیان: جا سێ یەکی قورئان چۆن دەخوێندرێت؟ فەرمووی: ((﴿قل هو الله احد﴾ لەجێی سێ یەکی قورئانە)).

٢٠٠٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ رَجُلًا عَلَى سَرِيَّةٍ، وَكَانَ يَقْرَأُ لِأَصْحَابِهِ فِي صَلَاتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِـ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ فَلَمَّا رَجَعُوا ذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: ((سَلُوهُ لِأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ)). فَسَأَلُوهُ، فَقَالَ: لِأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ)). [بخاري/ التوحيد/ ٦٩٤٠]

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی کرد بە فەرماندەی هێزێك، ئەو پیاوە لەبەرنوێژی هاوەڵەکانیدا کە قورئانی دەخوێند و بە ﴿قل هو الله احد﴾ کۆتایی پێدەهێنا، کاتێك گەڕانەوە ئەوەیان لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس کرد، فەرمووی: ((لێی بپرسن بۆچی وا دەکات، ئەوانیش لێیان پرسی و وتی: لەبەر ئەوەی کە سیفەت و ناوەڵناوی خواوەندی بەخشندەیە، منیش حەز دەکەم بیخوێنم. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((خەبەری پێبدەن کە خوایش ئەوی خۆش دەوێت)).

## ( ٧ ) گەورەیی خوێندنی سورەتی ( الناس ) و( الفلق )

٢٠١٠ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتِ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطُّ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ وَ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾)).

(عقبە)ی کوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا نازانیت ئیمشەو چەند ئایەتێك دابەزیوە هەرگیز وێنەیان نەبینراوە: ﴿قل اعوذ برب الفلق﴾و ﴿قل اعوذ برب الناس﴾)).

## ( ٨ ) کەسێ بە قورئان سەربەرز دەبێت

٢٠١١ـ لە(عامر)ی کوڕی (واثلة)دەڵێ: کە عومەر کردبووی بەکاربەدەست ، (نافع)ی (عبدالحارث)لە (عەسفات) کە گەیشت بە عومەر وتی: کێت کردووە بە کاربەدەست لەسەر خەڵکی ئەم دۆڵە؟ وتـی: (ابـن لابـزی) وتـی: (ابـن لابـزی) کێیە؟ وتی: یەکێکە لە کارگوزارەکانمان [مولی] وتی: جا کار گوزارت کردووە بە جێنشینی خۆت لەسەریان؟ وتی: ئەو کەسێکی قورئان خوێنە و شارەزای زانستی میرات بەش کردنە [علـم الفرائـض]. (عمـر)(ﷺ) وتـی: ڕاستە کـە پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) فەرموویـەتی: ((لەڕاستیدا خـوا بەهۆی ئـەم قورئانـەوە چەند گەل و هۆزێك سەربەرز دەکات و چەندانی تریش نزم و نەوی دەکات)).

## ( ٩ ) گەورەیی خێری فێربوونی قورئان

٢٠١٢ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَنَحْنُ فِي الصُّفَّةِ فَقَالَ: ((أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ أَوْ إِلَى الْعَقِيقِ، فَيَأْتِيَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ، فِي غَيْرِ إِثْمٍ وَلَا قَطْعِ رَحِمٍ)). فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نُحِبُّ ذَلِكَ. قَالَ: ((أَفَلَا يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمُ أَوْ يَقْرَأُ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ، وَثَلَاثٌ [خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلَاثٍ] وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ، وَمِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الْإِبِلِ)).

(عقبە)ی کوڕی (عامر)(ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لەهەیوانی مزگەوتەکەدا بووین (الصفە) پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هات و، فەرمووی: ((کام لە ئێوە حەز دەکات کە هەموو ڕۆژێك سەرلەبەیانی بچێت بۆ (بطمان)یا (عقیق)و دوو وشتری سەرکۆپارەی قەڵەوی پێبێت بێ ئەوەی گوناهبار ببێت یا دڵی هیچ خزمێکی لێ بئێشێت)) وتمان: هەموومان حەز بەوەدەکەین. فەرمووی: ((ئەی ناکرێت هەریەکێ لە ئێوە سەرلەبەیانی بڕوات بۆ مزگەوت دوو ئایەت لەقورئان فێرببێت یان بخوێنێت کە باشترە بۆی لە دوو وشتری مێ، سیانیش {باشترە بۆی لە سیان} و چواریش باشترە بۆی لە چوار، و بەپێی ژمارەی ئایەتەکان لە وشتر)).

## ( ١٠ ) وێنەی قورئان خوێن و قورئان نەخوێن

٢٠١٣ـ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الْأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ. وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ

الَّذي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَةِ، لَا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ. وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ. وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٢]

(أبو موسى)ی (الاشعري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((نموونەی بڕواداری قورئان خوێن وەك نموونەی بەهێیە، واتە بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە، بڕواداری قورئان نەخوێنیش وەك خورما وایە، بۆنی نییە و تامی شیرینە، دووڕووی قورئان خوێن وەك ڕیحانە وایە بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، دووڕووی قورئان نەخوێنیش وەك کوژاڵکەوایە، بۆنی نییە و تامیشی تاڵە)).

## ( ١١ ) کەسێك قورئان بەڕەوانی دەخوێنێ و کەسێکیش بە زەحمەت دەیخوێنێ

٢٠١٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ، لَهُ أَجْرَانِ)). [بخاري/ التفسير/ ٤٦٥٣]

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((کەسێ قورئان بەڕەوانی بخوێنێتەوە لەگەڵ پێغەمبەران و فریشتەچاك و باك و بەڕێز و نزیکەکانی {بارەگای خوایی} دەبێت، کەسێکیش قورئان دەخوێنێت و دەمی تەتەڵە دەکات تیایدا و لەسەرشانی زەحمەتە، دوو پاداشتی هەیە)).

## ( ١٢ ) دابەزینی هێوری و ئارامی لەکاتی خوێندنەوەی قورئان

٢٠١٥ـ عَنِ الْبَرَاءِ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ، وَعِنْدَهُ فَرَسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدُورُ وَتَدْنُو، وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ مِنْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: ((تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٢٤]

(البراء )(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك سورەتی (الكهف)ی دەخوێند، ئەسپێکی لەلاوە بوو بە دوو گوریسی درێژ بەسترا بوویەوە، پەڵە هەور دایگرتەوە، هەربەسەریەوە سوڕی دەخوارد و لێی نزیك دەبوویەوە، ئەسپەکەیشی هەر لێی ئەسڵەمیەوە، کاتێ ڕۆژ بوویەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بۆ باس کرد. فەرمووی: ((ئەوە هێوری و ئارامی بووە لەبەر قورئان دابەزیوە)).

٢٠١٦ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ أُسَيْدَ بْنَ حُضَيْرٍ (ﷺ) بَيْنَمَا هُوَ لَيْلَةً يَقْرَأُ فِي مِرْبَدِهِ إِذْ جَالَتْ فَرَسُهُ، فَقَرَأَ ثُمَّ جَالَتْ أُخْرَى، فَقَرَأَ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا، قَالَ أُسَيْدٌ: فَخَشِيتُ أَنْ تَطَأَ يَحْيَى فَقُمْتُ إِلَيْهَا، فَإِذَا مِثْلُ الظُّلَّةِ فَوْقَ رَأْسِي فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ، عَرَجَتْ فِي الْجَوِّ حَتَّى مَا أَرَاهَا، قَالَ: فَغَدَوْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَيْنَمَا أَنَا الْبَارِحَةَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ أَقْرَأُ فِي مِرْبَدِي إِذْ جَالَتْ فَرَسِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اقْرَأِ ابْنَ حُضَيْرٍ)). قَالَ: فَقَرَأْتُ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اقْرَأِ ابْنَ حُضَيْرٍ)). قَالَ: فَقَرَأْتُ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اقْرَأِ ابْنَ حُضَيْرٍ)). قَالَ: فَانْصَرَفْتُ، وَكَانَ يَحْيَى قَرِيبًا مِنْهَا خَشِيتُ أَنْ تَطَأَهُ، فَرَأَيْتُ مِثْلَ الظُّلَّةِ فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ، عَرَجَتْ فِي الْجَوِّ حَتَّى مَا أَرَاهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تِلْكَ الْمَلَائِكَةُ كَانَتْ تَسْتَمِعُ لَكَ، وَلَوْ قَرَأْتَ لَأَصْبَحَتْ يَرَاهَا النَّاسُ مَا تَسْتَتِرُ مِنْهُمْ)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٠]

(أبو سعيد الخدري)(ﷺ) دەڵێ: (اسيد)ی كوڕی (حفر) (ﷺ) شەوێك لە باخەكەیدا خەریكی قورئان خوێندنەوە بوو ئەسپەكەی كەوتە سمكۆڵان، دیسانەوە دەستی كردەوە بە خوێندنەوەی، ئەسپەكەش دەستی كردەوە بە سمكۆڵان، (اسيد) دەڵێ: ترسام لەوەی كە (يحيى) بشێلێت منیش هەستام بەلایەوە، كاتێ تەماشا دەكەم شتێكی وەك پەڵە هەور بەسەر سەرمەوەیە، شتێكی لەناودایە وەك چراخان، هەڵكشا بە ئاسمانا هەتا لەبەرچاوم ون بوو، دەڵێ: بەیانی زوو چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا، لەكاتێكدا من ئەمشەو لە نیوە شەودا لەباخەكەمدا قورئانم دەخوێند ئەسپەكەم كەوتە سمكۆڵان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بخوێنە كوڕی (حفير))). دەڵێ: دەستم كردەوە بە خوێندنەوە هەمدیسان كەوتەوە سمكۆڵا،، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بخوێنە كوڕی (حفير))) دەڵێ: خویندمەوە هەمدیسان كەوتەوە سمكۆڵا،، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بخوێنە كوڕی (حفير))) دەڵێ: منیش دەستم هەڵگرت، (يحيى) لێیەوە نزیك بوو ترسام بیشێلێت، شتێكم بینی وەك پەڵە هەور شتێكی وەك چراخانی تێدابوو، بە ئاسمانا هەڵكشا هەتا لەبەرچاوم ون بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە فریشتە بوون گوێیان لێگرتبویت، ئەگەر بەردەوام بوويتايە، بۆ بەیانی خەڵكی ئەو فریشتانەیان دەبینی و لییان نەدەشارایەوە)).

## ( ١٣ ) حەسوودی دروست نیە لە دووشتا نەبیٚ

٢٠١٧ـ عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ. وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٧]

لە(سالم)ەوە ئەویش لە باوکیەوە (ﷺ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((حەسوودی دروست نییە لە دوو شتدا نەبێت: پیاوێك خوا قورئانی پیٚ خەلاٚت کردبێت، بەردەوام هەستیٚ بە دەورکردنەوەی بە ڕۆژ و شەو، پیاوێکیش خوا سامانی پێببەخشێت بەردەوام خەریکی بەخت کردنی بێت بەشەو ڕۆژ)).

## ( ١٤ ) زۆر خوێندنەوەی قورئان

٢٠١٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ، إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٤٣]

(عبدالله)ی کوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵیٚ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خاوەن قورئان وەك خاوەنی وشتری بەستراوە وەهایە، ئەگەر چاودێری بکات رایدەگرێت، ئەگەر بەریشی بدات دەڕوات)).

٢٠١٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((بِئْسَمَا لِأَحَدِهِمْ يَقُولُ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ. اسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَلَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ بِعُقُلِهَا)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٤٤]

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵیٚ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((چەند خراپە کەسێك لە ئێوە بڵێت، ئایەتی ئەوە و ئەوەم لەبیرچووە، بەڵکو لەبیری براوەتەوە، قورئان دەوربکەنەوە بێگومان قورئان لە دڵی پیاودا زووتر لەدەست دەردەچیٚ وەك لە حوشتر لەپەتی خۆی)).

## ( ١٥ ) دەنگ خۆش کردن بە خوێندنەوەی قورئان

٢٠٢٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ)) يَجْهَرُ بِهِ. [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٦]

(أبو هريـرة)(ﷺ) گوێی لە پێغەمبەر بـووە (ﷺ) کـە فەرموویـەتی: ((خـوا مۆڵەتی بەهیچ شتێك نەداوە وەك ئەوەی مۆڵەتی بە پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش داوە قورئان بەدەنگەوە بخوێنێت)) بەئاشکرا بیخوێنێ،

٢٠٢١- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأَبِي مُوسَى: ((لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ، لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٦١]

(أبو بردة)لە (ابو موسى)ەوە (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـە (ابـو موسـى)ی فـەرموو: ((کاشـکی ئەمشـەو بـت بينايـەم کـە چـۆن گوێـم بـۆ خوێندنەوەکەت شل کردبوو، بەڕاستی سازێك لە سازەکانی بنەماڵەی (داود)ت پێدراوە)).

## ( ١٦ ) قورئـان خوێندن بە ئـاوازەوە

٢٠٢٢- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: قَرَأَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَامَ الْفَتْحِ فِي مَسِيرٍ لَهُ سُورَةَ الْفَتْحِ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَرَجَّعَ فِي قِرَاءَتِهِ. قَالَ مُعَاوِيَةُ: لَوْلَا أَنِّي أَخَافُ أَنْ يَجْتَمِعَ عَلَيَّ النَّاسُ لَحَكَيْتُ لَكُمْ قِرَاءَتَهُ. [بخاري/ المغازي/ ٤٠٣١]

(معاويـة)ی کـوڕی (قـرة)دەڵـێ: لـە (عبـدالله)ی کـوڕی (مغفـل)ی (المزنـي)م بيسـت (ﷺ) دەيـوت: پێغەمبـەر (ﷺ) لەسـاڵی ئـازادکردنی مەککـەدا ، بەسـواری وڵاخەکەيەوە بەڕێگەوە سورەتی (الفتـح)ی دەخوێنـد ، بـە ئـاوازەوە دەيخوێنـد. (معاويە) دەڵێ: ترسـی ئـەوەم نەبوايـە کـە خـەڵکيم لێ کۆدەبێتـەوە، وەك ئـەو بـۆم دەخوێندن.

## ( ١٧ ) بەئـاشکرا خوێندنەوەی قورئـان لەشەودا و گوێ لێگرتنی

٢٠٢٣. عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) سَمِعَ رَجُلًا يَقْرَأُ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ: ((يَرْحَمُهُ اللَّهُ، لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً، كُنْتُ أَسْقَطْتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا)). [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٥٥]

(عائشه)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە پياوێك بوو لەشەودا قورئانی دەخوێنـدەوە، فـەرمووی: ((خـوا ڕەحمـی پێبکـات ئايـەتی ئـەوە و ئـەوەی بيرخستمەوە کەلەبيرم چووبوون لە فلان سورەت و فلان سورەت)).

## ( ١٨ ) قورئان لەسەر حەوت پیت دابەزیوە

٢٠٢٤ـ عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (ﷺ) يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَؤُهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَقْرَأَنِيهَا، فَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ فَجِئْتُ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَأْتَنِيهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَرْسِلْهُ، اقْرَأْ)). فَقَرَأَ الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَكَذَا أُنْزِلَتْ)). ثُمَّ قَالَ لِي: ((اقْرَأْ)). فَقَرَأْتُ، فَقَالَ: ((هَكَذَا أُنْزِلَتْ، إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ)). [بخاري/ الخصومات/ ٢٢٨٧]

(عمر)ی کوڕی (الخطاب)(ﷺ) دەڵێ: گوێم لە (هشام)ی کوڕی (حکیم)ی کوڕی (حزام)(ﷺ) بوو سورەتی (الفرقان)ی دەخوێند جیاواز لە خوێندنی من، کە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بۆی خوێندبووم، خەریك بوو پەلە بکەم (خوێندنەوەکەی پێ ببڕم) بەڵام مۆڵەتم دا تاڵێبوویەوە، پاشان بەرۆکیم گرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێموت: ئەی پێغەمبەری خوا، من گوێم لەمەبوو سورەتی (الفرقان)ی خوێندەوە جیاواز لەوەی کە تۆ بەمنت خوێندەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بەریدە، بخوێنە)) ئەویش هەر بەو شێوە خوێندی کە من لێم بیستبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هەروا دابەزیووە)) پاشان بەمنیشی فەرموو: ((بخوێنە)) منیش خوێندمەوە، فەرمووی: ((هەروا دابەزیوە، ئەم قورئانەلەسەر حەوت پیت دابەزیووە، ئێوەیش ئەوەندەی بۆتان دەکرێ بیخوێننەوە)).

## ( ١٩ ) قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر ( ﷺ ) بەسەر خەڵکی تردا

٢٠٢٥ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ (ﷻ) أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ: ﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾)). قَالَ: وَسَمَّانِي [لَكَ]؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: فَبَكَى. [بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٩٨]

(انس) کوڕی (مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (ابی)ی کوڕی (کعب)(ﷺ) ی فەرموو: ((خوای گەورە فەرمانی پێکردووم کە ﴿لم یکن الذین کفروا﴾ت بەسەردا بخوێنم. وتی: ناوی بردم [بۆت]؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) دەڵێت: ئەویش گریا.

